


فەرەیدوون عەبدولڕەحیم عەبدوڵڵا

# بارودۆخی سیاسیی کوردستان - عێراق

## ١١ی مارتی ١٩٧٠ - ١١ی مارتی ١٩٧٤



پرۆفیسۆر دکتۆر کەمال مەزهەر
پێشەکیی بۆ نووسیووە

فەرەیدوون عەبدولڕەحیم عەبدوڵلا



# بارودۆخی
# سیاسیی کوردستان – عێراق

## ١١ی مارتی ١٩٧٠ – ١١ی مارتی ١٩٧٤

(توێژینەوەیەکی مێژوویی – سیاسییە)

پرۆفیسۆر دکتۆر کەمال مەزهەر
پێشەکیی بۆ نووسیووە

ناوی کتێب: بارودۆخی سیاسیی کوردستان – عێراق

١١ی مارتی ١٩٧٠ – ١١ی مارتی ١٩٧٤

نووسەر: فەرەیدوون عەبدولڕەحیم عەبدوڵڵا

بابەت: مێژوویی – سیاسیی

نەخشەسازی ناوەرۆك و بەرگ: ئەبوبەکری مەلا عەبدوڵڵا

تیراژ: (٤٠٠٠) دانە

چاپ: چاپخانەی منارە – هەولێر

نۆرەی چاپ: چاپی یەکەم

لەبەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی (١٩٩٦)ی ساڵی ٢٠٠٨ی پێدراوە

**تێبینی:**

ئـەم کتێبـە لەبنەڕەتـدا ماسـتەرنامەیەکە پێـشکەشی بەشـی مێـژوو – کـۆلیجی ئەدەبیات/ زانکۆی سەلاحەددین– هەولێر کراوە، لە ڕێکەوتی ١٢/٥/٢٠٠٥ تـاووتوێکراوەو بەپلەی (ئیمتیاز / هەرەباش) وەرگیراوە. لێژنەی هەڵسەنگاندن لەم بەڕێزانە پێکهاتبوو:

١– پ. د. کەمال مەزهەر ئەحمەد — سەرۆکی لێژنە

٢– پ. د. عەبدولفەتاح عەلی یەحیا بۆتانی — ئەندام

٣– پ. ی. د. نازم یونس عوسمان ئەلزاوی — ئەندام

٤– پ. ی. د. دلێر ئیسماعیل حەققی شاوەیس — ئەندام و سەرپەرشتیار

**پێشكەشە بە:**

- دایك و باوكى ئازیزم.
- هاوسەرى خۆشەویستم سروە.
- برا و خوشكەكانم.

# پێرست

# لیستی کورتکراوە بەکارهاتووەکان

| أ. بەزمانی کوردی | |
|---|---|
| ب | بەرگ |
| خ | خوول |
| چ | چاپ |
| ژ | ژمارە |
| ل | لاپەڕە |
| و | وەرگێڕان |
| س پ | سەرچاوەی پێشوو |
| هـ س | هەمان سەرچاوە |
| بێ چ | بێ چاپخانە |
| بێ س | بێ ساڵی چاپ |
| بێ ش | بێ شوێنی چاپ |
| پ.د.ك | پارتی دیموکراتی کوردستان |
| ح.ش.ع | حیزبی شیوعی عێراق |
| م.س | مەکتەبی سیاسی |

| ب. بەزمانی عەرەبی | |
|---|---|
| ت | الترجمة |
| ج | الجزء |
| ص | صفحة |
| ط | طبعة |
| مط | مطبعة |
| د.ت | بدون تأريخ |
| د.م | دون مكان النشر |
| د.مط | بدون مطبعة |

| ج. بەزمانی ئینگلیزی | |
|---|---|
| P | لاپەڕە |
| OP.Cit | سەرچاوەی پێشوو |

# پێشەکیی

کەمال مەزهەر

نامەوێ لە خوێنەری بەڕێزی بشارمەوە کە لە بەر گەلێك هۆی بابەتەکی و تەنانەت نابابەتەکیش بەدوودڵییەکی زۆرەوە قایل بووم بەشداری لە توێژینەوەی نامەی ماجستێری کاك فەرەیدوون عەبدولڕەحیم عەبدوڵلای خاوەنی ئەم بەرهەمەدا بکەم، بەڵام بەرلەوەی لەخوێندنەوەی نامەکە ببمەوە بەدڵنیاییەوە هەستم کرد مامەڵە لەگەڵ کارێکی زانستی شیاودا دەربارەی قۆناغێکی ئاڵۆزی دۆزی نەتەوەی کورددا دەکەم. هەر لەبەرئەوەیش پێم وایە کەمجار وا دووردرێژ بۆچوونەکانی خۆمم لەکاتی بەشداریمدا لە گەلێك توێژینەوەی نامەی ماجستێرو دکتۆرادا عەرز کردووە وەك ئەو رۆژەی لە هەولێر لەکاتی هەڵسەنگاندنی نامەی ناوبراودا کردم.

لایەنە پتەوەکانی ئەم کارە زانستییە لە ژماردن نایەن، بەکورتی و بەپوختی دەڵێم بەردێکی بناغەی پتەوە بۆ بنیاتنانی زنجیرەیەك لێکۆڵینەوەی وردی تر دەربارەی ئەو بارودۆخە ناسکەی کوردستانی عێراق لەنیوەی یەکەمی حەفتاکانی سەدەی رابردوودا تێیدا ژیاو خەستوخۆڵ رەنگیدایەوە سەر رەوتی سیاسیی سەرجەمی کوردستان و عێراق و وڵاتانی ناوچەکە کە تائیمڕۆکەیش بەروونی هەست بە ئاسەوارەکانی دەکەین هیچ نەبێ چونکە بەسەرهاتەکانی مێژوو زنجیرەیەکی پێکەوەبەستراوی نەپساون، وێڕای بایەخی بێ ئەندازەی خودی ئەو بەسەرهاتانە کە نووسەر پتر لەوەی من چاوەڕوان بووم بابەتەکییانە

هەڵیاندەسەنگێنێ، بەراشکاوی و دوور لەسۆزو رای سیاسیی تایبەتی رۆڵی هەموو لایەنەکان شی دەکاتەوە، ستایشی هەنگاوە باشەکانیان و سەرزەنشتی هەڵەکانیان دەکات چونکە لە باوەڕەدایە نە کەس هەبووەو نە کەس هەیەو نە کەسیش دەبێت لەبواری کاردا نەکەوێتە داوی هەڵەوە، چ جای رەهبەرانی نەتەوەیەکی وەك نەتەوەی کورد کە لە هەر چوار لاوە بەفرۆفێڵ و پیلانی ترسناك و کرداری ساختەو گفتی درۆو جەماوەرێکی دڵ بریندار دەورە دراون.

نووسەر لەخۆڕا هیچی نەگوتووە، پشتی بە سەرچاوەیەکی زۆرو زەبەند بەستووە، لیستی ناوی سەرچاوەکان بە تەنها سێزدە لاپەڕەی رەبەقی نامەکەی پڕکردۆتەوە، لەوەیش گرنگتر ئەوەیە کە بەشێکی وەبەرچاوی ئەو سەرچاوانە رەسەن و دەگمەنن، دیدەنیی، یاخۆی واتەنی دیداری راستەوخۆی لەتەك بیست و یەك رەهبەرو پیاوی ناسراوی شارەزای کورددا کردووە، هی وەك بارزانی و تاڵەبانی و عەزیز محەمەدو فوئاد عارف و کۆسرەت رەسول عەلی و موحسین دزەیی و نەوشیروان مستەفا کە تەنانەت ناویشیانی بەپێی ئەلفوبێ ریزکردووە، بێ جیاوازی کەڵکی لە رۆژنامەو گۆڤارو بەخشەکانی لایەنە جیاوازەکان و تەنانەت دژەکانیش وەرگرتووە، بۆیەکە زوو زوو ناوی وەك (خەبات) و (التآخي) و (النور) و (الثقافة الجديدة) و (الثورة) و (الجمهورية) و (الوقائع العراقية) و گەلێکی تر لە پەراوێزی بابەتەکانی نامەکەیدا دووپات دەبنەوە.

لەبەر ئەوانەی وتمن و زۆر لایەنی تری وەك ئەوان توێژینەوەی نامەکە گەلێك راوبۆچوونی ناسکی ئەوتۆی ورووژاند کە پێویست بوون بۆ هەڵسەنگاندن و پتر لەوەیش بۆ پووچەڵ کردنەوەی سەرنجی ناڕەوای ئەو لایەنە کورتبینانەی تا ئیمرۆکەیش دەیانەوێ کورد داردەست و کۆیلەی ئەڵقە لەگوێی ئەوان بن و بێبەریان بکەن لەیەك دەر هەزاری ئەوەی بۆخۆیان بە رەوای دەزانن. لێرەدا بۆ

روونکردنەوەی مەبەست دەڵێم توێژەر لە بابەتێکی سەربەخۆی دە لاپەڕەیی بەشی دووەمی نامەکەیدا هاتۆتە سەر باسی پێوەندیی رابەرایەتی ئەوسای شۆڕش بە ئیسرائیلەوە، بەپێی توانا گەلێك لایەنی ئەو کەینوبەینە ناسکەی بۆ شی کردووینەتەوەو بەر لەوەیش چەند جارێك ناوی ئیسرائیلی هێناوەو بە دووروودرێژی باسی پێوەندیی رابەرانی کوردی بە ولاتە یەککگرتووەکانی ئەمەریکاوە کردووە. خاوەنی ئەم پێشەکییەش وەك ئەندامێکی لیژنەی هەڵسەنگاندنی نامەکە بە راشکاوی پوختەی لێکدانەوەی خۆی لەم بارەیەوە عەرز کرد کە بەر لەو رۆژەیش زۆر جاران لە موحازەرە تایبەتی و گشتییەکانی خۆیدا گەلێك لایەنی روونکردوونەتەوە. بەراوردو تاقیکردنەوە چڕو پڕەکانی مێژوو دەمێکە ئەوەیان سەلماندووە کە بەرژەوەندییە سەرەکییەکانی گەل و نیشتمان هەمیشە یەکەم فاکتەری بزوێنی دیاریکردنی تاکتیك و ستراتیژی بەناوبانگترین سیاسەتمەدارانی دونیا، بە پێغەمبەران و سەرجەمی موفەکیرە گەورە سەرکەوتووەکانەوە بوون، ئەوانەی نە دڵەڕاوکێ و نە شەرمو شورەیی نەیانتوانیوە دزە بکەنە نێو فەرهەنگی فرە دەوڵەمەندی کاری رۆژانەیانەوە. هیتلەر ساڵەهای ساڵ دوژمنی بێ ئامانی ستالین بوو، کەچی کاتێکت زانی پەیمانی دۆستایەتیی لەگەڵدا مۆرکردو هەمووی بەسەریەکەوە ساڵێك و چەند مانگێکی نەخایاند کاتێك لەشکری بێ شووماری نازی خاکی شوورەویی بە توورەکە بێژا، ئەوەش ستالینی ناچار کرد بە گەرمی دەست بخاتە ناو دەستی نوێنەری ئەو سەرمایەدارانەوە کە مارکسی مامۆستای دوژمنی هەرە گەورەیان بوو، کار گەیشتە ئەوەی چەرچلی بەناوبانگ بە شانازییەوە لە رێگەی ستالینەوە شمشێری زێڕینی پادشای بەریتانیای گەورە پێشکەش گەورەترین شاری رووسیا بکات کە ئەوساکە شارەکە بەناوی ئەو لینینە ناونرابوو کە لە نووسینەکانیدا کارێکی ئەوتۆی بە فەرمانڕەوایانی ئینگلستان کردبوو با بە

هیچ دەوارە شرێکی نەکردبێت، تەنانەت خودی چەرچلی ناو ناوە "دوژمنی باوەکوشتەی" سۆڤیەت، راستێکەشی وابوو، چونکە ئەوساکە چەرچل وەك وەزیری بەرگری و دەریاوانی بەریتانیا لە هەمووان پەرۆشتر بوو بۆ زیندەبەچاڵ کردنی شۆڕشی ئۆکتۆبەر.

لەبەر رۆشنایی ئەم پرەنیسپە چەسپاوەدا رابەرانی کوردیش مافی خۆیان بوو لەپێناو گەل و نیشتماندا پەنایان بردبێتە بەر هەر لایەنێك، بێ گومان ئەو پرنسیپە لە بواری دۆزی کورددا گەلێك چەسپاوتر خۆ دەنوێنی چونکە خەباتی جەماوەری کوردستان لە شەستەکانی سەدەی رابردووەوە بەهۆی زوڵموزۆری بێ وێنەی کاربەدەستە شوفێنکارەکانەوە گەیشتبووە قۆناغی خەباتی مان و نەمان. بەرلەوە رۆژێك لە رۆژان کورد نەك پەنای نەبردۆتە بەر وڵاتە یەککرتووەکانی ئەمەریکا یا ئیسرائیل، بەڵکو بەپێچەوانەوە دژیشیان وەستاوە، سەرجەمی هێزە نیشتمانییە کوردییەکان ئۆیاڵی لەناوبردنی کۆماری مەهاباد و دروست نەبوونی دەوڵەتی کوردییان دەخستە ئەستۆی واشنتۆن، هەموویان لە چەپ چەپڕەوتر بوون و بە ستالین و وڵاتی شووڕەوی پشتئەستوور بوون، رۆژانی شەڕی نێوان عەرەب و جووەکان بەر لە ساڵی ١٩٤٨ لە شارێکی وەك سلێمانیدا بە سەدان کەس بەخۆپیشاندان داوای چەکیان دەکرد تا بچنە فەلەستین و لەوێ بەرگری لە قودسی شەریف بکەن. راستییەکی لەولەیش پڕماناتر – ژمارەی شەهیدانی شاری هەڵەبجەی بە کیمیاوی کاولکراو کە لەگەڵ شەهیدەکانی تری لەشکری عێراق لەپێناو فەلەستیندا لە شاری نابلس نێژراون بەپێی رێژەی دانیشتوانی پلەو مەقامی یەکەم بەر ئەو شارە دەکەوێت لەناو هەموو شارەکانی عێراقدا.

تۆماری مێژوو گەلێك راستیی تری لەو بابەتەی بۆ پارلستووین، کەوابێ خۆڵودۆی شەرمەزاریو شاریەدەری تەنها بە ریشی ئەوانە رەوایە کە گەوجانە

رابەرانی دۆستێکی دێرینی نەتەوەکەیانیان ناچار کرد دەست لەو سەنگەرە هەڵگرن و پەنا بەرنە بەر هەر لایەنێك بتوانێت نەتەوە بێ تاوان و نیشتمانە دێرینەکەیان لەو مەرگەساتە ترسناکە قوتار بکات کە وێنەی لە مێژووی هاوچەرخدا زۆر دەگمەنە. هەڵبەت مێژوو بەم تەرازووە رەوایە هەڵوێستی رابەران و کۆمەڵانی خەڵکی کوردستان هەڵدەسەنگێنێ، ئەوانەی لەمێژووی نوێ و هاوچەرخدا بە ریز پشتیان بە عوسمانی و سەفەوی و وسوڵتان عەبدولمەجیدو تورکە لاوەکان و دەستوورییەکان و کەمالییەکان و پەهلەویکان و نەتەوە پەرستانی عەرەب بەست و لەگەڵ هەمووشیاندا مایەپوچ دەرچوون. بەشایەتی کۆمۆنیستی عێراقیی ناسراو مامۆستا کەریم ئەحمەد کە خۆشبەختانە ئەوڕۆژە فەرەیدوونی گەورە کردبوو بارزانی سەرەتای حەفتاکان بە کۆمۆنیستەکانی گوتووە لە گەرووی ئەهەنگدام یاریدەم بدەن خۆم رزگار بکەم، هەڵبەتە ئەمە نامەیەکی بایەخدارە لە رێگەی ئەوانەوە ئاراستەی مۆسکۆی کردبوو.

ئەم هەویرانە ئاو زۆر دەکێشن، لەگەڵ ئەوەیشدا ئافەرین فەرەیدوون کە کارەکەت ورووژاندمی گەلێك لەو بیروبۆچوون و لێکدانەوەی خۆم لە رۆژی هەڵسەنگاندنی نامەکەتدا عەرز بکەم، بەڵام ئەمە هەرگیز وا ناگەیەنێت تۆش توانیوتە وەڵامی هەموو پرسیارەکان بدەیتەوەو گشت گرێ کوێرەکان بکەیتەوەو تەواوی تێنوێتی دەستەبژێری کورد بڕەوێنیتەوە، ئەوە لە توانای هیچ توێژەرێکدا نییە، تایبەت توێژەری کورد کە وابزانم لە هەر کەس پتر ناچارە لە بوواری سەختی مان و نەماندا خۆی بە کونی دەرزیدا بکات. دڵنیام لەوەی کارەکەت بەشیاوی جێگەی خۆی لە کتێبخانەی کوردی و دڵی خوێنەردا دەکاتەوە.

# پێشەكیی نووسەر

كورد نەتەوەیەكی ساكارو ستەملێكراوە كە ڕۆژگارێكی درێژە ڕەگەزپەرست و داگیركەران، مرخی دڕندانەیان لێخۆشكردووەو لە سەر خاكی نیشتمانی خۆیدا لەخشتەبراوە. ئەوانەش یەكێك بوون لە فاكتەرەكانی شكستی زۆربەی شۆڕش و ڕاپەڕینەكانی كوردستان. ئەركی زاناو توێژەرو قەڵەم بەدەستانیشە كە ئازادو بوێرو بێلایەنانە مێژووی ڕاستەقینەی شۆڕش و ڕاپەڕینەكانی كوردستان و جووڵانەوە ئازادیخوازەكەی تۆماربكەن و ڕاستییەكان بخەنەڕوو، تا گەلی كوردستان و سەركردایەتی جووڵانەوە ڕزگاریخوازەكەی، بیانكەنە پشتبەست و بە تێگەیشتن لە هۆكاری لاوازیی و شكستەكان و ڕێگرتن لە دووبارە بوونەوەی هەڵەو كەموكوڕییەكان، پەندیان لێوەرگرن.

شۆڕشی ئەیلولیش بەسالانی شەڕو ئاشتییەوە بۆتە هۆی كۆمەڵێك دەرهاوێشتەی ململانێی نێوخۆ، كە تائێستاش كاریگەریی دەرەنجامەكانیان بەسەر ڕەوتی سیاسیی و كۆمەلایەتیی كوردستانەوە دیارە. بۆیە ئەركی سەرەكیی مێژوونووس و توێژەرانی كوردە، لەچوارچێوەی توێژینەوەی زانستیی و ئەكادیمیدا، مێژووی ئەو شۆڕشە تۆمار بكەن و لێیبكۆڵنەوە.

ئێمەش هەر لەم سۆنگەیەوە، (بارودۆخی سیاسیی كوردستان– عێراق ١١ی مارتی ١٩٧٠– ١١ی مارتی ١٩٧٤) كە قۆناغێكی تایبەت و تارادەیەك تەواوكەری ئەڵقەكانی پێش و پاش خۆی پێكدێنێ، كردمانە بابەتی ماستەرنامەكەمان، بەو ئامانجەی بتوانین بەشێوەیەكی بابەتییانەو دوور لە هەموو سۆزو ڕایەكی سیاسیی تایبەت، بچینە نێو قوولایی ڕووداوەكانی ئەو سەردەمەو، بەپێی توانا، لە ڕێگەی سازدانی دیداری ڕاستەوخۆ لەگەڵ سیاسەتوانان و كاربەدەستانی ئەو سەردەمەی

کوردەوە، هەندێ لە نهێنیی و بابەتە پەنهانەکان ڕوون بکەینەوە. جگە لەوەی ئاماژەمان پێدا، فاکتەرێکی دیکەی هەڵبژاردنی ئەم بابەتەمان، زیندوویی تائێستای ئەو کەسانە بوو کە بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ یا ناڕاستەوخۆ لە دروستکردنی ئەو مێژووە بەشداربوونە، بەومەبەستەی لە ڕێگەی ئەوانەوە زانیارییەکانی ئەو سەردەمە لە فەوتان ڕزگار بکەین.

توێژینەوەکەمان، پێکهاتووە لە پێشەکی، بەرایی، سێبەش، دەرەنجام، لیستی سەرچاوەکان، پاشکۆکان و پوختەی توێژینەوە بەهەردوو زمانی عەرەبی و ئینگلیزی.

لە بەراییدا، بۆئەوەی بینایی خوێنەر لە مێژووی شۆڕشی ئەیلول فراوانکەین، بەکورتی ئاماژەمان بەو وێستگەو ڕووداوە سیاسییە گرنگانە داوە کە دوای هاتنە سەرکاری ڕژێمی کۆماری عێراق لە ساڵی (١٩٥٨)ەوە تا قۆناغی دەسپێکردنی گفتوگۆی نێوان سەرکردایەتی شۆڕشی ڕزگاریخوازی کوردستان و ڕژێمی بەعس لە ساڵی ١٩٦٩، پەیدابوون.

بەشی یەکەمی توێژینەوەکەشمان کە بەناونیشانی (بەیاننامەی ١١ی مارت و دەرهاوێشتەکانی)ە، لەچوار تەوەر پێکهاتووە. تەوەری یەکەم تەرخانکراوە بۆ باسکردنی قۆناغەکانی گفتوگۆی نێوان سەرکردایەتی شۆڕشی ڕزگاریخوازی کوردستان و دەسەڵاتدارانی عێراق لە کۆتاییەکانی ١٩٦٩ و سەرەتای ١٩٧٠ لە تەوەری دووەمیشدا، گرنگترین ئەو هۆکارە ناوخۆیی و دەرەکییانەمان خستۆتەڕوو، کە کاریگەرییان لە دەسپێکردنی گفتوگۆ هەبووە. تەوەری سێیەمیش، تایبەتە بە کاریگەریی و کاردانەوەی بەیاننامەی ١١ی مارت لەسەر ئاستی ناوخۆو دەرەوە. لەتەوەری چوارەمیشدا، هەوڵماندداوە بەشێوەیەکی زانستی و بابەتییانە، خاڵەکانی بەیاننامەی ١١ی مارت هەڵسەنگێنین.

بەشــی دووەمــیش، بەناونیــشانی (بــاری سیاســیی کوردســتان ١١ی مــارتی ١٩٧٠– ١١ی مــارتی ١٩٧٤)، لــە چــوار تــەوەر پێکهــاتووە. لەتــەوەری یەکەمــدا، سەرەتا ئاماژەمـان بـە بەهەڵوێستی نێگەتیڤانـەی باڵی (بـرایم ئەحمـەد– جـەلال تاڵەبانی/" م.س") بەرانبەر شۆڕشی کوردسـتان داوە، پاشـان باسـی گەڕانـەوەی دوای راگەیاندنی بەیاننامەی ١١ی مارتی ١٩٧٠ی ئەو باڵەمان کردووە بۆ نێو پارتی دیموکراتی کوردستان ، بەدەسپێشخەریی مستەفا بارزانی و هەستی بەرپرسیاریی نیشتمانیی و مێژوویی سەرکردایەتی باڵەکە. تەوەری دووەمیش، تایبەتە بە باسی ســـەرهەڵدانی کۆمەڵـــەی مارکـــسیی– لینیـــنیی کوردســـتان و فاکتـــەرەکانی ســـەرهەڵدانی و پـــەرەگرتنی بیرۆکـــەو نهێنیـــی کـــاری رێکخـــستن و ململانێیـــە ناوخۆییەکانی. تەوەری سێیەمیش، تـەرخانکراوە بـۆ باسـی پێوەنـدیی دۆسـتانەو ناحەزانەی نێوان پارتی دیموکراتی کوردستان و حیزبـی شـیوعی عێـراق. لـەمیانی تـەوەری چوارەمیـشدا، پێوەندییـە دەرەکییـەکانی جووڵانـەوەی رزگـاریخوازی کوردســتانمان لەگــەڵ هەریەکــە لــە ئێــران، تورکیــا، یــەکێتی ســۆڤیەت، وڵاتــە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، ئیسرائیل، باسکردووە.

بەشی سێیەمیش، بەناونیشانی (سیاسەتی رژێمی بەعس ١١ی مارتی ١٩٧٠– ١١ی مارتی ١٩٧٤) کە دوا بەشی توێژینەوەکەمانە، لە سێ تەوەر پێکهـاتووە. لـە تــەوەری یەکەمــدا، سیاســەتی رژێمــی بەعــسمان بەرانبــەر کــوردو ناوچــەکانی کوردســـتان، کـــە لەپـــەنای بـــارودۆخی ئاشـــتییەوە ســـتراتیژییەتی خـــۆی بـــۆ بەعـــەرەبکردنی کوردســـتان و بـــە بەعـــسیکردن و راگواســـتن و لـــەناوبردنی کـــورد پیــادەکردووە، خــستۆتەڕوو. لــە تــەوەری دووەمــیش، بــەفراوانیی سیاســەتی شەڕانگێزیی و پیلانگێڕیی رژێمی عێراقمان بەرانبەر پـارتی دیمـوکراتی کوردسـتان خـستۆتەڕوو، کـە تیایـدا ئاماژەمـانکردووە بـە دانبـەخۆداگرتنی سـەرکردایەتی

(پ.د.ك) لەپێناو بەرقەرار کردنی ئاشتی و بەرگرتن لە هەڵگیرسانەوەی شەڕ. لەتەوەری سێیەمیشدا، باسمان لە کێشەو گفتوگۆکانی سەرکردایەتی جووڵانەوەی رزگاریخوازی کوردو رژێمی بەعس لەمەڕ پرۆژەی یاسای ئۆتۆنۆمی، کردووەو ئەوەمان نیشانداوە کە هەر لەسەرەتاوە بەعس ویستویەتی (پ.د.ك) لەم پرسە بەلاوە بنێ و یەکلایەنە یاسای ئۆتۆنۆمی بڕیاربدات.

دوای ئەوانەش، دەرەنجامەکانی توێژینەوەکەمان باسکردووە.

شایانی باسیشە، ئاستەنگەکانی بەردەم ئامادەکردنی هەر توێژینەوەیەکی زانستی، توێژەر ماندوودەکەن، تەنانەت رەنگە هەندێ جار ئەگەر بۆ ماوەیەکی کورتیش بێ، لە گەیشتن بە ئامانج و کۆتایی توێژینەوەکەی، تووشی دڵەڕاوکێی بکەن. ئەو ئاستەنگانەی هاتنە بەردەم ئامادەکردنی توێژینەوەکەی ئێمەش ئەگەرچی گەورەبوون، بەلام بەپێی تواناو بەویستێکی گەورە، تاڕاددەیەك بەسەریاندا زاڵبووین. گەورەترین ئاستەنگیش، زەحمەتی ئەنجامدانی دیدارەکانمان بوو بۆ بەپێزترکردنی توێژینەوەکەمان. بەشێکی ئەو زەحمەتییە پێوەندیی بە گۆڕانکارییە سیاسییە هەنووکەییەکانی عێراق و کوردستانەوە هەبوو، کە ژمارەیەك لەوکەسانەی دیدارمان لەگەڵدا سازدان پێیانەوە سەرقاڵبوون. بەشێکیشی پێوەندیی بەتایبەتمەندێتی شەخسی هەندێ لەو کەسانەوە هەبوو کە کاتێ بۆ ئەنجامدانی دیدار پێوەندیمان پێوەکردن، بواریان پێنەداین. هەربۆ نموونە شەهید سامی عەبدولڕەحمان، کە زانیارییەکی زۆری هەبوو دەربارەی بابەتی توێژینەوەکەمان، بۆ سازدانی دیدار دەرگای لێنەکردینەوە، بەشەهیدبوونیشی لایەنێکی ئەو پرسیارەزۆرانەی تایبەتبوون بە توێژینەوەکەمان، بە تەمومژاویی مایەوە.

ئاستەنگێکی دیکەی بەردەم ئامادەکردنی توێژینەوەکەمان، کەمی سەرچاوەی زانستیی و دەستنەکەوتنی ژمارەی پێویستی بەڵگەنامەکان بوو. بۆ پەیداکردنی بەڵگەنامەکانیش، هەموو پەناوپەسیوێك گەڕاین و داوامان لە هەموو ئەوکەسانەش کرد کە دیدارمان لەگەڵسازدان، بەڵام هەر ئەوەندەمان دەسکەوت کە کردوومانەتە پاشکۆی باسەکەمان.

جێی ئاماژەپێدانیشە کە لەکاتی ئامادەکردنی توێژینەوەکەمان، کتێبەکەی مەسعود بارزانی (البارزاني والحركة التحررية الكردية، ج٣) کە پێوەندییەکی زۆری بەباتەکەی ئێمەوە هەبوو بڵاوبۆوە. ئەوەش ئەگەرچی بۆ بەردەوامبوونی کارەکەمان ساردی نەکردینەوە، بەڵام ناچاری کردین بۆ دووبارە باسنەکردنەوەی ئەو لایەنە گرنگانەی لەو کتێبە بەنرخەدا خراونەتەڕوو، پلانەکەمان بگۆڕین و دواجاریش کتێبەکە بووە سەرچاوەیەکی گرنگی توێژینەوەکەمان. هەموو ئەو کێشەو ئاستەنگانەو چەندینی دیکەش کاریگەرییەکی زۆریان هەبوو لەدواخستنی کارەکانمان.

بۆ ئامادەکردنی توێژینەوەکەشمان پشتمانبەستووە بە گەلێ سەرچاوەی هەمەجۆری وەك: دیدار، کتێب، دەستنووس، بەڵگەنامە بڵاوکراوەو نەکراوەکان، رۆژنامە ،گۆڤار، کاسێتی ئەرشیفی ڤیدیۆیی، نامەوتێزی زانکۆیی...هتد. بەپلەی یەکەمیش پشتمان بەو زانیارییانە بەستووە کە لەڕێگەی سازدانی دیدارەکانمان بەدەستمان هێنان. لەنێو کتێبەکانیشدا زیاتر پشتمان بەوانە بەستووە کە نووسەرەکانیان لەنێو رووداوەکانی ئەو سەردەمەدا ژیاون و خۆیان ئاگاداری بارودۆخەکە بوونە.لەوانەش کتێبەکەی مەسعود بارزانی (البارزاني والحركة التحررية الكردية، ج٣)، کە نووسەر نەك هەر لەنێو رووداوەکاندا بووە، بەڵکو یەکێك بووە لەو کەسایەتییانەی نێوەندی بڕیاربوون و ژمارەیەك بەڵگەنامەی ئەو

سەردەمەشی کردۆتە پاشکۆی کتێبەکەی. هەروەها کتێبەکەی نەوشیروان مستەفا ئەمین (پەنجەکان یەکتری ئەشکێنن...)و کتێبەکەی جەمال نەبەز (کوردستان و شۆڕشەکەی)و کتێبەکەی ئیبراهیم جەلال (خواروی کوردستان و شۆڕشی ئەیلول...)، سێ سەرچاوەی مێژوویی و سیاسیی بایەخدارن کەهەریەکەیان بیروبۆچوونی جیاوازی لەمەڕ کێشەوگرفتەکان هەبووەو بۆ توێژینەوەکەمان سوودێکی زۆرمان لێوەرگرتوون. هەروەها زانیارییەکی زۆریشمان لەکتێبە پڕبەهایەکەی جوناثان راندل (امة في شقاق) وەرگرتووە.

لە دەستنووسەکانی دکتۆر موکەڕەم تاڵەبانییش، کەڵکمان لە (نحو حل صحيح للمسألة القومية الكردية في العراق) و (تجربة الجبهة الوطنية والقومية التقدمية في العراق ١٩٧٣-١٩٧٩) بەتایبەتییش لە یەکەمیان وەرگرتووە. ئەو دوو دەستنووسەو دەستنووسی (مذكرات عبدالغني الراوي بخط يده)ش، یەکەمجارە لە دووتوێی توێژینەوەیەکی ئەکادیمی مێژووییدا بەکاردەهێنرێن.

ئەو بەڵگەنامانەش کە وەك پاشکۆ لە توێژینەوەکەماندا هاتوون و باسەکەمانیان دەوڵەمەندو بەپێزتر کردووە، بەشی زۆریان یەکەمجارە بڵاودەکرێنەوە. وەك نامەکەی فوئاد عارف بۆ سەدام حسێن و هەندێ لە بروسکە نێوخۆییەکانی پارتی دیموکراتی کوردستان.

دانراوە حیزبی و حکومییەکانیش، لەبەرئەوەی رەنگدانەوەی تێڕوانینی حوکمەت و دەزگاو لایەنەسیاسییەکانن، پشتمان پێبەستوون و کەڵکمان لێوەرگرتوون. بەتایبەتی هەڵسەنگاندنەکەی (پارتی دیموکراتی کوردستان سەرکردایەتی کاتی، رێبازی بزووتنەوەی ئازادیخوازی کورد... )کە تاڕاددەیەکی باش، بابەتییانەیە. هەروەها سوودمان لە (منشورات دار التآخي، في سبيل السلم والوحدة الوطنية...) و (منشورات الثورة، لكي يصان السلام...) وەرگرتووە.

گۆڤارو رۆژنامەكانیش بەتايبەتى هى سالآنى (١٩٧٠–١٩٧٤) كە وەك ئاوێنەى رووداوەكانى ئەو سەردەمەن ، بەتايبەتى رۆژنامەكانى (برايەتى– برايى)و (بيرى نوێ) و (التآخي)و (الوقائع العراقية)و گۆڤارى (كادر)، سەرچاوەى گرنگ بوون بۆ ئامادەكردنى توێژينەوەكەمان.

بەر لە كۆتاييش، هيوادارم توانيبێتم كارێكى زانستييانەم ئەنجامدابێ و بە گەياندنى زانياريى دروست و بەڵگەدار، كەلێنێكى بچووكم لە تۆمارى مێژوويى كورد پڕكردبێتەوە. دەستخۆشيش لە هەركەسێك دەكەم بە ئاراستەو سەرنج و ئاماژەى زانستى و بابەتييانە، درزەكانى توێژينەوەكەم پڕكاتەوە.

## بەرایی

کوردستانی ژێر دەسەڵاتی عێراق لەوکاتەی کە بە دەوڵەتی عێراقەوە لکێندرا[(١)]، لەلایەن ڕژێمی پاشایەتی حوکمڕانەوە مافی ڕۆشنبیری و سیاسیی پێ ڕەوانەبینرا بوو. بۆیە کورد لەم بەشەی کوردستاندا بەردەوام لە جەنگ و ململانێدا بووە بۆ سەندنی مافەکانی لەسەر بنەمای دادپەروەری. لەم پێناوەشدا چەندین شۆڕش و ڕاپەڕینی چەکدارانەی بەرپا کردووە، کە وێڕای سەرکوت و کپکردنیان، هەریەکەیان کاریگەریی بە ئەزموونی بۆ دوای خۆی بەجێهێشتووە.

کاتێکیش ڕژێمی پاشایەتی ١٤ی تەمموزی ١٩٥٨ ڕووخێندرا، ڕژێمی کۆماری بە ڕابەرایەتی عەبدولکەریم قاسم جێی گرتەوە، جووڵانەوەی ڕزگاریخوازی کوردستان لەو سەردەمەدا کە پارتی دیموکراتی کوردستان (پ.د.ک) بە ڕابەرایەتی مستەفا بارزانی سەرکردایەتی دەکرد، بە ئومێدەوە پێشوازی لە ڕژێمی نوێ کرد.

لە هەفتەکانی یەکەمی دوای ١٤ی تەمموزی ١٩٥٨، (پ.د.ک) چەندین شاندی لە شارو شارۆچکەکانی کوردستان ڕێکخست و شاندی کوردستان بەرەو وەزارەتی بەرگری لە بەغدا بەڕێ خرا. لەوێ سەرۆکی شاندەکە (برایم ئەحمەد)[(*)]،

---

(١) بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: د.فاضل حسین، کێشەی ویلایەتی مووسڵ، و: محەمەد شاکەلی، چ١، چاپخانەی خاك، سلێمانی، ١٩٩٩.

(*) برایم ئەحمەد: ساڵی ١٩١٤ لەشاری سلێمانی لەدایك بووە، ساڵی ١٩٣٧ کۆلیژی مافی لەبەغدا تەواوکردووە. ساڵی ١٩٤٤ یەکێك بووە لەدامەزرێنەرانی کۆمەڵەی (ژ.ك)، ساڵی ١٩٥١ بۆتە سکرتێری پارتی دیموکراتی کوردستانی عێراق، لەبواری سیاسیی و ڕۆژنامەوانیی و ئەدەبدا ڕۆڵێکی کاریگەری گێڕاوە. دوای نسکۆی شۆڕشی ڕزگاریخوازی کوردستان لەساڵی ١٩٧٥ ڕوویکردە لەندەن و لەوێ مایەوەو ساڵی ٢٠٠٠ کۆچی دوایی

لەخوێندنــەوەی وتارێکـدا، پــشتگیری گــەلی کوردســتانی بـۆ رژێمــی کۆمـاری راگەیاند[٢]

لەئەنجامـدا، رژێمــی کۆمـاری هەنـدێ هــەنگاوی پۆزەتیفانــەی هــەڵنا، وەك بەتاڵکــردنی ئــەو فەرمــانی لــە ســێدارەدانەی لەلایــەن رژێمــی پاشـایەتییەوە بۆمـستەفا بـارزانی ســەرۆکی (پ.د.ك) دەرچـوو بـوو[٣] لـە٦ی تـشرینی یەکـەمی ١٩٥٨ مـستەفا بـارزانی کـە پەنابـەری یـەکێتی سـۆڤیەت بـوو، گەڕایـەوە بەغـدای پایتــەختو لەلایــەن حوکمەتــەوە بەگــەرمی پێـشوازی کـرا، لـە کاتێکـدا بەلێـشاو خــەڵکی کــورد بــۆ دەربڕینــی رێــزو خۆشەویــستی ســەرکردەکەیان ئامــادەی ئاهەنگەکانی پێشوازی بوون[٤]

---

کورد. ئەحمـەد شـەریف، بـرایم ئەحمـەد... ژیـانو... بـەهرەو... داهێنـانی، چاپخانەو کۆمپیوتەری بەدرخان، سلێمانی، ٢٠٠٢.

(٢) جلال طالباني، كردستان والحركة القومية الكردية، ط٢، دار الطليعة للطباعة والنشر، بيروت، ١٩٧١، ص٢٧٩– ٢٨٤.

(٣) مسعود البارزاني، البارزاني والحركة التحررية الكردية، ج٣، ثـورة ايلـول ١٩٦١–١٩٧٥، مـط وزارة التربية، اربيل، ٢٠٠٢، ص٢١.

(٤) میرزا محمد امین مەنگوری، بەسەرهاتی سیاسیی کورد، ب١، رووداوەکـانی کـوردسـتان لـە ساڵی ١٩٥٨– ١٩٧٠،لەبڵاوکراوەکانی بنکەی ئەدەبیو رووناکبیری گەلاوێـژ، چـاپخانەی داناز، چ٢، سلێمانی، ١٩٩٩، ل١٩؛ بۆ زانیاریی زیـاتریش لـەم بارەیـەوە بڕوانـە: میڤـان عارف عبدالرحمن البادي، الحركة القومية الكوردية التحررية في كوردستان الجنوبية، رسالة ماجستير غير منشورة مقدمة الى مجلس كلية الاداب، جامعة صلاح الـدين، ٢٠٠٢، ص٤٨– ٥٣.

له سایەی رژێمی نوێ، (پ.د.ك) دەستی بە خەباتی ئاشكرا كردو لەنێوان سالآنی ١٩٥٩–١٩٦١ رۆژنامەی (خەبات)ی بەزمانی عەرەبی[*] و (كوردستان)ی بەزمانی كوردی دەردەكرد، حیزبەكەش كە ١٤ سالْ بەبێ مۆڵەت و بەنهێنی كاری دەكرد، لە ٩ی شوباتی ١٩٦٠ مۆڵەتی یاسایی كاركردنی پێدرا[٥].

بێگومان هەموو ئەوانە ئەوە ناگەیەنن كە كوردو رژێمی قاسم لەسەر هەموو بابەتێك كۆك و تەبابوون، بەڵكو ناكۆكی نێوانیان لەو كاتەوە سەری هەڵدا كە رژێمی فەرمانڕەوا دەستووری كاتیی دەوڵەتی راگەیاند كە لە مادە (٢)ی ئەو دەستوورەدا هاتبوو: "عێراق بەشێكە لە نەتەوەی عەرەبی"[٦]، ئەوەش پێچەوانەی مادە (٣)ی دەستوورەكە بوو كە دەڵێ: "عەرەبو كورد لەم نیشتمانەدا هاوبەشن"[٧]

پارتی دیموكراتی كوردستان وتارێكی رەخنەیی لەمەڕ مادە (٢)ی دەستووری ناوبراو بڵاوكردەوە، لەو وتارەدا ئەوەی رەت كردەوە كە ئەو بەشەی كوردستان كە كەوتۆتە ناو عێراقەوە، بە بەشێك لە نیشتمانی عەرەبی لە قەڵەم بدرێ. لەلایەكی دیكەشەوە بەپێویستی زانی كە مەبەستی ئەو مادەیە دووبارە بە روونو

(*) هەندێ ژمارەی (خەبات) بەزمانی كوردیش دەرچووە بڕوانە: عەبدوڵلا زەنگەنە، دادگایی كردنی خەبات یەكەمین ڕۆژنامەی سیاسیی كوردی، "ڕۆژنامەڤانی" (گۆڤارێكی وەرزییە) سەندیكای ڕۆژنامەنووسانی كوردستان دەریدەكات، ژ(٢)، هەولێر ، ئابی ٢٠٠٠ ، ل ١٢٩– ١٦٤.

(٥) جلال طالباني، كردستان والحركة القومية الكردية، ص ٢٧٣.

(٦) "الوقائع العراقية"، الجريدة الرسمية للجمهورية العراقية تصدرها وزارة الثقافة والاعلام في العراق، ع(٢)، ١٩٥٨/٧/٢٨.

(٧) هـ س.

ئاشکرایی لە دەستووری هەمیشەیی دابڕێژرێتەوە[8] ئەوەش ناڕەزایی ڕژێمی عێراقی وروژاندو لە ڕۆژنامەی (الثورة)دا بەرپەرچی داوە[9] هەر بەوەندەش نەوەستان، بەڵکو کەوتنە دادگاییکردنی ڕۆژنامەی (خەبات)[10] و خودی برایم ئەحمەدی خاوەن ئیمتیازی ڕۆژنامەکە[11]

پاشان دەسەڵاتدارانی عێراق هەڵمەتێکی پۆلیسییان بۆ دەسگیرکردنی خەڵکی کورد بەرپاکرد کە ژمارەیەکی زۆری کادیرو ئەندامە باڵاکانی (پ.د.ک)یشی گرتەوە، گەرچی مۆڵەتی یاسایی کارکردنیشیان هەبوو[12]

دەرەنجامی شکستهێنانی هەموو هەوڵێك بۆ وازهێنانی دەسەڵاتدارانی عێراق لەڕێگەچارەی سەربازی، جووڵانەوەی ڕزگاریخوازی کورد هەموو ئەو دەستدرێژیانەی بە شۆڕشێکی مەزن بەرپەرچدایەوە کە لە ١١ی ئەیلولی١٩٦١دا لە ژێر ڕابەرایەتی مستەفا بارزانی دا هەڵگیرسا. لەو بارودۆخەدا حیزبی بەعسی عەرەبی سۆشیالیست لاوازییەکانی (قاسم)یان بەرانبەر تەنگو چەڵەمە سیاسیی و

(٨) بڕوانە: "خەبات /النضال" (جريدة يومية سياسية للحزب الديمقراطي الكردستاني)، ع(٣٣٩)، ١٩/١٠/١٩٦٠.

(٩) وەرگیراوە لە: حبيب محمد كريم، تاريخ الحزب الديمقراطي الكوردستاني– العراق (في محطات رئيسية)١٩٤٦– ١٩٩٣، مط خەبات، دهوك، ١٩٩٨ ، ص٧٢.

(١٠) بۆ زانیاریی زیاتری بڕوانە: عەبدوڵڵا زەنگەنە، س پ، بەشی یەکەم، ژ(٢)، ل ١٢٩ –١٦٤، بەشی دووەم، ژ(٣)، کۆتایی کانونی یەکەمی ٢٠٠٠، ل٢٨–٩٢، بەشی سێ یەم، ژ(٤)، ٢٢ نیسان ٢٠٠١، ل٦٢–١٢٩.

(١١) بڕوانە جرجيس فتح الله (المحامي)، العراق في عهد قاسم (آراء وخواطر) ١٩٥٨–١٩٨٨، ج٢، دار نبز للطباعة والنشر، سويد ، ١٩٨٩ ، ص ٨٤١– ٨٤٣

(١٢) بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: میڤان عارف عبدالرحمن البادي، س پ. ل٧٦– ٩٦؛ محمد احسان، كردستان ودوامة الحرب، ط١، دار الحكمة، لندن، ٢٠٠٠، ص٤٦– ٤٧.

ئابوورییەکانی عێراق قۆستەوەو لەساڵی ١٩٦٢دا بۆ ئەنجامدانی کودەتایەکی سەربازی دژی ئەو رژێمە خۆیان رێکخست تا لە ٨ی شوباتی ١٩٦٣دا، بەپشتیوانی ئەفسەرە نەتەوەییەکانی نێو سوپای عێراق، بەکودەتایەك دەسەڵاتیان گرتەدەستو عەبدولسەلام عارف، کە لە ئەفسەرە نەتەوەییەکان بوو، بووە سەرۆك کۆمار[١٣] لە هەمان رۆژیشدا، ئەو ئەنجومەنەی کە لەژێر ناوی (ئەنجومەنی نیشتمانی سەرکردایەتی شۆڕش/المجلس الوطني لقيادة الثورة) کودەتاچییەکان پێکیان هێنابوو، لە بەیاننامەیەکدا، باسی لە یەکێتی نیشتمانی گەلو پتەوکردنی برایەتی کوردو عەرەبو زامنی بەرژەوەندییە نەتەوەییەکان کرد[١٤]. کودەتاچییەکان کاتی خۆسازدانیان بۆ ئەنجامدانی کودەتاکەیان پێوەندییان بە (پ.د.ك) کردبوو، بەڵێنیشیان دابوو کە دوای سەرکەوتنیان هەموو مافە سیاسییەکانی گەلی کورد مسۆگەر بکەن[١٥]. بۆیە گفتوگۆی نێوان (پ.د.ك)و حوکمەتی نوێ دەستیپێکرد، بەڵام هیچ ئاکامێکی نەبوو[١٦]. ئیتر خەڵکی کورد هێجگار بێئومێد بوون، کاتێك دوای کەمتر لە چوار مانگ، رژێمی نوێ هێرشی

(١٣) بۆ زانیاریی زیاتر دەربارەی ئەو کودەتایە بڕوانە: د.مجيد خدوري، العراق الجمهوري، ط١، مط امير– قم، ايران ١٣٧٦– ١٤١٨، ص٢٦– ٢٦٤.

(١٤) "الوقائع العراقية"، ع (٧٧١)، ١٨/٢/ ١٩٦٣.

(١٥) مسعود البارزاني، البارزاني والحركة التحررية الكردية، ج٣، ص٨١.

(١٦) بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: ش.ج. اشريان، الحركة الوطنية الديمقراطية في كردستان– العراق ١٩٦١– ١٩٦٨، ت: ولاتو، ط ١، دار الكاتب، بيروت، ١٩٧٨، ص٨٧–١٠٠؛ عبدالفتاح علي يحيى البوتاني (الدكتور)، وثائق عن الحركة القومية الكوردية التحررية، ط١، مط وزارة التربية، اربيل، ٢٠٠١، ص٢٢٢–٢٢٣ و ٢٣٠–٢٣٤.

سەربازی پیادەکردو، بۆ دامرکاندنەوەی شۆڕش هانای بردە بەر سوپای سوریا. ئەوەبوو لیوایەکی سوری لەتەك سوپای عێراق لە گۆڕەپانی شەڕدا ئامادەبوو[١٧]

بە هۆی سیاسەتی نانیشتمانییو ململانێی نێوخۆی بەعس، عەبدولسەلام عارف توانی بە کودەتایەکی سەربازی لە ١٨ی تشرینی دووەمی ١٩٦٣دا کۆتایی بە دەسەڵاتی بەعس بهێنێت[١٨].

عارف هەر دوای کۆنترۆڵکردنی دەسەڵات، لە یەکەمین کۆنگرەی ڕۆژنامەگەریدا بۆ گرێدانی ئاشتبوونەوە لەگەڵ سەرکردایەتی شۆڕشی کورد ڕایگەیاند: "لەگەڵ برا کوردەکانمان لەم وڵاتەدا بەهاوبەشی ژیاوینو پەنا بەخوا تا دوایی هەر بەو شێوەیە لەگەڵیاندا دەژین"[١٩]

لە کانوونی یەکەمی ١٩٦٣دا عەبدولسەلام عارف بەنیازی وتووێژکردن پێوەندیی بە سەرکردایەتی شۆڕشی کورد کرد. دواتر گفتوگۆی هەردوولا دەستی پێکردو لە ١٠ی شوباتی١٩٦٤ لەسەر ئاگربەست ڕێککەوتن[٢٠]

بێگومان ئەو ڕێککەوتنە لای هەردوولا تەنها مانۆڕێك بوو بۆ دەرفەت قۆستنەوە. مستەفا بارزانی هەستی دەکرد کە ئەو ڕژێمە نیازی نیە دانبنێ بە مافی ئۆتۆنۆمی بۆ کورد، بەڵام دەیویست دۆستانی گەلی کورد ڕازی بکات و بۆ

---

(١٧) جرجيس فتح الله، زيارة للماضي القريب، دار الشمس للطباعة والنشر، سويد–ستوكهولم، ١٩٩٨، ص٨٠؛ علي سنجاري، الحركة التحررية الكوردية (مواقف وآراء)، ط١، مط خەبات، دهوك، ص٧٢.

(١٨) د.مجيد خدوري، س پ، ل٢٩٣– ٢٩٤.

(١٩) د.سعد ناجي جواد، العراق والمسألة الكردية ١٩٥٨– ١٩٧٠، لندن، ١٩٩٠، ص١٠٣– ١٠٤.

(٢٠) بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: مسعود البارزاني، البارزاني والحركة التحررية الكردية، ج٣، ص١٢٤– ١٢٩.

هـەموو جیهـانیش بـسەلمێنێ کـە ئـەو لەگـەڵ چارەسـەری ئاشـتیانەی کێـشەی کورد ە[٢١]

دەبــێ ئــەوەش بگــوترێ ئــەو ڕێککەوتنــە بــووە هۆکــاری قووڵبوونــەوەی ناکۆکییــەکانی نێــو جووڵانــەوەی ڕزگــاریخوازی کــورد، کــە لەئاکامــدا ســکرتێرو ژمارەیەك لە ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندیی و مەکتەبی سیاسیی پـارتی دیمـوکراتی کوردستان (لەنێویاندا برایم ئەحمەدی سکرتێری حزب و جـەلال تاڵـەبانی ئەنـدامی مەکتەبی سیاسیی) ساڵی١٩٦٤ لە شۆڕشی کوردستان جیابوونەوە، چونکە پێیـان وابوو ئەو ڕێککەوتنە خواستە نەتەوەییەکانی گـەلی کـورد مەیـسەر ناکـاو مـستەفا بـارزانی تـەنازولێکی گـەورەی بـۆ حوکمـەتی عێـراق کـردووە[٢٢]. ئـەو باڵـەش کـە جیابوونەوە، لەبەرئەوەی زۆربەی ئەندامانی مەکتەبی سیاسی (پ.د.ك)ی لەگەڵدا بوو، بە باڵی مەکتەبی سیاسیی (م.س) دەناسران.

شـایانی باســە، دووبــەرەکیی نێــوان مەکتــەبی سیاســیی(پ.د.ك)و مــستەفا بـارزانی، پێـشینەی خـۆی هـەبوو. پێـشتریش دەسـتەی هـەمزە عەبـدوڵلا کـە لـە سەکردایەتی بوون لەگەڵ سـەرۆکی پـارتی لـە ناکۆکیـدا بـوون تـا سـاڵی١٩٥٩ لـە

---

(٢١) خليل جندي، حركة التحرر الوطني الكردستاني في كردستان الجنـوبي ١٩٣٩– ١٩٦٨ (اراء وتحقيقات)، ستوكهولم، ١٩٩٤، ص١٥٧– ١٥٨.

(٢٢) بۆ زانیاریی زیاتر لەم بارەیەوە بڕوانە: ديڤيد ادامسن و جرجيس فتح الله، الحـرب الكرديـة وانشقاق ١٩٦٤، ط٢، مط وزارة التربية، اربيل، ١٩٩٩؛ د.عبدالفتاح علي يحيى البوتـاني، س پ، ل٢٤٣– ٢٥٨؛ مـسعود البـارزاني، البـارزاني والحركـة التحرريـة الكرديـة، ج٣، ص١٣٣– ١٤٩؛ صلاح الخرسان، التيارات السياسية في كردستان العراق (قـراءة في ملفـات الحركات والاحزاب الكردية في العراق ١٩٤٦–٢٠٠١)، ط١، مؤسسة البلاغ للطباعـة والنـشر، بيروت، ٢٠٠١.ص١٢٣–١٣٧؛ علي سنجاري،س پ، ل٤٧–٥٦ و ٩٣–٩٤؛ جـرجيس فـتح الله، زيارة للماضي القريب، ص١٢٤–١٢٧.

کـۆنگرەی چـوارەمی(پ.د.ك)دا ئـەو دەسـتەیە دوورخرانـەوە. زۆریـشی نـەبرد گفتوگۆی نێوان رژێمی عەبدولسەلام عارفو مستەفا بارزانی بووە هۆی تەقینەوەی ئەو دووبەرەکییە[٢٣]

ئاگربەستی نێوان شۆڕشی کوردو رژێمی فەرمانڕەوای عێراق بەردەوام نەبوو. لەسـەرەتای نیـسانی١٩٦٥دا جـارێکی دیکـە شـەڕی نێـوان هـەردوولا هەڵگیرسایەوە[٢٤] لە ٢١ی ئەیلولی هەمان ساڵدا عەبدولسەلام عارفی سەرۆك کۆمار داوای پێکهێنانی حوکمەتێکی نوێی لـە عەبـدولرەحمان بـەزاز کـرد[٢٥] شایـستەی وتنیشە کە لە ساڵی(١٩٥٨)ەوە نـاوبراو یەکـەم کەسـی مـەدەنی بـوو لـە پۆسـتی سەرۆك وەزیرانی رژێمی کۆماری دابمەزرێ، بەڵام ئەوە کاری نەکردە سەر رێڕەوی رووداوەکان، بەڵکو ئەفسەرانی سوپا هەر باڵادەست بوون، بۆیـە پێکـدادانی هێـزە سەربازییەکانی عێـراقو پێـشمەرگەی کـورد هـەر بـەردەوام بـوو[٢٦] کۆتاییـەکانی ساڵی١٩٦٥ دەستەی برایم ئەحمەدو هاوڕێیانی پێوەنـدییان لەگـەڵ رژێمـی عێـراق بەستو سەرەتای ساڵی ١٩٦٦چوونە پاڵ ئەو رژێمە[٢٧]

لە ١٣ی نیسانی١٩٦٦دا عەبدولسەلام عـارف لەئـەنجامی کەوتنـە خـوارەوەی فڕۆکەکەی مرد. دوای ئەو(عەبدولرەحمان عارف)ی برای جێی گرتەوە[٢٨]

---

(٢٣) بڕوانـە: مـەحمود مـەلا عـزەت، کـاروانی بـێ کۆتـایی (گۆشـەیەك لـە یاداشـت و بیرەوەرییەکان)، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی، ٢٠٠٠، ل٨٢– ٨٣.

(٢٤) ش.ج. اشیریان، س پ، ل١٣٣.

(٢٥) د.مجید خدوري، س پ، ل٣٣٨.

(٢٦) د.سعد ناجی جواد، س پ، ل١١٨.

(٢٧) مسعود البارزاني، البارزاني والحرکة التحرریة الکردیة، ج٣، ص١٧١.

(٢٨) بۆ زانیاریی زیاتر لەم بارەیەوە بڕوانە: د.مجید خدوري، س پ، ل٣٤٩– ٣٥٢.

لەوکاتەدا مستەفا بارزانی بۆ ئەوەی بوارێك بە سەرۆك کۆماری نوێ بدات و هەڵوێستی بەرانبەر کێشەی کورد تاقی بکاتەوە، بڕیاریدا بۆ ماوەی مانگێك شەڕ رابگیرێ، بەڵام لە بەرانبەردا دەسەڵاتدارانی عێراق، مستەفا بارزانییان بە وڵاتفرۆش و بەکرێگیراوی ئیمپریالیزم لەقەڵەمدا[٢٩] پاشانیش لەژێر ناوی (توکلت علی الله) پلانێکی گەورەی سەربازییان بۆ پەلاماردانی بنکەکانی شۆڕشی کوردستان رێکخست و لە شەوی ٢ /٣ی ئایاری ١٩٦٦ هێرشێکی گەورە کرایە سەر سەنگەرەکانی پێشمەرگە لە چیاکانی زۆزك و هندرێن لە ناوچەکانی رەواندوز. بۆ ماوەی ١٠ رۆژ شەڕی نێوان هەردوولا بەردەوام بوو، لە ئەنجامدا پێشمەرگەکانی کوردستان هێزەکانی سوپای عێراقیان تووشی شکستێکی گەورە کرد[٣٠]

ئەم شکستە سەربازییەی سوپای عێراق، عەبدولرەحمان عارفی ناچار کرد پەنا بەرێتەوە بەر گفتوگۆ لەگەڵ شۆڕشی کورد[٣١]، لە ئاکامدا ٢٩ی حوزەیرانی١٩٦٦ عەبدولرەحمان بەزازی سەرۆك وەزیران، لە ئێزگەو تەلەفزیۆنی بەغدا بەیاننامەی رێککەوتنی راگەیاند کە بە (بەیاننامەی ٢٩ی حوزەیران) ناسرا[٣٢] و لە ١٢ خاڵی سەرەکی پێکهاتبوو[٣٣]، وێڕای سێ خاڵی نهێنیی و ئاشکرا نەکراو[٣٤]

هەروەکو پێشتریش ئاماژەمان پێدا، لەو سەردەمەدا بزووتنەوەی رزگاریخوازی کورد بۆ دوو باڵی دژ بەیەك دابەشببوون، کە هەردوولایان بەناوی پارتی دیموکراتی کوردستان کاریان دەکرد، باڵێکیان مستەفا بارزانی رابەرایەتی

---

(٢٩) جەمال نەبەز، کوردستان و شۆڕشەکەی، و: کوردۆ، ئەڵمانیا، ١٩٨٥، ل٢٦٣.

(٣٠) بڕوانە: مسعود البارزاني، البارزاني والحركة التحررية الكردية، ج٣، ص١٧٢– ١٨٠.

(٣١) د.محمد احسان، س پ، ل٦٠

(٣٢) د.سعد ناجی جواد، س پ، ل١٣٠.

(٣٣) سەبارەت بە خاڵەکانی بەیاننامەکە بڕوانە: د.مجيد خدوري، س پ، ل٢٦٢– ٣٦٥.

(٣٤) د.عبدالفتاح علی يحيی البوتاني، س پ، ل٣٨٢.

دەکردو باڵەکەی دیکەش لەلایەن برایم ئەحمەد سەرپەرشتی دەکرا کە خۆیان دابووە پاڵ رژێمی فەرمانڕەوا. لەدوای راگەیاندنی بەیاننامەی ٢٩ی حوزەیران ناکۆکیو ململانێی نێوان ئەو دوو باڵە زیاتر تەشەنەی کردو شەڕی نێوانیان سەختتر بوو[٣٥]

هاوسەردەم ، حیزبی شیوعی عێراقیش کە لە سەرتاسەری عێراقدا خاوەن جەماوەر بوو، ناکۆکیو کەرتبوونی تێکەوتبوو، کە بەشێکیان بەناوی(ح.ش.ع– لێژنەی مەرکەزی)و بەشەکەی دیکەش بەناوی(ح.ش.ع– قیادەی مەرکەزی) خەباتیان دەکرد[٣٦].

دوای تێپەڕبوونی ساڵێك بەسەر دەرکردنی بەیاننامەی ٢٩ی حوزەیران، لە رۆژنامەی (التآخي)[*] زمانحاڵی (پ.د.ك) دا چەند وتارێك سەبارەت بە خەمساردی حوکمەت لە جێبەجێکردنی ئەو بەیاننامەیە بلاوکرایەوە. پاشان عەبدولرەحمان بەزاز کە هەرچەندە لەوکاتەدا لە پایەی سەرۆك وەزیران نەمابوو، وەلامی(التآخي) دایەوە[٣٧]

---

(٣٥) بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: مسعود البارزاني، البارزاني والحركة التحررية الكردية، ج٣، ص١٩٧– ١٩٩؛ ئیبراهیم جەلال، خوارووی کوردستانو شۆڕشی ئەیلول بنیاتنانو هەڵتەکاندن ١٩٦١– ١٩٧٥، چ٢، چاپخانەی ژیار، سلێمانی، ١٩٩٩، ل٢٢١– ٢٢٨.

(٣٦) بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: صلاح الخرسان، صفحات من تاريخ العراق السياسي الحديث (الحركات الماركسية) ١٩٢٠– ١٩٩٠، ط١، مؤسسة العارف للمطبوعات، بيروت– لبنان، ٢٠٠١، ص١٢٤– ١٣٤؛ بهاءالدين نوري، مذكرات، ط٢، مط جامعة صلاح الدين، كردستان العراق، آذار/ ١٩٩٥، ص٢٧٣–٢٨٥.

(*) "التآخي": رۆژنامەیەکی رۆژانەی سیاسیی بوو لە بەغدا بەکوردیو عەرەبی دەردەچوو کە لە ٢٩ی نیسانی ١٩٦٧ یەکەم ژمارەی لێ بلاوکرایەوە، بڕوانە: جبار جباري، تاريخ الصحافة الكردية في العراق، مط الأمة ، بغداد، ١٩٧٥ ، ص ٦٤

(٣٧) بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: جرجيس فتح الله، زيارة للماضي القريب، ص١٣٥– ١٤٢.

له سەرەتای ساڵی ١٩٦٨یش بەدواوە هەندێ پێکدادانی سەربازی لەنێوان هێزەکانی حوکمەتو پێشمەرگەکانی کوردستان روویدا[٣٨].

١٧ی تەمموزی ١٩٦٨، بۆ جاری دووەم حیزبی بەعس بە کودەتایەکی سەربازی جڵەوی حوکمی عێراقی گرتەوە دەست، کە سەرکردایەتی نوێ پێکهاتبوو لە بەعسییەکان بە سەرۆکایەتی ئەحمەد حەسەن بەکرو ئەفسەرە سەربازییەکانیش بە سەرۆکایەتی عەبدولرەزاق نایف بە پایەی جێگری سەرۆکی هەوالگری سەربازی، هەر لەلایەن کودەتاچییەکانیشەوە یەکەمیان بەسەرۆک کۆمار هەڵبژێردرا کە ئەویش داوای لە نایف کرد وەزارەتێکی نوێ پێکبهێنێ[٣٩].

حیزبی بەعس، ئەگەرچی هەر لەسەرەتای هەڵگیرسانی شۆڕشی ئازادیخوازی کورد لە ئەیلولی(١٩٦١)ەوە لە بەیاننامەیەکیدا شۆڕشگێرانی کوردی بە "رەگەزپەرستو گومانلێکراو" لە قەڵەمدا بوو[٤٠]، بەڵام بە سوود وەرگرتن لە ئەزموونی ماوەی دەسەڵاتی یەکەمیان ساڵی ١٩٦٣، ئەمجارەیان کە لە ١٧ی تەمموزی ١٩٦٨ دەسەڵاتیان گرتەوە دەست لە بەیاننامەی (ئەنجوومەنی سەرکردایەتی شۆڕش)ی عێراق کە کودەتاچییەکان پێکیان هێنابوو، ئاماژەیان بەکێشەی کورد داو گلەییان لە رژێمی پێشوو کرد کە هیچ هەنگاوێکی پۆزەتیفانەی بۆ چارەسەرکردنی ئەم کێشەیە نەهاویشتووە. راشیانگەیاند کە لە

(٣٨) بڕوانە: مسعود البارزاني، البارزاني والحركة التحررية الكردية، ج٣، ص١٩٩– ٢٠١.

(٣٩) د. سعد ناجي جواد، س پ، ل١٤٤.

(٤٠) بۆ زانیاریی زیاتر دەربارەی هەڵوێستی حیزبی بەعس بەرانبەر شۆڕشی ئەیلول بڕوانە: مەکتەبی ناوەندیی دیراساتو توێژینەوەی (پ.د.ك)، هەڵوێستی حیزبە سیاسییەکانی عێراق لەسەر کێشەی کورد١٩٤٦– ١٩٧٠، لە بڵاوکراوەکانی مەکتەبی ناوەندیی دیراساتو توێژینەوەی (پ.د.ك)، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر ١٩٩٧، ل١٣٧– ١٤٧.

بەرنامەی سیاسەتی ناوخۆیاندا مەبەستیانە کۆتایی بە کێشەی باکوور (واتە کێشەی کوردستان) بهێنن[٤١]، بەڵام دەریان نەخست بەچ شێوازێك و لەسەر چ بنەمایەك ئەو کارە ئەنجام دەدەن.

لەو قۆناغەدا بەعس هەوڵیدا هەردوو باڵی جووڵانەوەی کورد رازی بکات و بۆ لای خۆی رایانبکێشی، بۆیە لە کابینەی وەزارەتەکەیاندا دوو وەزیریان بۆ باڵی مستەفا بارزانی[٤٢] و وەزیرێکیان بۆ باڵی (برایم ئەحمەد-جەلال تاڵەبانی/"م.س")[٤٣] تەرخانکرد، بەڵام مستەفا بارزانی بەوە رازی نەبوو بچێتە ژێر باری مەرجەکانی بەعس، بۆیە هەردوو وەزیرەکەی خۆی کێشایەوە. بەمەش پێوەندییان لەگەڵ دەسەڵاتدارانی بەعس گرژی تێکەوت[٤٤].

٣٠ تەمموزی ١٩٦٨ لە کودەتایەکی دیکەی بەعسییەکاندا، عەبدولرەزاق نایفیش لەدەسەڵات دوورخرایەوە، لەهەمان رۆژیشدا (ئەنجوومەنی سەرکردایەتی شۆرش)ی عێراق بەیاننامەیەکی دەرکرد کەتیایدا هاتبوو: "(ئەنجوومەنی سەرکردایەتی شۆرش) پەیمان بەخواو گەل دەدات کە رژێمێکی دیموکراتی یەکگرتووی شۆرشگێر بنیات بنێت... کێشەی کوردیش بە ئاشتیانەو دادوەرانە بەشێوەیەك چارەسەر بکات کە خواستە نەتەوەییەکانی برا کوردەکانمان بەدیبهێنێ و یەکێتی عێراقیش مسۆگەر بکات..."[٤٥]

---

(٤١) "الوقائع العراقية"، ع (١٩٥٨)، ١٩٦٨/٧/١٨

(٤٢) ئەو باڵە موحسین دزەیی و ئیحسان شێرزادی بۆ ئەو وەزارەتە دەسنیشان کرد.

(٤٣) ئەو باڵە تەها محێدین مەعروفی بۆ ئەو وەزارەتە دەسنیشان کرد.

(٤٤) ئەوشیروان مستەفا ئەمین، پەنجەکان یەکتری ئەشکێنن (دیوی ناوەوەی رووداوەکانی کوردستانی عێراق ١٩٧٩- ١٩٨٣)، چ٢، بیّ چ سلێمانی، ١٩٩٨، ل٩٦- ٩٧.

(٤٥) "الوقائع العراقية"، ع (١٦٠٣)، ١٩٦٨/٨/١٠

له‌٣ی ئابیشدا، به‌عسییه‌كان به‌ به‌یاننامه‌یه‌ك بڕیاریاندا كه‌ به‌ به‌یاننامه‌ی (٢٩ی حوزه‌یرانی ١٩٦٦)ه‌وه‌ پەیوه‌ست بن[٤٦]. له‌ڕۆژی دواتریش وه‌ك هه‌نگاونانێك بۆ جێبه‌جێكردنی ئه‌م بڕیاره‌یان، له‌به‌یاننامه‌یه‌كی دیكه‌دا بڕیاریان به‌ ناردنه‌ ده‌ره‌وه‌ی خوێندكارانی كورد بۆ ده‌ره‌وه‌ی وڵاتو دامه‌زراندنی كۆڕی زانیاریی كوردو دامه‌زراندنی زانكۆیه‌ك له‌ سلێمانی دا[٤٧]

بێگومان ئه‌و كارانه‌ی به‌عسییه‌كان له‌ دڵسۆزییان بۆ كوردو كێشه‌كه‌ی سه‌رچاوه‌ی نه‌گرتبوو، به‌ڵكو به‌هۆی ئه‌زموونی پێشوویان له‌ ساڵی ١٩٦٣دا، نیازیان به‌رگرتن بوو له‌ جۆشدان وهه‌نگاوی خێرای بزووتنه‌وه‌ی سیاسیی كورد.

له‌گه‌ڵ هه‌موو ئه‌مانه‌شدا، به‌عس نه‌یتوانی مه‌یلی تاكڕه‌وی‌و ره‌گه‌زپه‌رستانه‌ی خۆی په‌رده‌پۆشكا. ئه‌وه‌بوو له‌ مادده‌ (١)ی ده‌ستووری كاتییدا كه‌ (ئه‌نجوومه‌نی سه‌ركردایه‌تی شۆڕش)ی عێراق له‌ ٢١ی ئه‌یلولی ١٩٦٨ ده‌ری كرد، گه‌لی عێراقی به‌ به‌شێك له‌ نه‌ته‌وه‌ی عه‌ره‌ب له‌ قه‌ڵه‌مدا، هه‌روه‌ها له‌ كۆی (٩٥) مادده‌ی ئه‌و ده‌ستووره‌دا ته‌نها یه‌ك جار، ئه‌ویش له‌ مادده‌ (٢١)دا ناوی كوردی هێنابوو كه‌ له‌ ماف و ئه‌ركدا ، عه‌ره‌بو كورد له‌ به‌رانبه‌ر یاسادا به‌ یه‌كسان له‌ قه‌ڵه‌می دابوون[٤٨]

له‌ باره‌ی ئه‌و ده‌ستووره‌شه‌وه‌، (پ.د.ك) پێی وابوو كه‌ "پێویست بوو هه‌ر هیچ نه‌بێ ئه‌و ده‌ستووره‌ وه‌ختییه‌ تازه‌یه‌ش پیشانی هێزه‌ سیاسییه‌كانی گه‌ل بدرێ یان بیروڕای گه‌ل له‌ باره‌یه‌وه‌ وه‌ربگیرێ"[٤٩]

---

(٤٦) "الوقائع العراقية"، ع (١٦٠٤)، ١٩٦٨/٨/١٢.

(٤٧) هـ س.

(٤٨) بڕوانه: "الوقائع العراقية"، ع (١٦٢٥)، ١٩٦٨/٩/٢١.

(٤٩) بڕوانه: رۆژنامه‌ی برایی(ئۆرگانی پارتی دیموكراتی كوردستان)، لێكدانه‌وه‌ی ده‌ستوره‌ وه‌ختییه‌ تازه‌كه‌، به‌غدا، ژ(٣٨٥)، ١٩٦٨/٩/٢٨.

(ئەنجوومەنی سەرکردایەتی شۆڕش)ی عێراق بۆ ئەوەی سەرنجی گەلی کورد بۆخۆی رابکێشی، لە ١٩٦٨/٩/٢٤ بڕیاریدا جەژنی نەورۆز کە رێککەوتی ٢١ی مارتە، لە هەموو ساڵێکدا بە جەژنی فەرمیی کورد دابنرێ‌و ئەو رۆژە لە عێراقدا بکرێتە پشووی فەرمیی[٥٠] لە بڕیارێکی دیکەشدا نووسینگەیەکیان بەناوی (نووسینگەی کاروباری باکوور/ مکتب شؤون الشمال) دامەزراند کە سەر بە (ئەنجوومەنی سەرکردایەتی شۆڕش)ی عێراق بوو[٥١]

هەروەها لەو قۆناغەدا بەعسییەکان دەیانویست ناکۆکییەکانی ناو بزووتنەوەی کورد قووڵتر بکەنەوە. بۆ ئەو مەبەستەش کەوتنە هاندان‌و پشگیریکردنی باڵی(برایم ئەحمەد–جەلال تاڵەبانی/"م.س") دژی شۆڕشی کوردستان. بەمەش شەڕی خۆکوژی کورد گەیشتە ئەوپەڕی سەختی‌و تەنانەت وای لێهات کە ئەو باڵە چارەنووسی خۆیان بە (بەعس) گرێدا بوو، خۆشیان بە هاوپەیمانی ژیان‌و مردنی ئەوان دەزانی. لە بەرانبەر ئەوەشدا بەعس رێگەی پێدابوون کە رۆژنامەی (النور– رووناکی)[*] بە زمانی عەرەبی دەربکەن، ئەمە جگە لەوەی هەندێ پایەی بەڕێوەبەرایەتیشی پێسپاردبوون[٥٢] ١٠ی تشرینی دووەمی ١٩٦٨ لەئاکامی سەرنەگرتنی گفتوگۆی نێوان شۆڕشی کوردو حوکمەتی

---

(٥٠) "الوقائع العراقية"، ع (١٦٣١)، ١٩٦٨/٩/٣٠.

(٥١) د.سعد ناجي جواد، س پ، ل١٥٣.

(*) (النور–رووناکی): رۆژنامەیەکی سیاسیی رۆژانە بوو لە بەغدا دەردەچوو. خاوەن ئیمتیازی حیلمی عەلی شەریف و سەرنووسەرەکەشی عومەر مستەفا بوو ١٢ی تشرینی یەکەمی ١٩٦٨ ژمارەی یەکەمی لێ بڵاوکرایەوە هەروەها دوو ژمارەی بەشێوەی گۆڤارو بە زمانی کوردی بڵاوکرایەوە ، بڕوانە جبار جباری، س پ، ل٦٧

(٥٢) نەوشیروان مستەفا ئەمین، پەنجەکان یەکتری ئەشکێنن، ل٩٧.

عێراق، شەڕی نێوانیان دەستی پێکردەوە[٥٣] ڕۆژی دواتریش ڕۆژنامەی (التآخي–برايى) کە زمانحاڵی (پ.د.ك) بوو لەلایەن بەعسەوە داخرا[٥٤]

مستەفا بارزانی بڕیاریدا هێرش بکاتە سەر بەرژەوەندییە حوکومییەکان، ئەوەبوو لە کانوونی یەکەمی١٩٦٨دا لەلایەن هێزی پێشمەرگەوە هێرش کرایە سەر هێڵی شەمەندەفەری بەغدا– کەرکووك[٥٥] دوای ئەوەش دەستیان بە ڕێکخستنی پلانێکی هێرش بردن کرد بۆ سەر دەزگا نەوتیەکانی کەرکووك، شەوی ٢/١ی مارتی ١٩٦٩ پلانەکە جێبەجێکراو زیانێکی گەورەی ماددیو مەعنەوییان لە حوکمەتی عێراقدا کە بۆ ماوەیەکی درێژ بووە مایەی سەرنج ڕاکێشانی میدیاکانی جیهانیی[٥٦] لە هەمان کاتیشدا مستەفا بارزانی هەڕەشەی ئەوەی کرد کە ئیدی زیاتر پەلاماری دامودەزگا نەوتیەکان دەدرێ بۆ زیان پێگەیاندنی ئابووری عێراق[٥٧]

پێکدادانی نێوان هێزەکانی حوکمەتی عێراقو شۆڕشگێڕانی کوردستان بەردەوام بوو، لە زۆربەی بەرەکانی شەڕیشدا هێزەکانی حوکمەت دووچاری شکستی گەورە هاتن. هەندێ جاریش لە تۆڵەی ئەو شکستانەیان پەنایان دەبردە بەر کاولکردنی گوندەکانی کوردستانو کوشتنی خەڵکی بێلایەن بە پیاوو ژنو منداڵەوە، وەك ئەوەی لە گوندی دەکان لە ناوچەی شێخان ٢٨ی ئابی١٩٦٩ و لە

(٥٣) علی سنجاری، س پ، ل٧٨.

(٥٤) جبار جباری، س پ، ل٦٤.

(٥٥) د.سعد ناجي جواد، س پ، ل١٥٥.

(٥٦) بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: مسعود البارزاني، البارزاني والحركة التحررية الكردية، ج٣، ص٢٠٩– ٢١١.

(٥٧) ڕونیە لومبورن، کورد گەلێکی بێ وڵات، و: ئەمجەد شاکەلی، ستوکهوڵم، ١٩٩٤، ل٥٦–٥٧.

صوریا له ناوچەی زاخۆ له ١٦ی ئەیلولدا ئەنجامیاندا[٥٨] ئەو تاوانەش بووە هۆی سەرنجڕاکێشانی میدیاکانی جیهانیی[٥٩]

دوابەدوای ئەو تاوانانەی حوکمەت، دەربارەی ئەو مەینەتیانەی کورد تووشی هاتبوون، له ئەنجامی ئەو شەڕانەی کە ڕژێمە یەك لە دوای یەکەکانی عێراق لە دژی شۆڕشی ڕزگاریخوازی کورد هەڵیان گیرساندبوو، (پ.د.ك) تشرینی یەکەمی ١٩٦٩ ڕاپۆرتێکی بۆ ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان نارد، هاوکاتیش (پ.د.ك) داوای یارمەتی دەرەکیی کرد، بەڵام لەو هەوڵە دیبلۆماسییانەیدا سەرنەکەوتو کەس بەدەنگییەوە نەهات[٦٠]

حوکمەتی عێراق سەرباری هەموو هەوڵو کردەوە شەڕانگێزەکانی، نەك هەرنەیتوانی لە هەوڵە سەربازییەکانی بۆ دامرکاندنەوەی شۆڕشی کورد سەرکەوتن بەدەست بهێنێ، بەڵکو لە بەرەکانی شەڕیشدا زیانی ماددیو مرۆییشی بەرکەوت، بۆیە بەناچاری بیری لە ڕێگەچارەی ئاشتیانەی کێشەی کورد کردەوە[٦١] بۆ ئەوەش لەگەڵ سەرکردایەتی شۆڕشی کوردستان سەرەتا دەستی بە گفتوگۆی نافەرمیی کرد، کە دواتر شێوەی فەرمیی وەرگرتو ئەنجامەکەی ڕاگەیاندنی بەیاننامەی ١١ی مارتی١٩٧٠ بوو لەلایەن (ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش)ی عێراق.

---

(٥٨) بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: مسعود البارزاني، البارزاني والحركة التحررية الكردية، ج٣، ص٢١٥- ٢١٧؛ د.گوینتەر دێشنەر، کورد گەلی لە خشتەبراوی غەدرلێکراو، و: حەمە کەریم عارف، چ٢، چاپخانەی وەزارەتی ڕۆشنبیری- هەولێر، ١٩٩٩، ل٢١٣- ٢١٤

(٥٩) بڕوانە: باوەکر عوبێد ساڵح، کاریگەری شۆڕشی ئەیلول لەسەر پێشخستنی ڕۆژنامەوانیی کوردیی لە کوردستانی خوارووداا ١٩٦١-١٩٧٥، نامەی ماستەری بڵاو نەکراوە پێشکەش بە ئەنجوومەنی کۆلێژی ئاداب/زانکۆی سەلاحەددین-هەولێر کراوە، ٢٠٠٢، ل٤٩.

(٦٠) ڕونیە لومبورن، س پ، ل٦٠

(٦١) ادغار اوبلانس، النضال التحرری لكردستان العراق، ت: مديرية الاستخبارات العسكرية العامة (العراقي)، (بغداد، د.ت)، ص١٥٩.

# بەشى يەكەم

## بەياننامەى ١١ى مارت و دەرهاوێشتەكانى

## تەوەری یەکەم:

# دەسپێکردنی گفتوگۆ

دەسەڵاتدارانی عێراق، دوای ئەوەی تێگەیشتن ناتوانن بە بەکارهێنانی هێز شۆڕشی کوردستان لەناو بەرن، بە مەبەستی ئاگربەستو دەسپێکردنی گفتوگۆ، پەنایان بردە بەر پێوەندیکردن بەسەرکردایەتی شۆڕشی کوردستان.

گفتوگۆ بە دوو قۆناغ دەستیپێکرد. قۆناغی یەکەم بەشێوەی ناڕاستەوخۆ لە کۆتایی مانگی ئاب و سەرەتای ئەیلول دەستیپێکردو هەردوو مانگی تشرینی یەکەمو دووەمی ساڵی ١٩٦٩ی خایاند[٦٢]. لە مانگی ئەیلولی ئەو ساڵەدا بەعسییەکان لەڕێگەی ڕێکخراوی یەکێتی قوتابیانی کوردستانەوە[*] چەند پێشنیارێکیان سەبارەت بە چارەسەرکردنی کێشەی کورد، بۆ سەرکردایەتی شۆڕشی کوردستان نارد. گرنگترینیان نیشاندانی ئامادەبوونیان بوو بە پابەندبوون بە بەیاننامەی ٢٩ی حوزەیرانی ١٩٦٦، بەڵام سەرکردایەتی شۆڕشی کوردستان دوای کۆبوونەوە ئەو پێشنیارانەیان ڕەتکردەوە، چونکە لەلایەکەوە لەو پێشنیارانەدا باس لە دەسپێکردنەوەی گفتوگۆ نەکرابوو، لەلایەکی دیکەشەوە

---

(٦٢) دیدار لەگەڵ دکتۆر مەحمود عوسمان، هەولێر، ٢٠٠٢/٨/١٦، مەحمود عوسمان ئەندامی مەکتەبی سیاسیی پارتی دیموکراتی کوردستان بووەو سەرۆکی شاندی کورد بوو لە گفتوگۆکانی ساڵی ١٩٧٠ لەگەڵ حوکمەتی عێراق.

(*) یەکێتی قوتابیانی کوردستان لە ١٨ی شوباتی ساڵی١٩٥٢ دامەزراوەو خوالێخۆش بوو ئەحمەد عەبدوڵلا یەکەم سەرۆکی ئەو ڕێکخراوە بووە. بڕوانە: ساسان عەونی، یەکێتی قوتابیانی کوردستان. چەند لایەنێکی تێکۆشان و مێژوو،١٩٥٢–١٩٩٨، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ١٩٩٨،ل١١.

پێیان وابوو کە سەردەمەکە گۆڕانی بەسەرداهاتووەو بەیاننامەی ٢٩ی حوزەیران بۆ سەردەمی ئێستایان گونجاو نیە[٦٣]

لە ٩ی تشرینی یەکەمی ١٩٦٩ (ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش)ی عێراق لە بەیاننامەیەکدا هەندێ لە مافە رۆشنبیرییەکانی گەلی کوردی سەلماند[٦٤] کە ئەوەشی زیاتر بۆ ئەوەبوو (نیازپاکیی!) خۆی نیشان بدات و بۆ دەسپێکردنی گفتوگۆی راستەوخۆ لەگەڵ شۆڕشی رزگاریخوازی کوردستان زەمینە خۆش بکات.

لە تشرینی یەکەمی هەمان ساڵیشدا، دەسەڵاتدارانی عێراق لەرێگەی (عەزیز شەریف)[*] ەوە پێوەندییان بەشۆڕشی کوردستانەوە کرد، بۆئەوەی بۆ

---

(٦٣) بۆ زانیاریی زیاتر دەربارەی ئەو بابەت و پێشنیارانە بڕوانە: مسعود البارزاني، البارزاني والحركة التحررية الكردية، ج٣، ص٢٢٥.

(٦٤) بۆ زانیاریی زیاتر لەسەر ئەو بەیاننامەیە بڕوانە: الجمهورية العراقية، القرارات العامة لمجلس قيادة الثورة ١٩٦٨–١٩٧٧، المجلد الاول، مط العاني، بغداد، ١٩٧٩، ص٥٩٧–٥٩٨.

(*) عەزیز شەریف: ساڵی ١٩٠٩ لە شارۆچکەی (عانە)ی سەر بە پارێزگای رومادی لە دایك بووە، ساڵی ١٩٣٦ بۆتە ئەندامی پەرلەمانی عێراق. لە کەسایەتییە یەکەمەکان بووە کە پێوەندیی بە حیزبی شیوعی عێراقو رێکخراوی ئیسلاح کردووە، لە سییەکانیشدا کۆلێژی مافی تەواوکردووەو بووە بە حاکمی بەسرەو دواتریش بووە بە ئەندامی دادگای تێهەڵچوونەوە. ساڵی ١٩٤٦ پارتێکی بەنێوی (حیزب ئەلشەعب) دامەزراندووە، ساڵی ١٩٦٠ خەڵاتی لینینی لەپای تێکۆشانی بۆ بەرقەرار کردنی ئاشتی پێدراوە، لە ساڵانی (١٩٦٣–١٩٧٠) لەنێو ریزەکانی پێشمەرگەی کوردستان بۆ چەند ماوەیەکی درێژ ماوەتەوە. لەکۆتاییەکانی ساڵی ١٩٦٩ بۆتە وەزیری داد. یەکێك لەو کەسایەتییانە بووە کە هەوڵی هێنانە ئارای بەیاننامەی ١١ی مارتیان داوە، ساڵی ١٩٩٠ کۆچی دوایی کردووە. بڕوانە: عزيز شريف، المسألة الكردية في العراق، ط٥، دار ارارات، ٢٠٠٠، ص٧–١٠.

دەسپێکردنی گفتوگۆ بیروڕایان بزانن. دەرئەنجامیش مستەفا بارزانی لەگەڵ مەکتەبی سیاسیی و مەکتەبی تەنفیزی(پ.د.ك) کۆبۆوە، لەو کۆبوونەوەیەش لەسەر دەسپێکردنی گفتوگۆ رەزامەندییان دەربڕی[٦٥].

لە ٢٥ی تشرینی دووەمیشدا، (ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش)ی عێراق لە بڕیارێکدا، بۆ چاودێری جێبەجێکردنی هەموو ئەو بڕیارانەی لەلایەن ئەنجومەنی ناوبراوەوە سەبارەت بە کێشەی کورد دەرچووبوون، لیژنەیەکی لە هەمان ئەنجومەن بە سەرۆکایەتی (سالح مەهدی عەمماش) و ئەندامێتی (سەعدوون غێدان و مورتەزا ئەلحەدیسیو عەبدوڵلا ئەلسەللوم) پێکهێنا بوو[٦٦]

بەر لەدەسپێکردنی گفتوگۆی راستەوخۆی حوکمەتی عێراق و شۆڕشی کوردستان، یەکێتی سۆڤیەت لەرێگەی (یەڤگینی بریماکوف)[*] ەوە لە کانوونی یەکەمی ١٩٦٩، بۆ چارەسەرکردنی کێشەی کورد، پەیامێکیان ئاراستەی دەسەڵاتدارانی بەغدا کرد[٦٧] هەروەها بۆ گەیاندنی هەمان مەبەست و خۆشکردنی زەمینەی گفتوگۆ لەنێوان حوکمەتی عێراقو سەرکردایەتی شۆڕشی کوردستان، ناوبراویان نارده لای مستەفا بارزانی[٦٨]

دوای ئەوە پێوەندیی نێوان فەرمانڕەوایانی بەعس و بزووتنەوەی رزگاریخوازی کوردستان پێی نایە قۆناغێکی نوێو قۆناغی دووەمی گفتوگۆی

---

(٦٥) بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: مسعود البارزاني، البارزاني والحركة التحررية الكردية، ج٣، ص٢٢٦.

(٦٦) بڕوانە: الوقائع العراقية، ع (١٨٠٧)، ١٩٦٩/١٢/٢.

(*) یەڤگینی پریماکوف: پەیامنێری رۆژنامەی (پراڤدا)ی سۆڤیەتی و پیاوی دەزگای هەواڵگری سەربازی ئەو وڵاتە بوو.

(٦٧) مسعود البارزاني، البارزاني والحركة التحررية الكردية، ج٣، ص٢٢٦–٢٢٧.

(٦٨) دیدار لەگەڵ دکتۆر مەحمود عوسمان، هەولێر، ٢٠٠٢/٨/١٦

نێوانیان کە قۆناغی راستەوخۆی گفتوگۆ بوو لە کانوونی یەکەمی ١٩٦٩ دەستیپێکرد، کە تا مارتی ساڵی ١٩٧٠ی خایاند و بەیاننامەی ١١ی مارتی لێکەوتەوە.

هەر لەمانگی کانونی یەکەمی ١٩٦٩ دا، فوئاد عارف(*) لەسەر داوای (سەدام حسێن)ی جێگری سەرۆکی (ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش)ی عێراق، سەردانی (ئەحمەد حەسەن بەکر)ی سەرۆك كۆمارو ناوبراوی کردو داوایان لێکرد خواستی ئەوان بۆ چارەسەرکردنی کێشەی کورد لەسەر بنەمای ئۆتۆنۆمی بە مستەفا بارزانی رابەری شۆڕشی کوردستان بگەیەنێت و بۆ زەمینەخۆشکردنیش سەرکردایەتی شۆڕشی کورد پێوەندییە دەرەکییەکانی بپچڕێنێت. (فوئادعارف)یش بۆ دروستکردنی باوەڕو متمانە لەنێوان حوکمەت و شۆڕشی رزگاریخوازی کوردستان بە پێویستی زانی سەرکردایەتی حیزبی بەعس نوێنەرێکی خۆیانی لەگەڵ بنێرن، ئەوانیش (سەمیر عەزیز ئەلنەجم)(**) یان دەسنیشانکرد کە لەگەڵیدا بچێتە لای مستەفا بارزانی(٦٩)

---

(*) فوئاد عارف: ساڵی ١٩١٣ لە شارۆچکەی عەمارە لە باشوری عێراق لەدایك بووەو لەشاری سلێمانی گەورە بووە ، لەساڵی ١٩٣٤کۆلێژی سەربازی لەبەغدا تەواوکردووە .لەساڵی ١٩٥٨ بۆتە پارێزگاری شاری کەربەلا. پاشان بۆتە وەزیری دەوڵەت بۆ کاروباری ئایینی، دوای ئەوەش پۆستی چەندین وەزارەتی دیکەی وەرگرتووە، ساڵی ١٩٦٧ بۆماوەی چەند مانگێك بۆتە جێگری سەرۆك وەزیران، لەماوەی گفتوگۆکانی نێوان رژێمی عێراق و سەرکردایەتی شۆڕشی کوردستانیش لەساڵی ١٩٦٩و١٩٧٠ وەك کەسایەتیەکی بێلایەن رۆڵی نێوەندکاری گێڕاوە. دیدار لەگەڵ فوئاد عارف، بەغدا، ٢٠٠٣/٢/٦.

(**) سەمیر عەزیز ئەلنەجم: ئەندامی سەرکرادیەتی هەرێمایەتی حیزبی بەعسی عەرەبی سۆشیالیست وئەندامی (ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش)ی عێراق بوو.

(٦٩) دیدار لەگەڵ فوئادعارف، بەغدا، ٢٠٠٣/٢/٦.

بۆ ئەو مەبەستە، لە١٨ی کانونی یەکەمی ١٩٦٩، بەعسییەکان بۆ ئەنجامدانی یەکەمین پێوەندیی راستەوخۆ لەگەڵ مستەفا بارزانیو سەرکردایەتی (پ.د.ک)، (سەمیر عەزیز ئەلنەجم)ی نوێنەری خۆیان لەگەڵ فوئاد عارفو عەزیز شەریف ناردە کوردستان[٧٠] شاندەکە رۆژێك لە کوردستان مایەوەو ئامادەیی حوکمەتیان بۆ رێککەوتن نیشاندا[٧١] هەر لەوێدا فوئاد عارف پێشنیاری کرد، سەرکردایەتی شۆرشی کوردستان بۆ درێژەپێدانی گفتوگۆ نوێنەری خۆی لەگەڵ شاندەکە بۆ بەغدا بنێرێت، ئەوانیش لەو پێناوەدا (دارا تۆفیق)[*] یان بە نوێنەرایەتی رەوانە کرد[٧٢]

شایانی باسە، بەعسییەکان پێش ئەوەی نوێنەری خۆیان بۆ لای مستەفا بارزانی بنێرن، شاندێکیان بۆ راوەگرتنی ژمارەیەکی زۆری رۆشنبیروکەسایەتییە گەورەکان سەبارەت بە چارەسەرکردنی کێشەی کورد، سەردانی شارو شارۆچکەکانی کوردستانی کردبوو. لەو سەردانەشدا بۆیان دەرکەوتبوو کە بەبێ گفتوگۆکردن لەگەڵ سەرکردایەتی شۆرشی کوردستان کێشەکە چارەسەر نابێ[٧٣]

---

(٧٠) مسعود البارزاني، البارزاني والحركة التحررية الكردية، ج٣، ص٢٢٧.

(٧١) د.سعد ناجي جواد، س پ، ل١٦٢

(*) دارا تۆفیق: ساڵی ١٩٣٢ لە سلێمانی لەدایك بووەو ساڵی ١٩٥٧ لە ئینگلتەرا کۆلێژی ئەندازیاری– بەشی مەدەنی تەواو کردووە، دۆستێکی نزیکی مستەفا بارزانی بووەو لە کۆنگرەی هەشتەمی (پ.د.ك)یشدا کە لە ساڵی ١٩٧٠ بەسترا، بۆتە ئەندامی کۆمیتەی ناوەندیی، دوای ئەوەش لە راگەیاندنی پارتی رۆڵێکی گرنگی گێراوەو لە رۆژنامەو گۆڤاری برایەتی کاری کردووەو ماوەیەکیش سەرنووسەری رۆژنامەی (التآخي) بووە، لە ١٩٨٠/١١/٥ شوێن بزر بووە.

(٧٢) دیدار لەگەڵ فوئاد عارف، بەغدا، ٢٠٠٣/١٢/٦.

(٧٣) بۆزانیاریی زیاتر بڕوانە: مسعود البارزاني، البارزاني والحركة التحررية الكردية، ج٣، ص٢٢٧.

لەبەغدا (دارا تۆفیق)ی نوێنەری شۆڕشی کوردستان، خواستی چارەسەرکردنی کێشەی کوردی لەسەر بنەمای ناسەنتەریی کارگێریی (اللامركزية الادارية) بۆ بەرپرسانی باڵای حوکمەتی عێراق خستەڕوو[٧٤]، بەڵام سەدام حسێن لەبەرانبەر ئەو داوایە گوتبووی: "چ شتێکە واتان لێ دەکات داوای ئۆتۆنۆمی نەکەن ؟" (دارا تۆفیق)یش لەوەڵامدا گوتبووی: "ئێوە ئامادەن بەبێ ئیستیفزاز بوون، گوێتان لەو وشەیە (مەبەست لە ئۆتۆنۆمییە) بێت "[٧٥] هۆی داوانەکردنی ئۆتۆنۆمیش لەلایەن سەرکردایەتی شۆڕشی رزگاریخوازی کوردستان، وەك داواکارییەکی سیاسیی لەسەرەتای گفتوگۆکاندا، هەروەك موحسین دزەیی[*]

---

(٧٤) دیدار لەگەڵ دکتۆر موکەڕەم تاڵەبانی، بەغدا ،٢٠٠٣/١٢/٧ د. موکەڕەم تاڵەبانی: ساڵی ١٩٢٣ لە شاری کەرکوك لە دایك بووە، لە ساڵی ١٩٤٥ پەیوەندیی بەرێکخستنەکانی (ح.ش.ع) کردووە. ساڵی ١٩٤٦ لە بەغدا کۆلیژی مافی تەواو کردووە، لە ساڵی ١٩٧٠ بۆتە ئەندامی کۆمیتەی ناوەندیی (ح.ش.ع)، ساڵی ١٩٧٣ لە مۆسکۆی پایتەختی سۆڤیەت بڕوانامەی دکتۆرای لە بواری زانستە ئابوورییەکان وەرگرتووە. دوای پێکهێنانی بەرەی نیشتمانیی پێشکەوتنخوازی نێوان (ح.ش.ع)و بەعس پۆستی وەزارەتی ئاودێری لە حوکمەتی عێراق پێسپێردراوە، پاشان بەهۆی ئاگادارنەکردنەوەی بۆ ئامادەبوون لە کۆنگرەی چوارەمی (ح.ش.ع) لە رێکخستنی حیزبی دابڕاوە، دوابەدوای ئەوە وەك کەسایەتییەکی بێلایەن لەزۆربەی گفتوگۆ ئاشکراو نهێنییەکانی نێوان فەرمانڕەوایانی بەغداو پارتو هێزە سیاسییەکانی کوردستان رۆڵی نێوەندکاری گێڕاوە، دیدار لەگەڵ دکتۆر موکەڕەم تاڵەبانی، بەغدا، ٢٠٠٣/١٢/٧.

(٧٥) مسعود البارزاني، البارزاني والحركة التحررية الكردية، ج٣، ص٢٢٧–٢٢٨.

(*) موحسین دزەیی: ساڵی ١٩٣٢ لە دێی دووگردکانی سەر بە پارێزگای هەولێر لە دایك بووە. ساڵی ١٩٥٥ کۆلیژی مافی لە بەغدا تەواو کردووە، ساڵی ١٩٦٣ بۆتە پێشمەرگەی شۆڕشی ئەیلول و هەرلەهەمان ساڵ بۆتە ئەندامی ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش و ~~لیژنەی مەکتەبی~~ تەنفیزی (پ.د.ك). ساڵی ١٩٦٦ بۆتە ئەندامی ئەنجومەنی ئاشتی

جەختی لەسەردەکات، لەبەرئەوەبوو کە بڕوا نەدەکرا حیزبی بەعس بەو داواکارییە رازی بێت[٧٦] ئیتر لەوکاتەوە، لە گفتوگۆکانیدا لەگەڵ شاندی فەرمیی حوکمەتی عێراق، ئۆتۆنۆمی بووە داواکاری سەرەکی سەرکردایەتی شۆڕشی کوردستان.

هەر لەو ماوەیەدا بەعسییەکان لە ژمارە (٤٠٤)ی رۆژنامەی (الثورة) لەرێکەوتی ٢٢ی کانونی یەکەمی ١٩٦٩ زنجیرە وتارێکیان بەناونیشانی (کیف السبیل الی حل المسألة الکردیة/ چۆن بەرەو چارەسەری تۆزی کورد بچین؟) بڵاوکردەوە. لەو زنجیرە وتارەدا هەرچەندە دانیان بەوەدا نابوو کە پرسی کورد پرسێکی نەتەوەییە، بەڵام هەنگاوەکانی شۆڕشی ئەیلولو رابەرەکەی بەرانبەر حوکمەتە لەدواییەکەکانی عێراقو بەتایبەتی بەعسیان، بەهەڵەو دوژمنکارانە لەقەڵەمدا[٧٧].

دارا تۆفیق دوای چەند رۆژێك مانەوەی لە کۆشکی کۆماری لەبەغدا، گەڕایەوە کوردستانو بەسەرکردایەتی سیاسیی کوردی راگەیاند کە فەرمانڕەوایانی عێراق بەراستی دەیانەوێ گفتوگۆ بکەنو ئۆتۆنۆمی بدەنە کورد[٧٨] دوابەدوای ئەوەش لە ٣١ی کانوونی یەکەمی ١٩٦٩ شاندێکی گەورەی حیزبیو حوکومی عێراق

---

نێوان حوکمەتی عێراق و شۆڕشی کوردستان، ساڵی ١٩٦٨ دوای کودەتای بەعس، وەك ئەندامێکی (پ.د.ك) پۆستی وەزارەتی کاروباری ژووروی لە حوکمەتی عێراق پێسپێردراوە، ئێستاش نوێنەری تایبەتی سەرۆکی (پ.د.ك)ە لە کوردستان. دیدار لەگەڵ موحسین دزەیی، هاوینەهەواری سەلاحەددین، ٢٠٠٣/١١/٩.

(٧٦) دیدار لەگەڵ موحسین دزەیی، هاوینەهەواری سەلاحەددین، ٢٠٠٣/١١/٩.

(٧٧) بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: منشورات الثورة، کیف السبیل الی حل المسألة الکردیة، دار الثورة للنشر والطباعة، بغداد، د.ت، ص٧–٢٧.

(٧٨) دیدار لەگەڵ دکتۆر مەحمود عوسمان، هەولێر، ٢٠٠٣/٨/١٦.

بەسەرۆکایەتی حەماد شەهاب(*) و ئەندامێتی هەریەك لە (عەبدولخالق سامەرایی‌و مورتەزا ئەلحەدیسی‌و تاریق عەزیزو سەمیر عەزیز ئەلنەجم(**) و (محەمەد عەلی سەعید)(***) و هاوڕێیەتی (عەزیز شەریف‌و فوئاد عارف)(****)، سەردانی سەرکردایەتی شۆڕشی کوردستانیان کردو لەگەڵ رابەری شۆڕش‌و حەبیب محەمەد کەریم(*****)و (دکتۆر مەحمود عوسمان و ساڵح یوسفی‌و نووری شاوەیس‌و عەلی عەبدوڵڵاو محەمەد مەحمود عەبدولڕەحمان(سامی)و ئیدریس بارزانی)(******) و دارا تۆفیق، کۆبوونەوەو گفتوگۆیان دەسپێکرد(٧٩) شاندی دەسەڵاتدارانی عێراق، نامەی سەرۆك کۆماریان دایە مستەفا بارزانی، ئەویش لەرێگای شاندەکەوە بەنامەیەك وەڵامی سەرۆك کۆماری دایەوە(٨٠)

لە ٤ی کانونی دووەمی ١٩٧٠ شدا سەرکردایەتی شۆڕشی کوردستان بۆ ئامادەکردنی پرۆگرامی گفتوگۆو رێکخستنی شاندێك بۆ بەغدا، کۆبوونەوەیەکی

---

(*) حەماد شەهاب: سەرۆکی ئەرکانی سوپای عێراق‌و ئەندامی (ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش)ی عێراق بوو.

(**) ئەوانە هەر چواریان ئەندامی سەرکردایەتی هەرێمایەتی حیزبی بەعس‌و ئەندامی (ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش)ی عێراق بوون.

(***) محەمەد عەلی سەعید: بەڕێوەبەری حەرەکات بوو لە وەزارەتی بەرگری عێراق.

(****) ئەو دووانە وەکو دوو کەسی بێلایەن لەسەر داوای فەرمانڕەوایانی عێراق یاوەری شاندەکە بوون بۆ گفتوگۆ. دیدار لەگەڵ فوئاد عارف، بەغدا، ٢٠٠٣/١٢/٦

(*****) حەبیب محەمەد کەریم: سکرتێری پارتی دیموکراتی کوردستان بوو.

(******) ئەوانە ئەندامی مەکتەبی سیاسیی و مەکتەبی تەنفیزی (پ.د.ك) بوون.

(٧٩) بۆ زانیاریی زیاتر دەربارەی گفتوگۆکانی ئەو کۆبوونەوەیە بڕوانە: مسعود البارزاني، البارزاني والحركة التحررية الكردية، ج٣، ص٢٣٠-٢٣٤.

(٨٠) بۆ زانیاریی زیاتر دەربارەی هەردوو نامەکە بڕوانە: هـ س، ل٢٣١-٢٣٢

بەست و لە ٧ی هەمان مانگدا، بۆ گفتوگۆکردن لەگەڵ رژێمی فەرمانڕەوای عێـراق، شاندێکیان بەسەرۆکایەتی دکتۆر مەحمود عوسمان‌و ئەندامێتی هەریەك لە (نووری سدیق شاوەیس و ساڵح یوسفی‌و محەمەد مەحمود عەبدولڕەحمان/سـامی و نـافیز جەلال[*] و موحسین دزەیی‌و دارا تۆفیـق ) نـاردە بەغـدا بـۆ گفتوگـۆکردن لەگـەڵ رژێمی بەعس[٨١]

بەو شێوەیە گفتوگۆ درێـژەی کێـشاو سـەرەڕای بـیروڕای جیـاوازی هـەردوولا لەسەر هەندێ پرسی گـرنگ‌و چارەنووسـساز، بەتایبـەتیش دیـاریکردنی سـنووری ناوچـەی ئۆتۆنـۆمی، جگـە لـە دەسـتێوەردانی هەنـدێ لایـەنی هـەرێمیی وەك ئێـران[**]، شـەوی١١/١٠ ی مـارتی سـاڵی١٩٧٠ هـەردوولا لەسـەر راگەیانـدنی بەیاننامەیەك بەئەنجام گەیـشتن و رۆژی دواتـریش لـە بەغـدا بـەناوی (ئەنجومـەنی سەرکردایەتی شۆڕش )ی عێراق راگەیەندرا[٨٢]

دەبـێ ئـەوەش بگوترێـت، کـە هەرچـەندە گفتوگۆکـان بـە تـەنها لـەنێوان (پ.د.ك)و حیزبی بەعسدا بوون، بەڵام پارتی هەوڵیدا هێـزو لایەنـە سیاسـییەکانی دیکەش، وەك حیزبی شیوعی عێراق، تیایاندا بەشدار بن، کەچی بەعس بەوە رازی

(*) نافیز جەلال: ئەندامی مەکتەبی تـەنفیزی (پ.د.ك) بـوو دوای راگەیانـدنی بەیاننامـەی ١١ی مارتی ساڵی ١٩٧٠ش بووە وەزیری کشتوکاڵ لە حوکمەتی عێراقدا، کە یەکێك بـوو لەو پێنج کەسـەی لەلایـەن سـەرکردایەتی شۆڕشـی کوردسـتانەوە دەسنیـشان کـرا، بـۆ وەرگرتنـی پۆسـتی وەزارەت، لـە کارەکەیـدا بـەردەوام بـوو تـاکو لـە ١٩٧٢/٧/١٠ بـە کارەساتی ئۆتۆمۆبیل کۆچی دوایی کرد.

(٨١) مسعود البارزاني، البارزاني والحركة التحررية الكردية، ج٣،ص٢٣٤.

(**) ئەم بابەتە لە تەوەری چوارەمی بەشی دووەمی باسەکەمان زیاتر لێی دواوین.

(٨٢) بۆ زانیاریی زیاتر دەربارەی ئەم بابەتانـە بڕوانـە: مـسعود البـارزاني، البـارزاني والحركـة التحررية الكردية، ج٣، ص٢٣٤–٢٤٥.

نەبوو[٨٣] لەبەرانبەریشدا، پارتی دیموکراتی کوردستان سووربوونی خۆی بۆ ئەو مەبەستە دووپاتکردەوە. ئیدی لەو کاتەی کە خەریك بوو گفتوگۆکان بەرەو تێکچوون بچن، حیزبی شیوعی عێراق وای بەچاکزانی بەشدارنەبوونی ئەوان نەبێتە هۆکارێك بۆ پەکخستنی گفتوگۆکان، بۆیە بە پارتی دیموکراتی کوردستانی راگەیاند کە بەبێ ئەو درێژە بە گفتوگۆکان بدات. لەسەر ئەو بنەمایەش پرۆسەکە درێژەی پێدرا[٨٤]

(٨٣) محسن دزه یی، احداث عاصرتها ١٩٦١–١٩٧٥، ج٢،ط١،مط وزارة التربية، اربيل،٢٠٠٢، ص١٩٤.

(٨٤) دیدار لەگەل کەریم ئەحمەد، هەولێر،٢٢/٧/٢٠٠٣. کەریم ئەحمەد: ساڵی ١٩٢٢ لە شاری هەولێر لە دایك بووە، ساڵی ١٩٤٦ پەیمانگای پەروەردەی وەرزشی لە بەغدا تەواو کردووە، ساڵی ١٩٤٤ پێوەندیی بە رێکخستنەکانی (ح.ش.ع) کردووە. ساڵی ١٩٥١ بۆتە ئەندامی کۆمیتەی ناوەندیی و ساڵی ١٩٥٣یش بۆتە سکرتێری گشتی حیزب، ساڵی ١٩٥٥ تا ١٩٥٧ لە لایەن رژێمی ئەوسای عێراق خراوەتە زیندانەوە، دوای ئازاد بوونی گەڕاوەتەوە ناو حیزب و وەك ئەندامی مەکتەبی سیاسی کەوتۆتەوە کار. هاوکات لەگەل دامەزراندنی حیزبی شیوعی کوردستان لە ساڵی ١٩٩٤، بۆتە سکرتێری حیزب. دیدار لەگەل کەریم ئەحمەد، هەولێر ٢٢/٧/٢٠٠٣.

## تەوەری دووەم:

# هۆکارەکانی گفتوگۆ

شۆڕشی ئەیلول کە لە ساڵی ١٩٦١ هەڵگیرسا، هەموو رژێمە لەدوابیەکەکانی عێراق، لەرێگەی داپلۆسینو سەرکوتکردن، یان پەنابردنە بەر ئاگربەستو رێککەوتنی کاتیی لەکاتی کەمتوانایی سەربازیی خۆیان و کۆششیان بۆ پەردەپۆشکردنی راستییەکان، جۆرەها شێوازیان بۆ لاوازکردنو دامرکاندنەوەی گرتەبەر.

لە تەمووزی ١٩٦٨یش، کاتێک بەعسییەکان دیسان دەسەڵاتیان گرتەوەدەست، بۆ لاوازکردنی شۆرشی کوردستان لە گرتنەبەری هیچ تاکتیکو پلانێک سڵیان نەکردەوە. بەڵام نەک هەر سەرنەکەوتن، بەڵکو ئەنجامەکەی پێچەوانە شکایەوەو بەهۆی شەڕو بەرگریکردنی کوردەوە خەریک بوو دەسەڵاتەکەیان بەرەو هەڵدێر دەچوو. بۆیە لە کۆتایی ١٩٦٩و سەرەتای ١٩٧٠ بەناچاریی، لەگەڵ سەرکردایەتی شۆڕشی کورد پەنایان بردە بەر گفتوگۆ. دەشتوانرێ هۆکارەکانی گفتوگۆکە لە دوو بواردا کۆبکەینەوە:

## هۆکارە ناوخۆییەکان:

گەلێك هۆکاری ناوخۆی عێراقو کوردستان هەبوون کە سەرکردایەتیی شۆڕشی کوردستانو حوکمەتی بەعسییان لەسەر مێزی گفتوگۆ کۆکردەوە. گرنگترینیان بریتین لە:

١- نابووتبوونی خەزێنەی دەوڵەت لە ئەنجامی ئەو هێرشە سوپاییە چڕە سەرنەکەوتووانەی لەساڵی ١٩٦٩دا دژی شۆڕشی کورد ئەنجام دران[٨٥] لەبەرئەوە دەسەڵاتی بەعس، بەنیازی خۆڕێکخستن و بەهێزکردنەوەو سوود وەرگرتن لە کات، بەناچاریی پەنای بردەبەر گفتوگۆو لەگەڵ سەرکردلیەتیی بزاڤی کورد رێککەوتن.

جێی ئاماژەپێدانیشە بەردەوامیی ئەو بارودۆخە ناهەموارەی کە حوکمەتی بەعس لەئەنجامی هەڵمەتە شکستخواردووەکانی لەبەرانبەر هێزی شۆڕشی کوردستان تێیکەوتبوو، دەسەڵاتەکەی خستبووە ژێر مەترسییەکی گەورە، بۆیە بۆ خۆ رزگارکردن بەناچاری پەنایان بردە بەر دانوستان‌و زۆر دڵودەستکراوانەش دانیان بە مافە رەواکانی کورددا نا[*]!

٢- لاوازیی پێگەی جەماوەریی بەعس. هەروەك لە راپۆرتی سیاسیی کۆنگرەی هەشتەمی هەرێمایەتیی حیزبی بەعسدا هاتووە: بەیاننامەی ١١ی مارت

(٨٥) پارتی دیموکراتی کوردستان (سەرکردایەتی کاتی)، رێبازی بزووتنەوەی ئازادیخوازی کورد (هەڵسەنگاندنی شۆڕشی ئەیلول‌و بەرنامەی نوێی پارتی دیموکراتی کوردستان)، راپۆرتی سیاسیی سەرکردایەتی کاتی پارتی دیموکراتی کوردستان کە لەلایەن کۆنفرانسی پارتی یەوە لە (١١-١٥)ی ئابی ١٩٧٦ پەسەند کراوە، ل٦٠

(*) شکستی بەعسییەکان بەر لە چەند مانگێك لە راگەیاندنی بەیاننامەی ١١ی مارت، بەتێکڕا هەفتانە گەیشتۆتە پتر لە (سێسەد) کوژراوو بریندداربوو، بەو رادەیەی کە ترسی لەدەستدانی فەرمانڕەوایی عێراقیان لێنیشتبوو. بۆیە بڕیاری دەسپێکردنی گفتوگۆیاندا تاکو هەلێکی درێژیان دەسکەوێت لەپای مانەوەیان لە دەسەڵات. بڕوانە: حردان التكريتي(وزير الدفاع العراقي السابق)، مذكرات سياسي عراقي (كنا عصابة من اللصوص والقتلة خلف مليشيات صدام للاعدام!)، دراسة: احمد رائف، مطابع الزهراء للاعلام العربي، القاهرة، ١٩٩٠، ص١٠٤.

بایەخێکی گەورەی هەبووە بۆ پتەوکردنی لایەنی مەعنەویی‌و ڕۆڵی بەعس لە نێو کۆمەڵدا[٨٦]. ئەمەش لاوازیی پێگەی بەعس لەنێو جەماوەردا بەر لە بەیاننامەی ١١ی مارت دەسەلمێنێ، کە بوویێتە هۆکارێك بۆ هاتنە کایەی گفتوگۆ لەلایەن بەعسییەکانەوە.

٣– بەعسییەکان هەر زوو سەنگو هێزی (پ.د.ك)و مستەفا بارزانییان بۆ دەرکەوت‌و لە ئایاری ١٩٦٩ لە لیکۆڵینەوەیەکدا لە گۆڤاری (الثورة العربیة)ی تایبەت بە خۆیان، دانیانبەوەدانا: باڵی مستەفا بارزانی لەنێو بزاڤی کوردییدا بەهێزترینییانە، ئەویش بەهۆی زۆریی هێزی مرۆیی و چەك‌و تەقەمەنی و ئەو پاڵپشتە ماددی و مەعنەوییەی لەسەرچاوە جیاوازەکانەوە پێی دەگات، هەروەها دەسگرتنی بەسەر شوێنە ستراتیژییەکاندا[٨٧].

٤– هۆکارێکی دیکەی هاتنە کایەی گفتوگۆکان لەنێوان سەرکردایەتی شۆڕشی کوردو حوکمەتی بەعس، دەگەڕێتەوە بۆ دابەشبوون‌و ململانێی نێو ریزەکانی حیزبی بەعس. چونکە لەو سەردەمەدا سەرکردایەتیی ئەو حیزبە دوو باڵی ناکۆکی تێدابوو. باڵێکیان عەبدوڵڵا سەللوم ئەلسامەڕایی سکرتێری حیزبەکەو باڵەکەی دیکەش سەدام حسێن، سەرکردایەتی دەکرد. سەرەتاش باڵی (برایم ئەحمەد– جەلال تاڵەبانی/ "م.س") کە لە شۆڕشی کوردی دابڕابوون، دۆستایەتییان لەگەڵ عەبدوڵڵا سەللوم ئەلسامەڕایی گەرم بوو. بەپێچەوانەشەوە، سەدام حسێن، بۆئەوەی شوێنی خۆی لەنێو حیزبی بەعسدا بەهێز بکات، هەوڵیدا پێوەندیی لەگەڵ ئەو باڵە کەم بکرێتەوەو پێوەندیی لەگەڵ مستەفا بارزانی و

(٨٦) حزبی بەعسی عەرەبی ئیشتراکی–عێراق، راپۆرتی سیاسیی سەر بەهەشتەمین کۆنگرەی هەرێمایەتی، کانوونی دووەمی ١٩٧٤، دار الحریة للطباعة– بغداد، ١٩٧٧، ل١١٢.

(٨٧) بڕوانە: د. سعد ناجی جواد، س پ، ل١٥٩.

شۆڕشی کورد ببەسترێت. ئیدی سەدام حسێن ئەو کارەی گرتە ئەستۆی خۆی، لەدواییشدا عەبدوڵڵا سەللوم ئەلسامەڕایی‌و باڵەکەی لەناوبردو خۆی بووە کەسی یەکەم لەناو حیزبی بەعس[88].

٥- بەعسییەکان، دەیانویست لەڕێگەی گفتوگۆوە مستەفا بارزانی لەناوبەرن (هەروەك دواتر لەساڵی ١٩٧١و ١٩٧٢ پیلانیان بۆ ئەم مەبەستە ڕێکخست)[*]، یانیش تەنیاو بێدەسەڵاتی بکەن‌و هێزە چەکدارەکەی و دەسەڵاتە سیاسیی و کۆمەڵایەتیەکەشی لێ دابماڵن[89].

٦- بەعسییەکان، دەیانویست لە ڕێگەی دانوستانەوە کێشەی کورد لەعێراقدا بۆ ماوەیەکی گونجاو هەڵپەسێرن، تاکو خۆیان بۆ هەڵمەتی پڕوپاگەندەکردن بۆ کێشەی عەرەب لەگەڵ ئیسرائیل تەرخان بکەن[90] ئەوەبوو دوای ڕاگەیاندنی بەیاننامەی ١١ی مارت، حوکمەتی عێراق ٣ هەزار سەربازی دیکەی نارده پاڵ ئەوتیپە عێراقییانەی لە ئوردن کۆببوونەوە[91]

(٨٨) دیدار لەگەڵ نەوشیروان مستەفا ئەمین، سلێمانی، ٥/١١/٢٠٠٢. نەوشیروان مستەفا ئەمین: ساڵی١٩٤٤ لەشاری سلێمانی لەدایك بووە. خوێندنی سەرەتایی‌و ناوەندیی‌و ئامادەیی لەسلێمانی تەواو کردووە، ساڵی١٩٥٨و ١٩٥٩ لە قۆناغی ناوەندیی پێوەندیی بە پارتی کردووە. ساڵی ١٩٦٨ بەشی زانستی سیاسیی لە زانکۆی بەغدا تەواو کردووە، ساڵی ١٩٦٩-١٩٧٠ گۆڤاری رزگاری دەرکردووەو خاوەن ئیمتیازی گۆڤارەکە بووە، ساڵی١٩٧٧ تاکو ١٩٩٢ سکرتێری کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان بووە، ئێستاش ئەندامی مەکتەبی سیاسیی یەکێتی نیشتمانی کوردستانە. دیدار لەگەڵ نەوشیروان مستەفا ئەمین، سلێمانی، ٥/١١/٢٠٠٢.

(*) لە تەوەری دووەمی بەشی سێیەمی باسەکەمان زیاتر لەو پیلانە دواوین.

(٨٩) حردان التكريتي، س پ. ل١٠٤؛ ئیبراهیم جەلال، س پ، ل٢٩٢.

(٩٠) دیدار لەگەڵ فوئاد عارف، بەغدا، ٦/١٢/٢٠٠٣.

(٩١) ادمون غريب، الحركة القومية الكردية، مط دار النهار، بيروت، ١٩٧٣، ص١٢٠.

٧- پاڵنەرێکی مستەفا بارزانی و جووڵانەوەکەی بۆ رازیبوون بە گفتوگۆو ئەنجامەکەی، پێوەندیی بەتینی باڵی (برایم ئەحمەد- جەلال تاڵەبانی/ "م.س") بوو لەگەڵ حوکمەت. لەبەرئەوەی مستەفا بارزانی مەترسی ئەوەی هەبوو کە لە ئەنجامی رێکنەکەوتنیان لەگەڵ حوکمەتی عێراق، بەعسییەکان هەوڵ و کۆششەکانیان بۆ پشتگیرییکردنی باڵی ناوبراو دژی شۆڕشی کورد زیاتر بکەن[٩٢]. هەروەها باڵی (برایم ئەحمەد- جەلال تاڵەبانی/ "م.س")، بەتایبەتی لە سەرەتای ١٩٦٩ تا پاییزی ئەو ساڵە، رۆڵێکی کاریگەرییان گێڕا لەبار قورسکردنی شۆڕشی کورد، چونکە ئەوان شارەزا بوون و دەیانزانی خاڵە لاوازەکانی شۆڕش لەکوێدایەو بۆ نیشاندانی ئەو خاڵانەش، هاوکارییەکی زۆری رژێمی عێراقیان دەکرد[٩٣] سەرەڕای ئەوەش، ئەمانە ئەوە ناگەیەنن کە ئەو باڵە کاریگەرییەکی تایبەتیان هەبووبێ جیا لە کاریگەرە گشتییەکەی باری ناوخۆ، بۆ رازیبوونی مستەفا بارزانی و شۆڕشی کورد لە دەسپێکردنی گفتوگۆ[٩٤]

٨- ئازاری ئەو زیانە گەورانەی شۆڕشی کورد لە سەرەتای هەڵگیرسانیەوە لە (١٩٦١) چەشتبووی، بۆ دۆزینەوەی رێگاچارەی دەربازبوون لەو کارەساتە، مستەفا بارزانی خستە بەردەم بەرپرسیارییەکی رەوشتییەوە[٩٥]، ئەمە لەلایەك،

(٩٢) NADER ENTESSAR, KURDISH ETHNONATIONALISM, Lynne Rienner Publishers, United States of America,1992.p71

(٩٣) دیدار لەگەڵ مەسعود بارزانی، هاوینەهەواری سەری رەش، ٢٠٠٣/٦/٢٢. مەسعود بارزانی: ساڵی ١٩٤٦ لەدایك بووە، لە کۆنگرەی هەشتەمی (پ.د.ك) لە ساڵی١٩٧٠، بۆتە ئەندامی کۆمیتەی ناوەندیی. لە ساڵی ١٩٧٩یشەوە تا ئێستا سەرۆکی پارتی دیموکراتی کوردستانە.

(٩٤) دیدار لەگەڵ مەسعود بارزانی، هاوینەهەواری سەری رەش، ٢٠٠٣/٦/٢٢.

(٩٥) NADER ENTESSAR, Op.Cit. p71-72

لەلایەکی دیکەشەوە مستەفا بارزانی هەرچەندە لەسەرەتاوە بەفرتوفێڵی بەعسییەکانی دەزانی. بەڵام پێی وابوو رەتکردنەوەی دەسپێشخەریی ئەوان بۆ رێککەوتن لەگەڵ سەرکردایەتی شۆڕشی کورد، دەبێتە مایەی ورووژاندنی پرسیار لای خەڵکی کوردستان. هەروەك لە دوای نسکۆی شۆڕش لە ساڵی ١٩٧٥ گوتی: "یەکەم جار (بەعسییەکان) هاتنەلامان و گوتیان: (ئۆتۆنۆمیتان پێ دەدەین). گوتم ئەمە فێڵە. من ئەوەم پێش ئیمزاکردنی ریککەوتننامەکە دەزانی. بەڵام خەڵك لێیان دەپرسیم: تۆ چۆن دەتوانی ئۆتۆنۆمیی بۆ گەلی کورد رەت بکەیتەوە؟"[٩٦].

بێگومان مستەفا بارزانی وێڕای هەستی گەورەی بەرپرسیاری بەرانبەر گەلەکەی، لەناو(پ.د.ك)یشدا نەیویستووە (دیکتاتۆرییەت) بەکاربهێنێ. ئەوەش زۆر بە روونی لەدوا کۆبوونەوەی نێوان سەرکردایەتیی شۆڕشی کوردو رژێمی عێراقدا دەردەکەوێ. ئەو کاتە لە کۆبوونەوەیەکی تایبەتی سەرکردایەتیی پارتییدا، بۆ دوا بڕیاردان لەسەر رێککەوتن، زۆربەیان پشگیری رێککەوتنەکەیان کردووە، بە تەنها مستەفا بارزانی بەگومان بووەو متمانەی بە جێبەجێکردنی رێککەوتنەکە نەبووە لەلایەن دەسەڵاتدارانی عێراقەوە، بەڵام نەیویستووە رای خۆی لەسەر زۆرینەی سەرکردایەتیی بسەپێنێ و (دیکتاتۆرییەت) بەکاربهێنێ و رێککەوتنەکە رەت بکاتەوە[٩٧].

---

(٩٦) دیڤید ماکداول، مێژووی هاوچەرخی کورد، و: ئەبوبەکر خۆشناو، ب٢، چاپخانەی رهون، سلێمانی، ٢٠٠٢، ل٦٧٩.

(٩٧) موحسین دزەیی، لەبیرەوەرییەکانی ١١ی ئاداری مەزن، رۆژنامەی برایەتی، ژ(٢٩٤٤)، ١٩٩٨/٣/١١، دیدار لەگەڵ حەبیب محەمەد کەریم، هاوینەهەواری شەقڵاوە، ٢٠٠٤/٧/٢٧.

## هۆكاره دەرەكییەكان:

هەڵگیرسانی شۆڕشی ئەیلول نەك هەر لەسەر ئاستی ناوخۆ، بەڵكو لەسەر ئاستی هەرێمیی و نێودەوڵەتیشدا كاریگەریی گەورەی هەبوو. ئەمەش زۆر بەڕوونی لە پێوەندییە سیاسییەكاندا رەنگی دەدایەوە، جا چ لەگەڵ جووڵانەوەی كوردیی، یان لەگەڵ حوكمەتی عێراقیدا بووبێت. لەبەرئەوە، پێویستە گرنگترین فاكتەرە دەرەكییەكانی گفتوگۆی نێوان سەركردایەتیی شۆڕشی كوردو حوكمەتی عێراق دەستنیشانبكرێن. كە ئەمانەن

١- رۆڵی یەكێتی سۆڤیەت، لە فاكتەرە هەرە كاریگەرەكانی گفتوگۆو رێككەوتنی كوردو رژێمی عێراق بوو، لەو پێناوەی پێگەی خۆی لە ناوچەی رۆژ هەڵاتی ناوەراست بەهێزتر بكات. ئەوەبوو سۆڤیەت، ناوبژیی هەردوو لای كردو رۆڵێكی گەورەی گێڕا لە رازیكردنی مستەفا بارزانی، بۆ گفتوگۆكردن لەگەڵ دەسەڵاتدارانی عێراق[٩٨] تەنانەت (فیدوتوڤ)ی باڵیۆزی سۆڤیەت لە عێراق، بە پەرۆشەوە چاودێریی گفتوگۆكانی دەكردو زۆرجاریش چاوی بەشاندی هەردوولا دەكەوت و سەركەوتنیشی لە لێكتر نزیككردنەوەی هەڵوێستەكانیان بەدەسهێنا[٩٩]. ئەمە جگە لەوەی لەو پێناوەدا سەركردایەتی سۆڤیەت لەرێگەی (یەڤگینی پریماكۆف)ەوە، هەندێ جار نامەی بۆ سەركردایەتیی شۆڕشی كورد دەنارد[١٠٠].

هاوشانی یەكێتی سۆڤیەت، زۆربەی وڵاتانی كامپی سۆشیالیستی هانی كوردو حوكمەتی عێراقیان دەدا بۆ كۆتایی پێهێنانی كێشەی نێوانیان. لەسەر ئاستی

(٩٨) پارتی دیموكراتی كوردستان (سەركردایەتی كاتی)، س پ، ل٤٧.

(٩٩) مسعود البارزاني، البارزاني والحركة التحررية الكردية، ج٣، ص٢٣٥-٢٣٦.

(١٠٠) هـ س، ل٢٢٦-٢٢٧ و٢٤٠.

وڵاتانی عەرەبییش میسر هەمان ڕۆڵی دەگێڕاو خوازیاری چارەسەرکردنی کێشەی کورد بوو[١٠١].

٢– لەو سەردەمەدا، پێوەندیی نێوان هەردوو ڕژێمی عێراق و ئێران، سروشتێکی دوژمنکارانەی بەخۆوە گرتبوو. لەبەرئەوە هەرەشەو هێز کۆکردنەوەکانی ئێران لەسەر سنوورەکانی عێراق و داوای ئێران بۆ هەندێ لە بەشەکانی زەوی و ئاوی عێراق، هاوکاتی قۆستنەوەی کێشەی کورد، وایان لە ڕژێمی عێراق کرد پەنابەرێتە بەر گفتوگۆو دانوستان لەگەڵ سەرکردایەتیی شۆڕشی کورد[١٠٢] ڕژێمی عێراق ئەو هەڵوێستەی بە لانیکەم وەك چارەیەکی کاتیی بەباش دەزانی، چونکە بەوە کارتی کوردی لە دەست ئێران دەردەهێناو هەڵوێستی خۆی پێ بەهێز دەکردەوە[١٠٣].

جێی ئاماژە پێکردنە ناکۆکیی و ململانێی نێوان ئەو دوو وڵاتە، ئەگەرچی مێژوویەکی دوورودرێژی هەیە، بەڵام ئەو ناکۆکییە دوای ئەوەی لە ١٩ی نیسانی ١٩٦٩ جێگری وەزیری دەرەوەی ئێران، لە ئەنجوومەنی پیرانی وڵاتەکەیدا یەك لایەنە هەڵوەشانەوەی پەیمانی سنوری نێوان هەردوو وڵاتی ڕاگەیاند[١٠٤]، کەلە ٤ی تەموزی ١٩٣٧ لەنێوانیاندا مۆرکرا بوو و کێشەی سنووری نێوانیان چارەسەر کرابوو، قووڵتر بۆوە[١٠٥].

---

(١٠١) دیدار لەگەڵ دکتۆر مەحمود عوسمان، هەولێر، ٢٠٠٣/٨/١٦.

(١٠٢) د. سعد ناجی جواد، س پ، ل١٦٦.

(١٠٣) د. بورهان یاسین، ئەوەی ئەوڕۆ سیاسەتە... سبەی مێژووە، چاپەمەنیی ئۆفسێتی دیلان، سلێمانی، ٢٠٠٢، ل١١٣

(١٠٤) د. جابر ابراهیم الراوي، الحدود الدولیة ومشکلة الحدود العراقیة الایرانیة– دراسة قانونیة وثائقیة، مط دار السلام، بغداد، ١٩٧٥، ص٤٩٦.

(١٠٥) بۆ زانیاریی زیاتر دەربارەی ئەو پەیمانە، بڕوانە: هـ س، ل٤٣٠–٤٥٩.

٢– ئـەوەی وای لـە حوکمـەتی بـەعس کـرد کـە لـە گفتوگـۆی لەگـەڵ سەرکردایەتی کورددا پەلەبکات، ئەو هەوڵە سەرنەکەوتووەی کودەتا(*) بوو کە لە کانوونی دووەمی١٩٧٠ بۆ لادانی رژێمەکەیان ئەنجامدرا. هەرچەندە ئەنجامدەرانی کودەتایەکـە سـەرنەکەوتن و پـتر لـە ٤٠ کەسـیان لـە سـێدارە دران، بـەڵام لـە بەرەنجامی ئەو کودەتایەدا، عێـراق دەسـەڵاتدارانی ئێرانـی تاوانبـار کـرد، بـەوەی باڵیۆزخانـەی ئێـران لـە بەغـدا، دەسـتی لـەو پیلانگێڕییـەدا هـەبووە، هـەر لەبـەر ئەوەش حوکمەتی بەعس باڵیۆزی ئێرانی لەعێراق وەدەرنا(١٠٦).

بۆیە لەپێناو کەمکردنەوەی دەستێوەردانەکانی ئێـران لـە کاروبـاری نـاوخۆی عێراق، رژێمی بەعس پەلەی کـرد لـە پەنابردنەبـەر گفتوگۆ لەگـەڵ سـەرکردایەتی شۆڕشی کوردستان، چونکە لەو سەردەمەدا ئێران پێوەندیی لەگەڵ سـەرکردایەتی

---

(*) نهێنی ئەو هەوڵە کودەتایە لەرێگەی یەکێتی سۆڤیەتەوە گەیشتە حیزبی شیوعی عێراق و داوایان لەوان کرد کە هەواڵەکـە بگەیەننـە سـەرکردایەتی حیزبـی بـەعس، ئەگـەر پێیـان نەگەیـشتبایە بـەلای زۆرەوە کودەتاکـە سـەرکەوتوو دەبـوو. دیـدار لەگـەڵ بەهائـەدین نووری، سلێمانی، ٢٠٠٣/٩/١٨. بەهائەدین نووری: ساڵی ١٩٢٧ لە گوندی تەکیەی سـەر بە قەرەداغ لەدایك بووە و تا پۆلی چواری ئامادەیی خوێنـدووە. سـاڵی ١٩٤٦ پێوەنـدیی بە حیزبـی شـیوعی عێـراق کـردووە. لەسـەروبەندی نـسکۆی حیزبـدا سـاڵی ١٩٤٩ بۆتـە سکرتێری رێکخراوی سلێمانی. هـەر لـەو سـاڵەدا بۆتـە سـکرتێری یەکـەمی حیـزب تـاکو ساڵی ١٩٥٣ بەردەوام بووە، ساڵی ١٩٥٣ لەلایـەن حوکمەتـەوە دەسـگیر کـراوە و سـاڵی ١٩٥٨ لـە بـەرەنجامی چـواردەی تـەمموز ئـازاد کـراوە، پاشـان لـە کـاری حیزبـی تێهەڵچۆتەوە و بۆتـە ئەنـدامی مەکتـەبی سیاسـیی. سـاڵی ١٩٨٤ لـە ریزەکـانی حیزبـی شـیوعی عێراقـی هاتۆتـەدەر، سـاڵی ١٩٩٤ حیزبێکـی بـەناوی (بزووتنـەوەی دیموکراسیخوازان) دامەزراندووە، بڕوانە: بهاءالدین نوري، مذکرات.

(١٠٦) ادغار اوبلانس، س پ، ل١٥٩.

كوردیش هەبوو[*]. بەوەش حوكمەتی بەعس بواری زێتری بۆ دەرەخسا كە نیازی لێكجیاكردنەوەی ئێران لە سەركردایەتی شۆڕشی كوردستان بەدەسبخاتو ئۆتۆماتیكییانە دەسەلاتی خۆیشی لەنێو چوارچێوەی ولاتدا لەرێگەی رەوشی ئاشتییەوە پتەو بكات.

٤– رووە جیهانییەكەی، بەناو چارەسەركردنی كێشەی كورد، بۆ رژێمی بەعس گرنگ بووو ئەم هەنگاوەیان دەبووە هۆیەك بۆ بەدەسهێنانی رێزو پێگەی حوكمەتی بەعس لەنێو ولاتاندا[١٠٧]، لەبەرئەوەی بەعسییەكان ماوەیەكی كورت بوو دەسەلاتیان گرتبووە دەستو هەولیان دەدا لەرێی بانگەشەكردن بۆ چارەكردنی كێشەی كوردەوە ناوبانگییەكی زیاترو پشگیری نێودەولەتی بۆ رژێمەكەیان بەدەسبێنن.

(*) لەمیانی تەوەری چوارەمی بەشی دووەمی باسەكەماندا لەو پێوەندییە دواوین.

(١٠٧) د. بورهان یاسین، س پ، ل١١٣.

## تەوەرى سێیەم:

# كاریگەریی و كاردانەوەی راگەیاندنی بەیاننامەی ١١ی مارت

### أ- لەسەر ئاستی ناوخۆ:

راگەیاندنی بەیاننامەی ١١ی مارت وەرچەرخانێكی گەورە بوو لە مێژووی دەسەڵاتی سیاسیی عێراق و دەسپێكی قۆناغێكی نوێی جووڵانەوەی رزگاریخوازی كوردستان بوو، كە تێكۆشانی سیاسییو رۆشنبیری جێگەی ململانێو خەباتی چەكداری گرتەوە. ئیدی شۆڕشگێڕانی سەرچیاكان لەگەڵ جەماوەری كوردستان لەشارەكاندا تێكەڵ بوونەوەو گشت پارتو كۆمەڵە سیاسییەكانی عێراق مافی ئۆتۆنۆمییان خستە نێو بەرنامەكانیانەوە[(١٠٨)] گەلانی عێراق بەخۆشیو شادییەوە پێشوازییان لەم قۆناغە مێژووییە كرد.

لە ١٢ی مارتدا بۆ خۆشحاڵیی دەربڕین خۆپیشاندانێكی گەورەی جەماوەری گەلانی عێراق لە بەغدای پایتەخت بەڕێوە چوو كە سەركردایەتی بەعسو گەورە بەرپرسانی حوكمەتو شاندی گەورەی كورد تیادا ئامادە بوونو لە بەردەم جەماوەرێكی بەرفراواندا سەرۆك كۆمار وتارێكی خوێندەوەو دكتۆر مەحمود عوسمانیش پەیامی مستەفا بارزانی خوێندەوە[(١٠٩)] دواتریش لەسەر داوای سەرۆك كۆمار شاندی هاوبەشی كوردو رژێمی بەغدا سەردانی شارەكانی عێراقیان كرد[(١١٠)].

---

(١٠٨) پارتی دیموكراتی كوردستان (سەركردایەتی كاتی)، س پ، ل٦٠.

(١٠٩) مسعود البارزاني، البارزاني والحركة التحررية الكردية، ج٣، ص٢٤٥.

(١١٠) هـ س، ل٢٤٨.

بەیاننامەی ١١ی مارت نەك هەر بەتەنیا ئاشتی لەنێوان شۆڕشی کوردو حوکمەت هێنایە کایەوە، بەڵکو بەهۆیەوە ئاشتی کەوتە نێوخۆی کوردانیش. ئەوەبوو (باڵی برایم ئەحمەد– جەلال تاڵەبانی/ "م.س") کە لەپاڵ حوکمەتی عێراق دژی مستەفا بارزانیو شۆڕشی کورد دەجەنگان، بەبروسکەیەك بۆ ئەحمەد حەسەن بەکر پشتگیری خۆیان لەبەیاننامەکە ڕاگەیاند[١١١] برایم ئەحمەدیش کە ئەوکاتە لە لەندەنی پایتەختی بەریتانیا بوو، بە مەبەستی پیرۆزباییکردن سەردانی باڵیۆزخانەی عێراقی کرد. هەروەها جەلال تاڵەبانییش پشتگیری خۆی بۆ بەیاننامەکە ڕاگەیاند[١١٢] بێگومان ئەو هەڵوێستانەش لەبەر هەر هۆکارێك بوو بن بەهەنگاوێکی پۆزەتیڤانە لەقەڵەم دەدرێنو خزمەتێکی گەورەیان بە بزووتنەوەی سیاسیی کورد گەیاندو یەکریزییو تەبایی کەوتە نێویانەوەو کێشەی نێوانیان بەکۆتا هات[١١٣]

سەرۆك جاشەکانیش[*] بۆ داوای لێبوردن چوونە لای مستەفا بارزانی، ئەویش لەتاوانەکانیان خۆش بوو[١١٤] ئەو هەڵوێستەش لەلایەکەوە گیانی لێبوردەییو لەلایەکی دیکەشەوە دووربینی مستەفا بارزانی دەگەیەنێت، لەبەر ئەوەی ئەم هەنگاوەی بۆ ئەو مەبەستە بووە کە ئەو جاشانە لەناو باوەشی ڕژێمی بەعس دەربهێنێتو بیانهێنێتەوە نێو ڕیزی بزووتنەوەی کوردایەتیی، بۆ ئەوەی

---

(١١١) جەمال نەبەز، کوردستانو شۆڕشەکەی، ل٣٠٨

(١١٢) ڕەفیق پشدەری، کورد دوژمنی خۆت بناسە ،چ١، (ب.ش)، ١٩٩٩، ل٢١

(١١٣) لە تەوەری یەکەمی بەشی دووەمی باسەکەمان بە فرا ،نی لەم بابەتە دواوین.

(*) وشەی (جاش) لە فەرهەنگی سیاسیی کوردیدا بۆ ئەو کاسانە بەکار دەهێنرێت کە دژی بزووتنەوەی سیاسیی کورد، وەك بەکرێگیراو چالاکی ئەنجام دەدەنو بۆتە زاراوەیەکی سیاسیی–کۆمەلایەتی بۆ گوزارشت لێکردنیان.

(١١٤) مسعود البارزاني، البارزاني والحركة التحررية الكردية، ج٢، ص٢٥٠.

جارێكى دیكه نەتوانن كەڵك لە هێزو توانایان وەربگرن و دژى بزووتنەوەى رزگاریخوازى كوردستان بەكاریان بهێنن.

هەڵبەته كاریگەریى و گاردانەوەى بەیاننامەى ١١ى مارت تەنها لە كوردستانى ژێر دەسەلاتى عێراق گیرى نەخوارد، بەڵكو لە پارچەكانى دیكەى كوردستانیش بەگەرمى پێشوازى لێكرا. ئەوەبوو گەلى كورد لە كوردستانى ژێر دەستى ئێران راگەیاندنى ئەو بەیاننامەیەى بەسەركەوتنێكى گەورەى بزووتنەوەى ئازادیخوازى كوردستان ناسى و (حیزبى دیموكراتى كوردستانى–ئێران)یش بە بڵاوكردنەوەى بەیاننامەیەك خۆشحاڵیى و پشگیرى خۆى بۆ راگەیاندنى بەیاننامەى ١١ى مارت راگەیاند[١١٥] عەبدولڕەحمان قاسملووش[*] پێى وابوو ئەو بۆنەیە بۆ گشت گەلى. كوردو گەلانى رۆژهەلاتى ناوەڕاست سەركەوتنێكى گەورەیەو واى دەبینى: ئەو پێكهاتنە بەرەى دیموكراتیى دژى ئیمپریالیستى گەلان لە ناوچەكە بەهێزتر دەكا، هەروەها پێى وابوو چارەسەركردنى كێشەى كورد لەعێراقدا كاریگەرییەكى زۆر دەكاتە سەر خەباتى كورد لەهەموو پارچەكانى كوردستان، بەتایبەتى لەكوردستانى ژێر دەسەلاتى ئێران[١١٦]

---

(١١٥) رۆژنامەى "كوردستان" ئۆرگانى كۆمیتەى ناوەندیى حزبى دیموكراتى كوردستان– ئێران، دووهەمین بیرەوەرى بەیاننامەى ١١ى مارس، ژ(١٤)، مارسى ١٩٧٢.

(*) عەبدولڕەحمان قاسملوو ساڵى ١٩٣٠ لە گوندى قاسملوو كە دەكەوێتە نێوان هەردوو شارى ورمێ و شنۆ، لە دایك بووە، ساڵى ١٩٧١ بۆتە ئەندامى كۆمیتەى ناوەندیى پاشان سكرتێرى گشتى حیزبى دیموكراتى كوردستانى ئێران،ساڵى ١٩٨٩ لە ڤیەنناى پایتەختى نەمسا لەگەڵ چەند هاورێیەكى لەلایەن رژێمى ئێرانەوە شەهید كرا، بۆ زانیاریى زیاتر بڕوانە: كاوە بەهرامى، دوكتور قاسملوو رێبەرێكى مۆدێرن و شۆڕشگێرێكى دێموكرات، (بێ چ)، (بێ ش)، (بێ س).

(١١٦) "هاوكارى" (رۆژنامەیەكى هەفتانەى گشتییە دەزگاى گشتى چاپەمەنى و بڵاوكردنەوە دەرى ئەكا)، ژ(١٣)، ١٩٧٠/٤/١٢.

لە کوردستانی ژێر دەستی تورکیاشدا بەیاننامەی ١١ی مارت دەنگی دایەوەو بووە مایەی جۆشسەندنی بزووتنەوەی کورد لەو پارچەیەدا، بەتایبەتیش لە ناوچەکانی ماردینو سیواسو قەیسەریەی دیاربەکرو ناوچەکانی نزیك سنووری سوریا. ئەوەش وای لە دەسەلاتدارانی تورك کرد کە لە نێوان سالانی ١٩٧١-١٩٧٨ حوکمی عورفی لەو پارچەیەی کوردستاندا رابگەیەنن(١١٧)و سیاسەتی تیرۆرو دەستگیرکردنو برسییکردن دژی کورد بەکار بهێنن(١١٨) هەر لەژێر کاریگەریی راگەیاندنی بەیاننامەی ١١ی مارت، (پارتی دیموکراتی کوردستان- تورکیا) لە هاوینی ١٩٧٠دا یەکەمین کۆنگرەی دامەزراندنی خۆی بەست، ئەو کۆنگرەیەی کە هەموو ئەو شانانەی لەکۆتایی شەستەکاندا پەیدابوون لە رێکخراوێکدا یەکخست، پاشانیش ئەو پارتە چالاکییەکانی بەگورتر بوون(١١٩)

لە کوردستانی ژێر دەسەلاتی سوریاشدا، گەلی کورد شادمانی خۆیان دەربریو لە بروسکەیەکدا بۆ سەرۆك کۆماری عێراق پشتگیری خۆی بۆ بەیاننامەکە راگەیاند. ئەوەشیان دەربری کە گەلی کورد لە سوریا لەژێر زەبری چەوساندنەوەو تیرۆرو تۆقاندندا دەنالێنێت(١٢٠) هاوکات (پارتی دیموکراتی کورد لە سوریا) لە بەیاننامەی کۆتایی کۆنگرەی نیشتمانی یەکەمیدا کە لە مانگی ئابی

---

(١١٧) احمد عبدالباقي، الدور السياسيي للقوميات فی ترکیا، الاکراد (دراسة حالة)، اطروحة مقدمة الى مجلس معهد الدراسات القومية والاشتراكية في الجامعة المستنصرية وهي جزء من متطلبات درجة الماجستير في الدراسات الدولية، ايلول ١٩٨٩، ص٧٧

(١١٨) بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: جەمال نەبەز، کوردستانو شۆڕشەکەی، ل١١٥-١٢٠.

(١١٩) بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: عبدالفتاح علی یحیی، الحزب الديمقراطي الكوردستاني في تركيا (١٩٦٥- ١٩٩٢) نشأته وتطوره، گوڤارا زانکویا دهوك (مرۆڤایەتی- ئەکادیمییە)، پەربەندا (٥)، هەژمارا (١)، ئەیلول ٢٠٠٢، ل١٣٨-١٥١.

(١٢٠) جەمال نەبەز، کوردستانو شۆڕشەکەی، ل٣٠٨.

١٩٧٠دا بەسترا، بەياننامەى ١١ى مارتى بەرز نرخاندو گەلى كوردو دەسەلاتدارانى عێراقى بۆ گرتنە ئەستۆى سەرخستنى ئەو ئەزموونە مێژووييە هاندا[(١٢١)]

هاوشان كوردانى نيشتەجێى لوبنانيش لە بەيروتى پايتەختدا لەبەردەم باليۆزخانەى عێراق بۆ دەربڕينى شادمانىو پشتگيرييان بۆ بەياننامەى ١١ى مارت خۆنيشاندانيان سازدا[(١٢٢)].

وەك يەكەم رێكخراوى كورديش لە هەندەران، نوكسە[(*)] لە ئۆرگانەكەى خۆيدا (Kurdistan Information)، بەياننامەكەى هەڵسەنگاندو سەرەڕاى گومانى بەرانبەر رژێمى عێراق لە جێبەجێكردنى بەڵێنەكانيان، پيرۆزبايى خۆى لە ئاشتەوايى نێوان كوردو ئەو رژێمە كردو هيواى خواست تا سەر بێت[(١٢٣)]

لە تاراوگەشدا، سياسەتمەدارانى كورد پشتگيرى خۆيان بەرانبەر بەياننامەى ١١ى مارت نيشاندا. لەوانەش دكتۆر كامەران بەدرخان[(**)]، لەگەڵ خێزانەكەى لە

---

(١٢١) "الكادر" (مجلة نظرية يصدرها الحزب الديمقراطي الكردستاني)، ع (١)، بغداد، تشرين الثاني ١٩٧٠، ص٩٠

(١٢٢) "النور" (جريدة يومية–سياسية)، ع(٤٢٥)، ١٩٧٠/٣/١٩.

(*) نوكسە: مەبەست (يەكێتى نەتەوەيى خوێندكارانى كورد لە ئەورووپا)يە، كە لە ٢١ى ئادارى ١٩٦٥ لەلايەن جەمال نەبەزو هەندێ لە هاوبيرانى دامەزرێنراوە. بڕوانە: جەمال نەبەز، كوردستانو شۆڕشەكەى، ل٢٤٨–٢٤٩.

(١٢٣) جەمال نەبەز، كوردستانو شۆڕشەكەى، ل٣٠٩.

(**) كامەران ئەمين عالى بەدرخان: ساڵى ١٨٩٥ لە ئەستەنبۆڵ لەدايك بووە. باوكى كامەران يەكێك لە كوڕەكانى ميرى كورد (مير بەدرخان پاشا)يە، كامەران خوێندنى سەرەتايىو ناوەنديىو كۆلێژى مافى لە ئەستەنبۆڵ تەواو كردووە، يەكێك بووە لە كوردە چالاكەكانى كوردستانى توركيا، پاش راوەدوونانى لەلايەن كەماليەكانەوە پەراگەندەى سورياو ئەڵمانيا بووە، رۆڵى كاراى هەبووە لە دامەزراندنو كردنەوەى پارتو كۆمەڵە سياسيىو رۆشنبيرييەكانى كورد لە نێوان ساڵانى سىو چلەكانى سەدەى بيستەم، خاوەنى

٣٠ حوزەیرانی١٩٧٠ بۆ بەشدار بوون لە دانیشتنەکانی کۆنگرەی هەشتەمی (پ.د.ك) کە لە کوردستان دەبەسترا گەیشتنە بەغدا. لە لێدوانێکی تایبەتیشدا بۆ رۆژنامەی (التآخي)، کامەران بەدرخان وتی: "مایەی ئاسوودەییمە لە ولاتی ئاشتییەوە (مەبەست لە عێراقە– نووسەر) سلاو لە بەیاننامەی ١١ی مارت و گەرانەوەی پێوەندیی برایانەی نێوان رۆلە هاونیشتمانەکان و کۆمبوونی نیازە خاوێنەکان بکەم لە پێناو بەدەنگەوە هاتنی لێزانانە بۆ پێویستییەکانی پەرەپێدان و بووژانەوەو پێشخستنی عێراق و گەلەکەی"[١٢٤].

لێرەدا دەتوانین ئاماژە بەوەش بدەین کە بەیاننامەی ١١ی مارت، لە کوردستاندا وێرای کاردانەوەی سیاسیی، لە بوارە جیاجیاکانی دیکەشدا کاریگەریی باشی نواند. بۆ نموونە لە بواری رۆشنبیرییدا پێشکەوتنی بەرچاو بەدیهات و لە ماوەی مارتی ١٩٧٠ تاکو مارتی ١٩٧٤ بەدەیان گۆڤارو رۆژنامەو بلاوکراوە دەرچوون، کە بۆ رۆژنامەگەریی کورد بە ماوەی زێرین دادەندرێت[١٢٥]، هەروەها بەهۆی دامەزراندنی بەرێوەبەرایەتییەکی تایبەت بە خوێندنی کوردی، خوێندن و خوێندەواری پەرەیسەندو "ئەو بەرێوەبەرایەتییە کاری زۆر گەورەی ئەنجامدا، بەتایبەتی لە وەرگێران و دانانی کتێبی قوتابخانەکان کە دەبوو خوێندن لەهەردوو قۆناغی ناوەندیی و ئامادەیی ببێتە کوردی، چونکە بەر لە١١ی

---

کۆمەلێك بەرهەمی چاپکراوە. سالی ١٩٧٨ لە دوورە ولاتی (پاریس)، کۆچی دوایی کردووە. بڕوانە: صديق عثمان، الزكرى الـ(١٩) لرحيل الدكتور كامران بدرخان، "گولان العربي" (مجلة شهرية–سياسية–ثقافية عامة)، ع(١٧)، ٢٥ تشرين اول ١٩٩٧، ص٤٣–٤٦.

(١٢٤) "التآخي"، ع(٤٧٦)، ١٩٧٠/٧/١.

(١٢٥) بڕوانە: باوەکر عوبێد سالح، س پ، ل١٣٣.

ئاداری١٩٧٠ خوێندنی سەرەتایی تاڕادەیەك ببووە كوردی[١٢٦]. جگە لەمانەش هەرلە بواری ڕووناكبیرییدا چەند دەزگایەكی وەك كۆمەڵەی ڕۆشنبیریی كوردیو كۆڕی زانیاریی كورد دامەزرانو یەكێتی نووسەرانی كوردیش كەمانگێك بەر لەڕاگەیاندنی بەیاننامەی ١١ی مارت دامەزرا بوو، دوای ڕاگەیاندنی بەیاننامەكە، كۆنگرەی یەكەمی خۆی بەستو دەست بەكار بوو[١٢٧].

لەبواری ئابوورییشدا سەرەڕای سیاسەتی جیاواز، بە بەراوورد لەگەڵ ناوچەكانی دیكەی عێراق، ئەو پرۆژانەی لە كوردستان دامەزران، لە سەرجەمی ئەو پرۆژانە زیاتر بوون كە لە ١٤ی تەمموزی ١٩٥٨ تا ئەوكاتە دامەزرابوون[١٢٨] هەروەها لەلایەن حوكمەتەوە نزیكەی (٢٠)ملیۆن دینار بۆ ئاوەدانكردنەوەی كوردستان تەرخانكرا[١٢٩]. ئەوەش بۆ ئەوسەردەمە بڕێكی كەم نەبوو.

لەسەر ئاستی عێراقیشدا، پارتە سیاسییەكان بەگەرمی پێشوازی بەیاننامەی ١١ی مارتیان كرد. بەر لە هەموانیش، (عەزیز محەمەد)ی سكرتێری لیژنەی مەركەزی (ح.ش.ع) بەو بۆنەیەوەو لەهەمان ڕۆژدا بروسكەی پیرۆزبایی بۆ هەریەك لە سەرۆك كۆماری عێراقو سەرۆكی (پ.د.ك) ڕەوانە كردو وێڕای پیرۆزباییكردن، لەو بروسكەیەدا لەپێناو جێبەجێكردنی بەندەكانی بەیاننامەكە، جەختی لەسەر

---

(١٢٦) پەروەردەو زانست (كۆفارێكی پەروەردەیی و زانستی یە بە سێ مانگ جارێ دەردەچێ)، ژ(١٢)، بەهاری ١٩٧٧، ل٨٩–٩٥.

(١٢٧) بۆ زانیاریی زیاتر دەربارەی ئەو دەزگایانە بڕوانە: باوەكر عوبێد ساڵح، س پ ، ل١٥٩–١٦٤.

(١٢٨)پارتی دیموكراتی كوردستان (سەركردایەتی كاتی )، س پ، ل٦١

(١٢٩) كرێس كۆچیرا، مێژووی كورد لە سەدەی ٢٠-٩ دا، و: محمد ریانی ،چاپخانەی كاروون، تاران، ١٣٦٩، ل٤٢٨.

ئامادەیی هاوکاریکردنی هەردوولا کردبوو.[(١٣٠)] شایانی باسیشە کە (ح.ش.ع) لە ناوەڕاستی مارتی هەمان ساڵدا بەیاننامەیەکی دەرکرد تیایدا سەرەتا باسی لە هەڵوێستی خۆی کردبوو بەرانبەر کێشەی کورد هەر لە سەرەتای دامەزراندنی حیزبەکەیانەوە، جەختیان لەسەر ئەوەش کردبوو کە ناشێ کوردستان بەبێ سیستەمێکی دیموکراسی لەتەواوی عێراقدا، بەمافی ئۆتۆنۆمی شاد بێت[(١٣١)] لەگەڵ هەموو ئەوانەشدا (ح.ش.ع) تێبینی خۆی لەسەر بەیاننامەی ١١ی مارت هەبوو، کە بە پێویستی دەزانی ئەو رێککەوتنە فراوانتر بکرێتو پارتە سیاسییەکانی دیکەی عێراق بگرێتەوە، بۆ ئەوەی حوکمەت نەتوانێت پاشەکشەی لێبکات[(١٣٢)]

هەروەها (حیزبی نیشتمانی دیموکراسی)[(*)]، لە مانگی مارتی ١٩٧٠دا بەیاننامەیەکی دەرکردو تیایدا لە روانگەی باوەڕییان بە چارەسەری ئاشتیانەی

---

(١٣٠) بۆ دەقی هەردوو بروسکەکە بڕوانە: "الثقافة الجديدة" (مجلة شهرية ثقافية عامّة)، ع(١٢)، آذار–نيسان١٩٧٠، ص٣١٦–٣١٨.

(١٣١) بڕوانە: "الثقافة الجديدة"، ع(١٢) آذار– نيسان ١٩٧٠، ص٣٢٩–٣٢٣.

(١٣٢) دیدار لەگەڵ دکتۆر موکەڕەم تاڵەبانی، بەغدا، ٢٠٠٣/١٢/٧.

(*) حیزبی نیشتمانی دیموکراسی: ساڵی ١٩٤٦ لە لایەن کامل چادرچی و هاوڕێکانی دامەزراوەو ئامانجیشی ئەنجامدانی چاکسازیی گشتی بووە لە بوارە سیاسیی و ئابووریو کۆمەڵایەتی و رۆشنبیرییەکان، بە مەبەستی گۆڕینی بارودۆخی دواکەوتووی عێراق بۆ دەوڵەتێکی دیموکراتی هاوچەرخ. بڕوانە: د. عادل تقي عبد محمد البلداوي،الحزب الوطني الديمقراطي في العراق ١٤ تموز ١٩٥٨–٨ شباط ١٩٦٣،مط الميناء، بغداد، ٢٠٠٠،ص٢٣–٢٤. شایانی باسە ئەم حیزبە هەر لە سەرەتای دامەزراندنیەوە هاوسۆزی کێشەی کورد بووە، بۆیەش ژمارەیەکی زۆری تێکۆشەری کورد چووبوونە ریزەکانیەوە. پێوەندییەکی پتەویشی لەگەڵ (پ.د.ک) هەبووە و لەگەڵ هەڵگیرسانی شۆرشی ئەیلول، جەختی لەسەر چارەسەکردنی ئاشتییانەی کێشەی کورد

نۆزى كورد، پشتگیرییان له بەیاننامەی ١١ى مارت كردو هیواى هێنانە ئاراى كەشێكى دیموكراسییانەو هەڵبژاردنى ئەنجومەنى نیشتمانییان له عێراقدا خواست[١٣٣]

رێكخراوو سەندیكا پیشەییەكانى عێراقیش، بە هەمان شێوە بەیاننامەی ١١ى مارتیان پیرۆز كرد، كە بەو بۆنەیەوە هەریەك له (محەمەد مەهدى جەواهیرى لەدەستەی دامەزرێنەرانى یەكێتى ئەدیبان لەعێراق )و (سەعد قاسم حەمودى سەرۆكى دەستەی ئامادەكارى سەندیكاى رۆژنامەنووسانى عێراق)و (یەكێتى گشتى سەندیكاكانى كرێكاران)و (سەندیكاى مامۆستایانى هەرێمى عێراق)و (سەندیكاى پارێزەران) بەجیا بروسكەی پیرۆزباییان بۆ دەسەڵاتدارانى عێراق رەوانە كرد[١٣٤]

---

كردووە. بۆ زانیاریى زیاتر بڕوانە: مەكتەبى ناوەندیى دیراسات و توێژینەوەی (پ.د.ك)، س پ، ل٢٤–٢٨ و ٩٤–١٠٢.

(١٣٣) "الثقافة الجديدة" ، ع(١٢)، ص٣٢٤–٣٢٥.

(١٣٤) سەبارەت بەو بروسكانە بڕوانە: وزارة الإعلام، أعياد السلام، مط الجمهورية، بغداد، (د.ت)، ص ١٩–٢٢.

## ب – لەسەر ئاستی دەرەوە:

راگەیاندنی بەیاننامەی ١١ی مارت هەروەك چۆن لەسەر ئاستی ناوخۆدا کاردانەوەو کاریگەریی دروستکرد، لەسەر ئاستی دەرەوەشدا بەشێوازی جیاجیا وەلامو کاردانەوەی جیاوازی لێکەوتەوە.

لەنێو ولاتە هەرێمییەکانیشدا، ئێران بەتووندی دژی ئەم بەیاننامەیە وەستایەوە، لەمەشدا دەزگا هەواڵگرییەکانی ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکیو دەزگاکانی ئیسرائیلی لەپشت بوو. هەروەها شای ئێران پێی وابوو، مستەفا بارزانی بەپێچەوانەی بەڵێنەکەی خۆی لە بەرانبەر ئێران(*) لەگەڵ دەسەلاتدارانی عێراق شەڕی راگرتووە، لەبەرئەوە شا لەلای خۆیەوە پەیمانیدا کە تۆڵەی خۆی لە رابەری شۆڕشی کورد بکاتەوە، ئەمەشی لەساڵی ١٩٧٥ لە رێککەوتننامەی جەزائیر(**) بەجێگەیاندو شۆڕش نسکۆی پێهات(١٣٥).

---

(*) لەکاتی گفتوگۆکانی نێوان رژێمی عێراقو شۆڕشی کورددا، دەسەلاتدارانی ئێران پەیوەندییان بە رابەرایەتی شۆڕشی کوردەوە کردبوو، تاکو لە رێککەوتن لەگەڵ فەرمانڕەوایانی عێراق، پاشگەزیان بکاتەوە. بڕوانە: مسعود البارزاني، البارزاني والحركة التحررية الكردية، ج٣، ص٢٣٦-٢٣٧.

(**) ئەم رێککەوتنە لەنێوان شای ئێران (محەمەد رەزا)و سەدام حسێن بە ئامادەبوونی سەرۆکی جەزائیر (هەواری بۆمدیەن) لە ٦ی مارتی ١٩٧٥ لە جەزائیر مۆرکرا بۆ کۆتایی پێهێنانی کێشە سنوورییەکانی هەردوو ولاتی عێراقو ئێران، لەو رێککەوتنەشدا شای ئێران بەرامبەر وەرگرتنی هەندێ بەشە زەوی سازشی لە پرسی کورد کردو پەیوەندییەکانی لەگەڵ شۆڕشی کورد کۆتایی پێهێنا، بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: باوەکر عوبێد سالح، س پ، ل٢٢٠-٢٢٣.

(١٣٥) الاتحاد الديمقراطي الكردستاني اللجنة التأسيسية، الثورة الكردية ١١ أيلول ١٩٦١-٦ آذار ١٩٧٥، مشروع البرنامج الوطني، آب١٩٧٥، ص٣٢

ئەوەی جێی سەرنجیشە لە هەندێ سەرچاوەدا باس لەوەکراوە کە ژمارەیەك لە رۆژنامەکانی ئێران بەپێچەوانەی هەڵوێستی دەوڵەت، پیرۆزباییان لە کورد کردووە بەبۆنەی سەرکەوتنیان لە بەدەستهێنانی دەسکەوتەکانی بەیاننامەی ١١ی مارت، لە هەمان کاتیشدا بەرانبەر رژێمی عێراق گومانی خۆیان دەربڕیوە لە جێبەجێکردنی بەیاننامەکە(١٣٦).

شایانی باسیشە لەناوخۆی ئێراندا دەسەڵاتداران لەلایەکەوە لەترسی کاریگەریی ئەنجامەکانی بەیاننامەی ١١ی مارت لەسەر کورد، لەلایەکی دیکەشەوە بەو مەبەستەی تارادەیەك ململانێ لەگەڵ فەرمانڕەوایانی عێراق بکەن، هەر بۆ رواڵەت هەندێ کاری ئاوەدانکردنەوەیان لە ناوچەکانی کوردستانی ژێر دەستیان ئەنجامدا، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا وازیان لە ئازاردانو دەسگیرکردنی خەڵکی نەهێنا(١٣٧). لەبەرئەوە دەتوانین بڵێین کاری ئاوەدانکردنەوەکەشیان تەنها بۆ چاوبەستو سەرنجڕاکێشانی خەڵکی بووە تاکو سیاسەتی نادادپەروەرانەی خۆیانی پێپەردەپۆش بکەن.

رژێمی تورکیاش لە بەرانبەر راگەیاندنی بەیاننامەی ١١ی مارت، بە توندی نارەزایی دەربڕی(١٣٨)، وەزیری دەرەوەشیان لەمیانی سەردانێکیدا بۆ بەغدا داوایکرد کە تورکمانەکانیش وەك کورد ئۆتۆنۆمییان پێبدرێت، بەڵام سەدام حسێن دوای راوێژکردنێك لەگەڵ کەسایەتی کورد فوئاد عارف لەسەر ئەو بابەتە، وەڵامی

---

(١٣٦) بڕوانە: جەمال نەبەز، کوردستانو شۆڕشەکەی، ل ٢١٣–٢١٤.

(١٣٧) عیسا پژمان، نهێنی یەکانی بەستنی پەیمانی ١٩٧٥ ئەلجەزائیر، م: ناسر ئیبراهیمی، سوید، ١٩٩٧، ل١٠٥.

(١٣٨) راپۆرتی کۆنگرەی دووەمی پارتی گەلی دیموکراتی کوردستان، سەرەرای سەختی کاروان بەرەو پێش دەچێت، چاپخانەی گەل، کوردستان، ئایاری ١٩٩٠، ل٦٧.

وەزیرەکەی تورکیای بەوە دایەوە: کە بەڵێ ئێمە رازین لە عێراقدا ئۆتۆنۆمی بە تورکمانەکان بدەین بەو مەرجەی ئێوەش ئۆتۆنۆمی بەو عەرەبانە بدەن کە لە ناوچەکانی ئەسکەندەروونە دەژین لە تورکیا، لەبەرئەوە وەزیری دەرەوەی تورکیا لە بەرانبەر ئەو وەڵامە بێ دەنگ بووو جارێکی دیکە قسەیان لەسەر ئەو بابەتە نەکرد[١٣٩].

لەناوخۆی تورکیاشدا، دەسەڵاتداران ترسی ئەوەیان هەبوو راگەیاندنی بەیاننامەی ١١ی مارت ببێتە هۆی بووژاندنەوەی بزاڤی رزگاریخوازی کوردستان لە تورکیادا، لەبەرئەوە لە ٨ی نیسانی ١٩٧٠دا ئابلۆقەی ناوچەی (سلیڤان)یانداو پتر لە ٣ هەزار کەسیان دەسگیر کرد. هەر لە هەمان ساڵو ساڵی دواتریش لە ناوچەکانی باتمانو بنگوڵو هەندێ شوێنی دیکە، شالاوی هاوشێوەیان ئەنجامدا[١٤٠].

رژێمی سوریاش کە وڵاتەکەیان دراوسێی عێراقەو بەشێکی کوردستانی لەژێر دەستدایە، دژی بەیانامەی ١١ی مارت هەڵوێستی نواندو لە ئێزگەی دیمەشقەوە بەتووندی هێرشی کردە سەر ئەو بەیاننامەیە[١٤١]. هەر بەوەندەش نەوەستا بەڵکو لە هەمان رۆژی راگەیاندنی بەیاننامەی ١١ی مارت دادگاییکردنی ١١ ئەندامی پارتی دیموکراتی کوردستانی سوریای راگەیاند، بە تاوانی بڵاوکردنەوەی پروپاگەندەی تێکدەرانەو وروژاندنی ململانێی ئەتنیکی[١٤٢].

(١٣٩) دیدار لەگەڵ فوئاد عارف، بەغدا، ٢٠٠٢/١٢/٦.

(١٤٠) احمد عبدالباقي، س پ، ل٦٩

(١٤١) جەمال نەبەز، کوردستانو شۆرشەکەی، ل٣١٠.

(١٤٢) امون غريب، س پ، ل١١٦.

دەتوانین بڵێین، دژ وەستانی هەریەك لە رژێمەکانی ئێران و تورکیاو سوریا بۆ ئەوە دەگەڕایەوە کە هەریەك لەم سێ وڵاتە بەشێکی خاکی کوردستانیان لەژێر دەستدایەو لە هەریەك لەم بەشانەش نەتەوەی کورد لە مێژوودا خاوەنی بزووتنەوەی سیاسیی خۆی بووەو سەرەڕای تایبەتمەندیی جیاوازی هەریەکەشیان، بەڵام بزووتنەوەی رزگاریخوازی کوردستان لەهەر پارچەیەکدا کاریگەریی بەسەر پارچەکانی دیکەوە هەبووە. لەبەرئەوە دوای راگەیاندنی بەیاننامەی ١١ی مارت فەرمانڕەوایانی ئێران و تورکیاو سوریا ترسی ئەوەیان هەبوو کە ئەم بارودۆخەی لە کوردستانی ژێر دەستی عێراقدا خوولقاوە، کاریگەریی بخاتە سەر پارچەکانی دیکەی کوردستان و بزووتنەوەی سیاسیی تێدا بە جموجۆڵ بخات بۆ سەندنی مافەکانیان. بۆیە دەسەڵاتدارانی هەرسێ وڵاتی ناوبراو لە بەرانبەر راگەیاندنی بەیاننامەی ١١ی مارتدا دژایەتی خۆیان نیشاندا.

سەرۆك کۆماری میسریش، سەرەڕای ئەوەی کە پێوەندیی وڵاتەکەی لەگەڵ رژێمی عێراق گەیشتبووە قەیران و بڕان، بەڵام لەسەر داوای پارتی دیموکراتی کوردستان بروسکەی پشتگیریی و پیرۆزبایی بەبۆنەی راگەیاندنی بەیاننامەی ١١ی مارت بۆ سەرۆك کۆماری عێراق نارد(١٤٣)

هەر بەهەمان بۆنەوە، هەریەك لە (جەعفەر محەمەد ئەلنومەیری)ی سەرۆك کۆماری سودانی دیموکراتیو (سەباح ئال سالم ئەلسەباح)ی میری کوێت و (عوسمان ئەلدنا)ی وەزیری دەنگوباسی لوبنان، بروسکەی پیرۆزباییان ئاڕاستەی

---

(١٤٣) مسعود البارزاني، البارزاني والحركة التحررية الكردية، ج٣، ص٢٤٧، بۆ دەقی بروسکەکەش بڕوانە: وزارة الاعلام مديرية الاعلام العامة، القضية الكردية اصداء الحل السلمي عربياً، مطابع الجمهورية، بغداد،١٩٧٠، ص٩.

سەرۆك كۆماری عێراق كرد[١٤٤]. (شێخ سەقەڕ كوڕی محەمەد ئەلقاسمی)ی فەرمانڕەوای میرنشینی (ڕەئس ئەلخەیمە)ش لەمیانی سەردانێكیدا بۆ بەغدا، لە كۆنگرەیەكی ڕۆژنامەوانیدا لە ٢٩ی حوزەیرانی ١٩٧٠، دڵنیان بەمافە نەتەوەییەكانی كوردی بەهەنگاوێكی پۆزەتیڤانە لەقەڵەمدا[١٤٥]. هەروەها (عارف زاهیر)ی یاریدەدەری سكرتێری گشتی كۆمەڵەی دەوڵەتە عەرەبییەكان، پیرۆزبایی خۆی لە دەسەڵاتدارانی بەغدا كرد[١٤٦].

هەروەها ڕێكخراوەكانی بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی فەڵەستینیش پێشوازییان لە بەیاننامەكە كرد، لەوانە ڕێكخراوی ڕزگاریخوازی فەڵەستینی و بەرەی میللی دیموكراتی بۆ ڕزگاری فەڵەستین[١٤٧].

لە وڵاتە جیاجیاكانی عەرەبییشدا، لێپرسراوانی عەرەب بەبۆنەی ڕاگەیاندنی بەیاننامەی ١١ی مارت لە لێدوانیان بۆ دەزگاكانی ڕاگەیاندن، خۆشحاڵی خۆیان دەربڕی[١٤٨]. لە بروسكەو لێدوانەكانی بەرپرس و سەرانی عەرەبدا وا دەردەكەوێت كە هۆی سەرەكی دڵخۆشیان بۆ چارەسەركردنی كێشەی كورد لە عێراقدا، ڕەخسانی زەمینەی ئامادەكردنی سوپای عێراق بووە بۆ شەڕی عەرەب دژی ئیسرائیل.

---

(١٤٤) بۆ دەقی هەرسێ بروسكەكە بڕوانە: وزارة الاعلام مديرية الاعلام العامة، القضية الكردية اصداء الحل السلمي عربياً، ص٩–١٠.

(١٤٥) "التآخي"، ع(٤٧٥)، ٣٠حزيران ١٩٧٠.

(١٤٦) "الجمهورية" (جريدة يومية سياسية)، ع(٧٢٢)، ١ نيسان ١٩٧٠.

(١٤٧) بڕوانە: ئەمون غریب، س پ، ل١١٤.

(١٤٨) بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: : وزارة الاعلام مديرية الاعلام العامة، القضية الكردية اصداء الحل السلمي عربياً، ص١١–١٣.

راگەیاندنی بەیاننامەی ١١ی مارت سنووری هەرێمیی و عەرەبیی تێپەڕاندو لە زۆر لای جیهانەوە کاردانەوەی لێکەوتەوە. زۆربەی حیزبە کۆمۆنیستەکانی جیهانیش پێشوازییان لەم هەنگاوە سیاسییە کردو هەندێکیان بروسکەو نامەی پیرۆزباییان ئاڕاستەی کاربەدەستانی عێراق و کوردستان کرد[١٤٩]. دیارە هۆی سەرەکی ئەو هەڵوێستەشیان لەوەوە بوو کە یەکێتی سۆڤیەت پشتگیری نواندبووو رۆڵی سەرەکیشی لە سەرخستنی گفتوگۆکانی نێوان شۆڕشی رزگاریخوازی کوردستان و حوکمەتی عێراقدا گێڕابوو.

لە ناوەڕاستی مارتی ١٩٧٠دا خودی (لیۆنید بریجنێف)ی سەرکردەی یەکێتی سۆڤیەت بەناردنی بروسکەیەك بۆ رابەری شۆڕشی کورد، بەیاننامەی ١١ی مارتی پیرۆز کرد[١٥٠] هەروەها لە بروسکەیەکدا بۆ سەرۆك کۆماری عێراق، (نیکۆلای بودگورنی)ی سەرۆکی دەستەی ئەنجوومەنی سەرۆکایەتی ئەنجوومەنی باڵای سۆڤیەتو (ئەلێکسی کۆسیجین)ی سەرۆك وەزیرانی یەکێتی سۆڤیەت، وێڕای پیرۆزکردنی بەیاننامەکە پێیان وابوو کە جێبەجێکردنیشی دەبێتە هۆی پتەوبوونی دۆستایەتی هەردوو گەلی کوردو عەرەبو بەدەستهێنانی سەرکەوتن لە گۆڕانی کۆمەڵایەتیو ئابووری لە عێراقدا[١٥١].

بەهۆی ئەو پێشوازییە گەرمەی یەکێتی سۆڤیەتو هاوپەیمانو دۆستانیان، وڵاتانی دیکەی وەك ئێرانو وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاو ئیسرائیل کە لەگەڵ سۆڤیەت ناتەبابوون، لە بەرامبەر ئەو بۆنەیەدا دژە هەڵوێستیان نیشاندا کە ئێران بە فەرمیی و وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و ئیسرائیلیش بە نافەرمیی دژی

---

(١٤٩) نەوشیروان مستەفا امین، پەنجەکان یەکتری ئەشکێنن، ل١٠٠-١٠١.

(١٥٠) بڕوانە: مسعود البارزاني، البارزاني والحركة التحررية الكردية، ج٣، ص٢٤٧.

(١٥١) بڕوانە: "الثقافة الجديدة"، ع(١٣)، آذار-نيسان-١٩٧٠، ص٣٢٦.

بوون[(١٥٢)]. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە جەنگی سارد[(*)]ی نێوان هەردوو کامپی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا کاریگەریی ڕاستەوخۆی لەسەر باری سیاسیی کوردستانیش هەبووەو خستویەتیە ژێر دەرهاویشتە نێگەتیڤەکانیەوە.

هەر لە میانی کاردانەوە دەرەکییەکاندا، سەرۆک و سکرتێری یەکێتی خوێندکارانی نێودەوڵەتی لە پراغ–چیکۆسلۆڤاکیا، بروسکەیەکی پیرۆزباییان ئاراستەی سەرۆک کۆماری عێراق کرد[(١٥٣)].

ئاشتیخوازانی جیهانیش، پێشوازییان لە ڕاگەیاندنی بەیاننامەی ١١ی مارت کردو بەم بۆنەیەوە سکرتاریەتی ئەنجوومەنی ئاشتی جیهانی، نامەیەکی پیرۆزباییان بۆ بزووتنەوەی ئاشتی عێراق نارد[(١٥٤)] هەروەها کۆنگرەی جیهانیی هێزەکانی ئاشتی کە لە مۆسکۆی پایتەختی یەکێتی سۆڤیەت لە ٢٥ تاکو ٣١ی تشرینی دووەمی ١٩٧٣ بەسترا، لەبارەی بەیاننامەی ١١ی مارتەوە بڕیارێکیان دەرکردو تیایدا پێشوازییان لە سیاسەتی حوکمەتی عێراق کرد لە چارەسەرکردنی کێشەی کورد لەسەر بنەمای ئۆتۆنۆمی[(١٥٥)].

---

(١٥٢) دیدار لەگەڵ دکتۆر مەحمود عوسمان، هەولێر، ٢٠٠٣/٩/٢٦.

(*) جەنگی سارد کێشەو ململانێی نێوان دوو دەوڵەت یان دوو جەمسەری نێو کۆمەڵگای نێودەوڵەتییە بێپەنا بردنەبەر بەکارهێنانی هێزی چەکداری لەلایەن هەریەکێکیانەوە، بەڵکو ململانێیەکی سیاسیی و ئایدۆلۆژیی و ڕاگەیاندنە، چونکە بە بەکارهێنانی شێوازی چەکداری لە ململانێدا، جەنگی سارد دەبێتە جەنگی گەرم. بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: نظام برکات وعثمان الرواف ومحمد الحلوة، مبادیء علم السیاسة، دار الرمل، عمان، ١٩٨٤، ص٣٣٣–٣٣٥.

(١٥٣) "النور"، ع(٤٢٥)، آذار ١٩٧٠.

(١٥٤) "الثقافة الجدیدة"، ع(١٢)، آذار–نیسان١٩٧٠، ص٣٢٨–٣٢٩.

(١٥٥) صلاح سعدالله، المسألة القومیة في العراق، ط١، مط هاوار، دهوك، ٢٠٠٢، ص١٠٤.

راگەياندنى بەياننامەى١١ى مارت رەنگدانەوەى لەسەر ميدياكانى دەرەوەش پەيداكردو بووە بابەتى گەلێك رۆژنامەو گۆڤارو ئێزگەى ئەو سەردەمە كە هەندێكيان ستايشيان كردو ژمارەيەكيشيان هێرشيان كردە سەرى[١٥٦]. هەروەها لە ماوەى نيسانو ئايارى ١٩٧٠ ژمارەيەكى زۆر لە رۆژنامەنووسانى عەرەبو ئەوروپىو ئەفريقىو ئاسيايى... رژانە نێو بارەگاى سەركردايەتى شۆڕشى كوردستان بۆ چاوپێكەوتنو وەرگرتنى زانياريى[١٥٧].

---

(١٥٦) بڕوانە: وزارة الاعلام مديرية الاعلام العامة، اصداء الحل السلمي عربياً، ل١٤-٤٨ ؛ جەمال نەبەز، كوردستانو شۆڕشەكەى، ل٣١٠-٣١٧.

(١٥٧) مسعود البارزاني، البارزاني والحركة التحررية الكردية، ج٣، ص٢٤٩-٢٥٠.

## تەوەرى چوارەم:

# هەڵسەنگاندنى بەياننامەى ١١ى مارت

بەياننامەى ١١ى مارت كە لە ئەنجامى خەباتى شۆڕشى رزگاريخوازى كوردستان بەديهاتووە، لە مێژووى نوێى كورددا شوێنێكى پڕبايەخى گرتووەو بەدەستكەوتێكى گەورەى سياسيى لەقەڵەمدراوە. هەڵبەت بايەخى ئەو بەياننامەيەش لەوەدابوو كە بۆ يەكەمجار لە بەڵگەنامەيەكى فەرميى و ياساييدا لەلايەن يەكێك لەو دەوڵەتانەى كە بەشێكى كوردستانى لەتكراوى پێوە لكێنراوە، لەچوارچێوەى ئۆتۆنۆميدا دان بە مافە نەتەوەيى و سياسييەكانى كورددا بنرێت. بێگومان ئەگەر رژێمى بەعس لە هەنگاوەكانيدا راستگۆ باو خۆى لە جێبەجێكردنى خاڵەكانى بەياننامەكە نەدزيبايەوە، دەبووە سەرەتايەكى رێخۆشكەر بۆ هێنانە كايەى ديموكراسيى لە سەرتاسەرى عێراقداو وڵاتەكەى دەكردە بنكەيەكى ئارام و مۆديلێكى نوێى پێكەوە ژيانى وڵاتێكى فرەنەتەوەيى لە رۆژهەڵاتى ناوەڕاست

لەڕووى ياساييەوەش، ئەو بەياننامەيە بايەخ و بەهاى خۆى هەبووو بنەماى ياسايى بۆ چارەسەركردنى پرسى كورد لەعێراقدا هێنا ئارا، كە لە خاڵەكانى دووەمو دەيەمو سێزدەهەمو بەشێكى چواردەهەمو پازدەهەمدا دارێژرابوو[١٥٨]

---

(١٥٨) بۆ زانياريى زياتر دەربارەى گرنگى بەياننامەكە لەڕووى ياساييەوە بڕوانە: محمد احمد عزيز الهماوندي، فكرة الحكم الذاتي والاقليات العرقية (دراسة تطبيقية في الوطن العربي) ، رسالة دكتوراه مقدمة الى كلية الحقوق– جامعة القاهرة، ١٩٨٥، ص٢٣٩–٢٤٢.

لەسەر ئاستی نێودەوڵەتیشدا، بەیاننامەی ١١ی مارت بەهۆی چاودێریو سەرپەرشتی راستەوخۆی یەکێتی سۆڤیەت لە دانوستانەکانی نێوان شۆڕشی کوردو حوکمەتی عێراق بۆ رێککەوتن، پڕ بایەخ بوو. ئەو رۆڵەی سۆڤیەتیش کە جەمسەرێکی بەهێزی ئەوسەردەمەی جیهان بوو، گەورەیی کێشەی کورد بەگشتییو کاریگەریی شۆڕشی مەزنی ئەیلول بەتایبەتی دەردەخات.

لەگەڵ باسکردنی لایەنە پۆزەتیفەکانیشدا، ناکرێ خۆمان لەخستنەڕووی کەموکوڕییو خاڵە نێگەتیفەکانی بەیاننامەی ١١ی مارت بەدوور بگرینو پاساویان بۆ بێنینەوە. چونکە لەو سەردەمەدا رژێمی فەرمانڕەوای عێراق بەهۆی ئەو تێکشکانە سەربازییانەی کە لەبەرانبەر هێزی پێشمەرگەی کوردستان دووچاری هاتبوو، کەوتبووە نێو بارودۆخێکی دۆڕاوو شپرزەوە. بۆیە ئەگەر سەرکردایەتی شۆڕشی رزگاریخوازی کوردستان لەمیانی دانوستانەکاندا وردبینتر باو شێلگیرانەتر پێی لەسەر تەواوی مافە سیاسییو نەتەوەییو کۆمەلایەتییو ئابوورییو رۆشنبیرییەکانی کورد داگرتایە، دەسکەوتی بەرفراوان دەهاتە بەرهەمو کەموکورتییەکانی بەیاننامەی ١١ی مارت کەمتر دەبووو رژێمی عێراقیش کە لەبەرانبەر شۆڕشی کورددا توانای شەڕکردنی نەمابوو، بەناچاریی لەئاست داواکانی شۆڕشی رزگاریخوازی کوردستاندا ملکەچ دەبوو.

جا لێرەدا، لەژێر رۆشنایی ئەوەی لەسەرەوە خستمانەڕوو، بەیاننامەی ١١ی مارت(*) هەڵدەسەنگێنین:

١– لەڕووی یاساییەوە ناتوانین ئەو بەڵگەنامەیە بە رێککەوتننامە ناو ببەین، چونکە تەنها بەناوی (ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش)ی عێراق دەرچووەو شێوەی بەیاننامەی وەرگرتووە. ئێمەش کە هیچ دەقێکی نووسراومان نەکەوتۆتە

(*) سەبارەت بەم بەیاننامەیە بڕوانە: پاشکۆی ژ(١).

بەردەست بەناوی ڕێککەوتننامەو بەواژۆو ناوی دوولایەن بڵاوکرابێتەوە، ناتوانین بە ڕێککەوتننامەی لەقەڵەم بدەین، بۆیە لە باسەکەماندا زاراوەی بەیاننامەمان بەکارهێناوە، نەك ڕێککەوتننامە.

هەر بەیاننامەیەك لەبارێکدا ئەگەر دوو لایەن واژۆیان لەسەر کردبێت ئەوا دەبێتە ڕێککەوتننامەو نیشانەی دان پێنانە بەیەکتری، بەڵام ئەگەر یەك لایەن بڵاوی کردبێتەوە ئەوا هەر هەمان لایەنیش لە چۆنیەتی جێبەجێکردنیدا سەرپشکە(١٥٩) ئەوەش ئەوە ناگەیەنێت کە سەرکردایەتی کورد هەوڵی نەدا ئەنجامی گفتوگۆکان بەناوی ڕێککەوتننامە یان بەیاننامەی هاوبەش بڵاوبکرێتەوە، لەکاتێکدا حوکمەتی عێراق وای بۆ دەچوو کە بەیاننامەی هاوبەش تەنها لەنێوان دوو دەوڵەتدا ئەنجام دەدرێت، نەك لەنێوان دەوڵەتێكو بزووتنەوەی سیاسیی ناوخۆی هەمان وڵات(١٦٠) بە هەرحاڵ، ئەو پاساوەی ڕژێمی عێراق ناچێتە ناو چوارچێوەی ڕاستییەوە. لەبەرئەوەی لەهەرشوێنێکی جیهاندا کۆتایی هێنان بە کێشەیەکی نەتەوەیی—سیاسیی خوێناوی، بە بەیاننامەی هاوبەشی نێوان لایەنە ناکۆکەکان دەسەلمێندرێ.

٢—شێوازی نووسینی پێشەکی بەیاننامەکە، جگە لە نیشاندانی مەیلی نەتەوەییانەی عەرەبو هەنگاوە تاکتیکییەکانی پێشتری بەعس بەرانبەر کورد هیچی دیکە نابەخشێ. ئەگەرنا، کورتە مێژوویەکی کێشەی ڕاستەقینەی کوردی لەعێراقدا تێدا تۆمار دەکرا. سەبارەت بەوە موحسین دزەیی دەڵێت: دوای

---

(١٥٩) د.مارف عومەر گوڵ، کێشەی کەسایەتی یاسایی نێونەتەوەیی گەلی کورد،چ١، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی، ١٩٩٩، ل٧٤.

(١٦٠) دیدار لەگەڵ مەسعود بارزانی، هاوینەهەواری سەری ڕەش، ٢٠٠٣/٦/٢٢؛ دیدار لەگەڵ دکتۆر مەحمود عوسمان، هەولێر، ٢٠٠٣/٨/١٦.

تەواوبوونی گفتوگۆکانو ڕێککەوتن لەسەر خاڵەکانی بەیاننامەی ١١ی مارت، شاندی حوکمەت پێیگوتین: دەبێ ئەو بەیاننامەیە پێشەکییەکی بۆ بنووسرێتەوە جا ئێوە رازی دەبن ئێمە بینووسینەوە؟ ئێمەش گوتمان: بەڵێ. بەڵام ئێمە نەمان دەزانی پێشەکییەکە بەو چەشنە دادەرێژن[١٦١]. ئەوەش دڵسافیی و بێئاگایی سەرکردایەتی کورد بەرانبەر دوژمنانی نیشاندەدات.

٣– بەپێی خاڵی (١) ی بەیاننامەکە، نایەکسانییەك لەنێوان بەکارهێنانی هەردوو زمانی کوردیو عەرەبی لە قوتابخانەکاندا نیشان دراوە. زمانی عەرەبی لە هەموو قوتابخانە کوردییەکاندا لەپاڵ زمانی کوردییدا سەپێنراوە. بەڵام خوێندنی زمانی کوردی لە ناوچەکانی تری عێراق وەك زمانی دووەمو بەو ئاستەی کە یاسا دیاری دەکات دانراوە.

٤– لە خاڵی (٥)ی بەیاننامەکە، دان بەوە نراوە کە قوتابیانو لاوانو ئافرەتانو مامۆستایانی کورد، بۆیان هەیە ڕێکخراوی تایبەت بە خۆیان پێکەوە بنێنو ببنە ئەندامی ڕێکخراوە عێراقییەکانی هاوچەشنی خۆیان. هەڵبەتە بەعس لە بەئەندامبوونی ئەو ڕێکخراوە کوردستانییانە لە ڕێکخراوە عێراقییەکاندا، مەبەستی ئەوە بوو کە لەلایەکەوە ئەوان لە ڕێگەی ئەو پێکەوە بەستنەوەیە بە ئاسانی بتوانن کاری خۆیان لە ناو ئەو توێژانەی کورد ئەنجام بدەن. لەلایەکی تریشەوە، زیاتر ئاگاداری جموجۆڵو چالاکییەکانی ئەو توێژانەبنو سەربەستیی کارکردنیان لێکەمبکەنەوە. ئەگینا دەبوایە ئەو ڕێکخراوە کوردییانە وەك چۆن پێشتر هەوڵیان دابوو ببنە ئەندامی ڕێکخراوە جیهانییە هاوچەشنەکانیان، خۆیان بەشێوەیەکی ئارەزوومەندانە، داوای بە ئەندامبوونیان بکردایە لە ڕێکخراوە عێراقییەکان، نەك دلوای حوکمەتی عێراق بکرایە مەرجێك بۆ بەیاسایی بوونیان.

---

(١٦١) دیدار لەگەڵ موحسین دزەیی، هاوینەهەواری سەلاحەددین، ٢٠٠٣/١١/٩

٥- بەپێى خاڵى (٦-أ)ى بەياننامەكە درێژە دەدرێ بەهەردوو برگەى (١و٢)ى بڕيارى ژمارە (٥٩)ى بەروارى ١٩٦٨/٨/٥ى (ئەنجومەنى سەركردايەتى شۆڕش)ى عێراق، كە برگەى (١)ى تايبەتە بە لێبوردنى گشتيى بەشدار بووانى ڕووداوەكانى باكوور(مەبەست لە كوردستانە)[١٦٢] ديارە بەپێى ئەم برگەيە، بەعسييەكان بەشداربووانى شۆڕشى كورديان بە (تاوانبار!) بەرانبەر ڕژێمەكەيان لە قەڵەمداوەو بڕيارى لێبوردنيان بۆ دەركردوون. بێگومان دووپات كردنەوەى ئەو بڕيارە لە خاڵى (٦)ى بەياننامەى ١١ى مارت، سووكايەتى كردنێكى گەورە بوو بە بزووتنەوەى ڕزگاريخوازى كوردستان، كە لەپێناو بەدەسهێنانى مافە نەتەوەييە ڕەواكانى كوردو ديموكراسيەت بۆ عێراقو ڕەتكردنەوەى زۆردارىو تاوانكاريى ڕژێمەكانى عێراق، لە سەنگەرى خەباتو بەرگريكردن دابووە، لەكاتێكدا كە ئەو ڕژێمە بەدواى يەكتر هاتووانەدا، لەڕێگەى سوپاو دەزگا سەركوتكەرەكانيانەوە، خاكى كوردستانيان داگيركردووەو گەلەكەيان بندەست كردووە. لەبەرانبەريشدا پێشمەرگەى كورد، دوور لە دەستدرێژيكردنە سەر خاكو ماڵى خەڵكى ديكە، بلێرلنە بەرگرييان لە خاكو گەلەكەيان كردووە. لەم بارەشدا ڕژێمى عێراق بە تاوانبار دادەنرێ، نەك بەشداربووانى شۆڕشى كورد. بۆيە سەركردايەتى شۆڕشى ڕزگاريخوازى كوردستان بەهيچ شێوەيەك نەدەبوو بەخاڵى (٦-أ)ى بەياننامەى ١١ى مارت رازى بێت.

٦- گەورەترين كەموكورتى بەياننامەى ١١ى مارت ئەوەبوو كە دەست نيشانكردنى سنوورى ناوچەى ئۆتۆنۆميى، بەپێى خاڵى (١٤)ى بەياننامەكە، پلەبەند بوو بە ئەنجامدانى سەرژمێرييەكى فەرميى دواى ڕاگەياندنى بەياننامەكە.

---

(١٦٢) سەبارەت بەبڕيارى ناوبراو بڕوانە: الجمهورية العراقية، القرارات العامة لمجلس قيادة الثورة ١٩٦٨-١٩٧٧، المجلد الاول، ص٥٩٤.

ئۆتۆنۆمییش کە بریتییە لە: "سیستەمێکی ناسەنترالّیی، بنیادنراو لەسەر دان پێنانی هەرێمێکی نەتەوەیی یان ئەتنیکیی جیاواز–بەسەربەخۆ بوونی لە کارگێریی کاروبارەکانی لەژێر سەرپەرشتیی‌و چاودێری دەسەلاتی ناوەندیی"[١٦٣] و یەکێك لە توخمە بنەڕەتییەکانیشی، بوونی ناوچەیەکی جوگرافیی سنوورداره لەڕووی نەتەوەییەوە، کە دامودەزگاکانی ئۆتۆنۆمیی (فەرمانڕەوایی‌و کارگێڕیی) تیایدا دەسەلاتدار بن[١٦٤]. لەبەرئەوە، پێویست بوو سەرکردایەتی کورد، دیارکردنی سنووری جوگرافیی ناوچەی ئۆتۆنۆمیی بکردایە مەرجی حاشا هەلّنەگرو دوانەخراوی بەرایی راگەیاندنی بەیاننامەی ١١ی مارت. کەواتە دەتوانین بلّێین ئەو ئۆتۆنۆمییەی نەتەوەی کورد، لە بۆتەیەکی شەخسییدا دارێژرا بوو، نەك هەرێمیی. کە شێوەی یەکەمیان دەدرێ بەو کەمینە نەتەوەیی یان رۆشنبیری یان ئەتنیکییانەی بەهۆی بارودۆخێکی مێژوویی بە پەرش‌و بلاوی لێرەو لەوێی ناوچەو هەرێمی دەولّەتێکدا دەژین، بێ ئەوەی لە ناوچە یاخود هەرێمێکی دیاریکراو نیشتەجێ بووبن. هەرچی شێوەی دووەمیانە بە خاکو دانیشتوانی ئەو کەمە نەتەوەیە دەدرێ کە لە هەرێمێك یان ناوچەیەکی دیاریکراوی ناو دەولّەتێکدا نیشتەجێن[١٦٥]. دوای راگەیاندنی بەیاننامەکەش سەدام حسێن لەدیداری پەیامنێرێکی رۆژنامەی (لۆمۆند)ی فەرەنسی گوتبووی: "حوکمەتی

---

(١٦٣) د.محمد هماوند، الفدرالية والحكم الذاتي واللامركزية الادارية الاقليمية (دراسة نظرية مقارنة)، ط٢، مط وزارة التربية، اربيل، ٢٠٠١،ص٣٦.

(١٦٤) هـ س، ل١٠٠.

(١٦٥) بۆ زانیاریی زیاتر دەربارەی هەردوو شێوەی ئۆتۆنۆمی بڕوانە: د.عبدالعليم محمد، مفهوم الحكم الذاتي في القانون الدولي (دراسة مقارنة لبعض الانماط والمشكلات)، مطبوعات مركز الدراسات السياسية والاستراتيجية بالاهرام، ١٩٩٤، ص١٦٤.

عێراق و حیزبی بەعس ئۆتۆنۆمییان بە خەڵك داوە، نەك بەخاك"[١٦٦] بەمەش پەردەی لەسەر سیاسەتی شاردراوەی خۆیان هەڵماڵی.

شایانی باسە رژێمی بەعس پێشتریش هەوڵی دابوو دەسکاریی سنووری جوگرافی کوردستان بکات. بەڵگەش، دەرکردنی بڕیارێك بوو لە ٢٧ی ئایاری ١٩٦٩ بۆ دامەزراندنی پارێزگایەکی نوێ بەناوی دهۆك، کە لە یەکخستنی قەزاو ناحیە کوردییەکانی سەر بە پارێزگای موسڵ پێکهێنرا[١٦٧]. لێرەدا نابێ نکوولیی لەوەش بکەین کە دامەزراندنی پارێزگای دهۆك داخوازییەکی لەمێژینەی جووڵانەوەی رزگاریخوازی کورد بووە، بەڵام دەتوانین بڵێین رژێمی بەعس ئەو بڕیارەی دەرکرد بەو مەبەستەی لەلایەکەوە سیمای کوردبوونی شاری موسڵ[*] بگۆڕێت، یان بیسڕێتەوە، لەلایەکی دیکەشەوە خۆی ئامادەبکات بۆ هەر ئەگەرێکی داهاتوو تاکو لەکاتی دانوستان لەگەڵ شۆڕشی رزگاریخوازی کوردستان، گفتوگۆ لەسەر کوردێتیی شاری موسڵ نەکرێت. ئەو نیازەشیان، لە گفتوگۆکانی ساڵی ١٩٧٠دا بۆ مەیسەر بوو.

٧– هەر بەپێی خاڵی (١٤)ی بەیاننامەکە، بەکارهێنانی سامانی سروشتیی ناوچەی ئۆتۆنۆمیی خراوەتە ناو چوارچێوەی دەسەڵاتی کۆماری عێراق. بەو

---

(١٦٦) وەرگیراوە لە: عەبدوڵڵا کەریم مەحمود، رەشەبای ژەهرو ئەنفال، ب٢، چ١، لەبڵاوکراوەکانی وەزارەتی رۆشنبیری، سلێمانی، ٢٠٠٣، ل١٦.

(١٦٧) سەبارەت بەو بڕیارە بڕوانە: الجمهورية العراقية، القرارات العامة لمجلس قيادة الثورة(١٩٦٨–١٩٧٧)، المجلد الثاني، ص٥٠٥.

(*) سەبارەت بە کورد بوونی شاری موسڵ بڕوانە: د.خليل اسماعيل محمد، اتجاهات الاستيطان العربي في محافظة نينوى واثره على التكوين القومي للسكان، "متين" (مجلة سياسية– ثقافية)، ع (١٢٥)، حزيران ٢٠٠٢. ص٩١–١٠٣.

شێوەیەش گەلی کورد لەدانانی نەخشەی ئابووریی کوردستانو ناوچەکانی تری عێراق هیچ دەسەڵاتێکی بەرنەکەوت. دەرەنجامیش ناوچەی ئۆتۆنۆمیی لە سەرچاوە داراییەکان بێبەش بوو. ئاشکراشە کە یەکێك لە کۆڵەگە بنەڕەتییەکانی سیستەمی ئۆتۆنۆمی، سەربەخۆیی هەرێمی ئۆتۆنۆمییە لە دەوڵەت، لەرووی داراییەوە، واتا لە رەفتارکردن بە سەرچاوە داراییەکان[١٦٨] سەرکەوتنی دەسەڵاتی خۆجێییش لە زۆرترین سوودمەندیی بەکاربردنی سەرچاوە داراییەکانی هەرێمەکەی دەبێتە هۆی پتەوکردنی قەوارەی ئۆتۆنۆمیی، لە ڕێگەی جێبەجێکردنی پرۆژەی کۆمەلایەتیو خزمەتگوزاریی ناوخۆیی. نەك هەر ئەوەندە، بەڵکو بە پێی یاسا بنەڕەتییەکانی کارگێریی ناسەنتەراڵی پێویستە هەرێمەکە خاوەن بودجەی داهاتو خەرجیی سەربەخۆ بێ لە بودجەی گشتی[١٦٩]

جا لەژێر تیشکی ئەو باسەی سەرەوە، دەبوایە سەرکردایەتی شۆرشی کورد بە ناوەرۆکی خاڵی (١٤)ی بەیاننامەی ١١ی مارت رازی نەباو سووربا لەسەر دەسەڵاتپێدان بۆ بەکارهێنانی سامانی سروشتیی خاکی کوردستان، وەك سەرچاوەیەکی دارایی.

٨- شێوازی دارشتنی بەیاننامەی ١١ی مارت، رەنگرێژی تێڕوانینی رەگەزپەرستانەی بەعس بوو، کە هەرگیز ئامادە نەبوو وەك نیشتمانی کورد ناوی کوردستان بێنی، بەڵکو لەجیاتی وشەی کوردستان، چەند زاراوەیەکی وەك (شمال العراق/ باکووری عێراق)و (المنطقة الكردية/ ناوچەی کوردی)یان بەکارهێناوە.

(١٦٨) د.محمد الهماوند، الفدرالية والحكم الذاتي، ص١٥٧.

(١٦٩) عادل حسين شبع، الحكم الذاتي اسسه النظرية والتطبيق، رسالة ماجستير مقدمة الى كلية القانون والسياسة، جامعة بغداد، ١٩٧٧، ص١٨٥.

هەر دوای راگەیاندنی بەیاننامەکەش بە چەند رۆژێك، رژێمی بەعس پەردەی لەسەر رووی راستەقینەی خۆی هەڵماڵی‌و لەزمانی سەرکردەیەکی بەعسەوە راگەیەندرا: "دەستووری پاشەرۆژ دان بەوە دادەنێت کە عێراق بەشێکە لە نەتەوەی عەرەب‌و گەلی عێراقیش بە عەرەب‌و کوردییەوە، بەشێکە لە نەتەوەی عەرەب"[١٧٠] ئەوەش لە دەستووری کاتییدا، کە لە ١٦ی تەمووزی ١٩٧٠ دەرچوو، بڕیاری لەسەر دراو بەپێی ماددەی (٥)، عێراقیان بە بەشێك لە نەتەوەی عەرەب لە قەڵەمدا[١٧١]

٩– لە بەیاننامەی ١١ی مارتدا، بزووتنەوەی رزگاریخوازی کوردستان نەیتوانی دانانی چەند ئەندامێکی کورد لە (ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش)ی عێراقی مسۆگەر بکات، ئەگەرچی لە گفتوگۆکانی بەر لە راگەیاندنی بەیاننامەکە، شاندی کوردیی ئەو مەبەستەی یاداشت کردبوو، بەڵام حوکمەتی عێراق داوایەکەی رەت کردبۆوە، چونکە حوکمەتی عێراق هەر لە سەرەتاوە پێی وابوو کە جگە لە بەعسییەکان، کەسی دیکە بۆی نییە ببێتە ئەندامی ئەو ئەنجومەنە[١٧٢]. پاشان هاتنە سەر ئەو باوەڕەی کە ئەگەر ئیدریس بارزانی پۆستی جێگری سەرۆك کۆمار وەربگرێت، کە بەپێی خاڵی ١٢ی بەیاننامەکە دەبوو یەکێك لە جێگرەکانی سەرۆك کۆمار کورد بێت، ئەوا ناوبراو دەبێتە ئەندامیش لە (ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش)ی عێراق. بەڵام لەبەر ئەوەی مستەفا بارزانی رازی نەبوو کە کوڕەکانی

---

(١٧٠) وەرگیراوە لە: جەمال نەبەز، کوردستان‌و شۆرشەکەی، ل٣٢٧.

(١٧١) بڕوانە: "الوقائع العراقية"، ع(١٩٠٠)، ١٩تموز١٩٧٠.

(١٧٢) دیدار لەگەڵ مەسعود بارزانی، هاوینەهەواری سەری رەش، ٢٠٠٣/٦/٢٢؛ دیدار لەگەڵ دکتۆر مەحمود عوسمان، هەولێر، ٢٠٠٣/٩/٢٦.

پایـەی بـەڕێوەبردن لـە دەوڵـەت وەربگـرن، ئیـدی کـورد نـەیتوانی بـچێتە نـاو (ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش)ی عێراق[١٧٣]

١٠- لـە بەیاننامـەی ١١ی مارتـدا کێـشەی فەیلییـەکان و ئێزیدییـەکان بـە چارەسەرنەکراوی مایەوە، کە بەعسییەکان یەکەمیانیان بە ئێرانیی و دووەمیـشیان بە عەرەب دادەنا[١٧٤] بەڕای مەسعود بارزانی، بەر لە ڕاگەیاندنی بەیاننامەی ١١ی مارت ئەو کێشانە لە ئارادا نـەبوون، بۆیـە لـە گفتوگۆکانیـشدا باسیان لێوەنـەکرا، بـەڵکو کێـشەکە دوای ڕاگەیانـدنی بەیاننامەکـە سـەریهەڵدا[١٧٥] کەچـی بەگوتـەی دکتـۆر مـەحمود عوسمـان، شـاندی کـوردیی لەگفتوگۆکانـدا جـەختی لەسـەر چارەسەرکردنی ئەو کێشەیە کردووە، بەڵام حوکمەتی بەعس لەسەر ڕاو تێڕوانینی خـۆی سـوور بـووەو ئامادەنـەبووە چارەسـەریان بکـات[١٧٦]. ماوەیـەکیش دوای ڕاگەیانـدنی بەیاننامـەی ١١ی مـارتی ڕژێمـی بـەعس دەسـتی کـرد بەڕاگواسـتنی ژمارەیەکی زۆری فەیلییەکان بۆ ئێران[*].

١١- دروشمی شۆڕشـی ئـەیلول کـە (دیموکراسـی بـۆ عێـراق و ئۆتۆنـۆمی بـۆ کوردستان)[**] بوو، بـەپێی بەیاننامـەی ١١ی مـارت بەشـێکی کـەمی لێ بەدەسـت هێنرا. ئۆتۆنۆمیی کە بەشێکی دروشمەکە بوو بەو ناکامڵییەی لێی دواین، هاتەدی.

(١٧٣) دیدار لەگەڵ مەسعود بارزانی، هاوینەهەواری سەری ڕەش، ٢٠٠٣/٦/٢٢.

(١٧٤) نەوشیروان مستەفا ئەمین ، پەنجەکان یەکتری ئەشکێنن، ل١٠٢

(١٧٥) دیدار لەگەڵ مەسعود بارزانی، هاوینەهەواری سەری ڕەش،٢٠٠٣/٦/٢٢.

(١٧٦) دیدار لەگەڵ دکتۆر مەحمود عوسمان، هەولێر، ٢٠٠٣/٩/٢٦

(*) لە تەوەری یەکەمی بەشی سێیەمی باسەکەمان زیاتر لەم بابەتە دواوین.

(**) ئەو دروشمە بۆ یەکەم جار لایەن ڕێکخراوی پارتی دیموکراتی کوردستان لـە ئـەورووپا لـە سەرەتای ساڵی ١٩٦٢، بەرز کرایـەوە. بڕوانـە: د. کـەمال فوئـاد، کۆمەڵـە و ڕێکخـراوە کوردییەکان لە ئەورووپا، چاپخانەی کاکەی فەللاح، سلێمانی، ١٩٧٢، ل٢٠.

بەڵام بەشی سەرەکیی دروشمەکە (دیموکراسی بۆ عێراق)، بەتەواویی لەلایەن رژێمی بەعسەوە رەتکرایەوە، بەو بیانووەی گوایە ئەوان حیزبێکی شۆڕشگێڕن و لە رێگەی شۆڕشەوە دەسەڵاتیان گرتۆتە دەست و باوەڕیان بە دیموکراسیەت نیەو دیموکراسیەت و هەڵبژاردن، دەسەڵات بەو کۆنەپەرستانە دەسپێرنەوە کە پێش خۆیان حوکمڕان بوون[١٧٧]. هەرچەندە لە هەندێ سەرچاوە ئاماژە بەوە کراوە کە یەکێك لە ئەندامانی شاندی کوردیی لە گفتوگۆکاندا پشگیریی لەو رایەی بەعسییەکان کردووە، بەو پێیەی کە (پ.د.ك)یش حیزبێکی شۆڕشگێڕەو لەبنەڕەتدا باوەڕی بە دیموکراسیەت نیەو ئەو پرەنسیپە تەنیا بۆ مەبەستێکی تاکتیکیی و لەبەر هەندێ هۆکاری پێوەندیدار بە قۆناغەکە خراوەتە ناو بەرنامەی حیزبەکە[١٧٨]، بەڵام لەلایەکەوە هەندێ لە ئەندامانی شاندی کوردیی گفتوگۆکانی ساڵی ١٩٧٠ نکووڵیی لەم رایەی دوایی دەکەن[١٧٩]. لەلایەکی دیکەشەوە هەر دوای راگەیاندنی بەیاننامەی ١١ی مارت یەکێك لەو پرسانەی کە لە میدیاکانی پارتی بەتایبەتیش لە هەردوو رۆژنامەی (التآخي)و (برایەتی) بایەخی پێدرا، پرسی دیموکراسیەت بوو.

شایانی باسە هەندێ لە هێزو لایەنە سیاسییەکانی عێراقیش لە میانی ئەو یاداشتەی کە لە ٥ی نیسانی ١٩٧٠دا بۆ سەرۆك کۆماریان ناردبوو، بەیاننامەی

---

(١٧٧) دیدار لەگەڵ دکتۆر مەحمود عوسمان، هەولێر، ٢٠٠٣/٩/٢٦؛ سعید عبدالوهاب، لماذا تبقى الحقائق مكتومة عن الشعب الكردي، ط٢، (د.مط)، ١٩٧٨. ص٢٨؛ نەوشیروان مستەفا ئەمین، پەنجەکان یەکتری ئەشکێنن، ل١٠١.

(١٧٨) سعید عبدالوهاب، س پ، ل٢٩.

(١٧٩) دیدار لەگەڵ دکتۆر مەحمود عوسمان، هەولێر، ٢٠٠٣/٩/٢٦؛ دیدار لەگەڵ موحسین دزەیی، هاوینەهەواری سەلاحەددین، ٢٠٠٣/١١/٩.

١١ی مارتیان بە بەراورد لەگەڵ هەنگاوەکانی پێشتری حوکمەتە یەك لەدوای یەکەکانی عێراق بە هەنگاوێکی گەورە لەقەڵەمدا بوو، لەگەڵ ئەوەش پێیان وابوو کە چارەسەری تەواوەکی کێشەی کورد بە دیموکراسیەتەوە بەندەو دیموکراسیەتیان بە تاکە دەروازەی چارەسەرکردنی کێشەکانی وڵات زانی، بۆیە وای بۆچووبوون، کە بەبێ چارەسەرکردنی گرفتی رژێمی حوکم کە بەرقەرارکردنی دیموکراسیەتە، ناتوانرێت وڵات لە ناسەقامگیری سیاسیی‌و مەینەتیەکان، بەدووربخرێ[١٨٠].

١٢– بەیاننامەی ١١ی مارت کە یەك لایەنە لەلایەن (ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش)ی عێراق راگەیەندرا، لەرۆژنامەی (الوقائع العراقیة) کە رۆژنامەی فەرمیی کۆماری عێراق بوو بڵاوەکرایەوە. ئەوەش خاڵێکی گرنگ بوو، کە دەبوایە سەرکردایەتی کورد هەر زوو رەخنەی لێگرتبا. ئاشکراشە کە رۆژنامەی ناوبراو زۆربەی بەیاننامەو بڕیارەکانی دەسەڵاتدارانی دەوڵەتی تێدا بڵاودەکرایەوە، بۆیە بڵاوەکردنەوەی بەیاننامەی ١١ی مارت لەو رۆژنامەیەدا بەدنیازیی‌و ناڕاستگۆیی بەعس بەرانبەر بە کوردو کێشە ڕەواکەی نیشان دەدات.

١٣– هەرچەندە لە پێشەکییەکەی بەیاننامەی ١١ی مارتدا هاتووە کە (ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش)ی عێراق پێوەندیی بە سەرکردایەتیی مستەفا بارزانی سەرۆکی پارتی دیموکراتی کوردستانەوە کردووەو بیروڕایان ئاڵوگۆڕ کردووەو هاتوونەتە سەر بڕوای پەسەندکردنی ناوەرۆکی بەیاننامەکەو جێبەجێکردنی، کەچی لە هیچ کام لە پێشەکی بەیاننامەکەو بەندەکانیشیدا داننەنرابوو بەوەی کە بزووتنەوەی رزگاریخوازی کوردستان نوێنەرایەتی گەلی کورد دەکات لە عێراقدا. ئاشکراشە ئەو دانپێدانانە، رەوایی زیاتری بەو

(١٨٠) بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: پاشکۆی ژ(٢).

بزووتنەوەیە دەبەخشی‌و هەرگیز رژێمی بەعس، تەنانەت بە قسەش نەیدەتوانی گەلی کوردو بزووتنەوەکەی لە یەکتر جیابکاتەوە، بەڵکو دەبووە بەربەستێك لەبەردەم هەوڵەکانی دەسەڵاتدارانی عێراق بۆ دروست کردنی پارت‌و رێکخراوی کارتۆنی سیاسیی بەناوی کوردەوە دژی بزووتنەوەی رزگاریخوازی کوردستان، هەروەك دواتر لە وێنەی پارتی شۆڕشگێڕی کوردستان[(١٨١)] و پێکهێنانی پارتێك بەناوی پارتی دیموکراتی کوردستان لەو کەسانەی ریزەکانی بزووتنەوەی رزگاریخوازی کوردستانیان جێهێشتبووو لە سەنگەری دژە شۆڕشدا بوون، ئەنجامیدا[(١٨٢)].

---

(١٨١) ئەو پارتە لە ناوەڕاستی کانوونی دووەمی ١٩٧٣ یەکەم بەیاننامەی بەناوی لیژنەی ئامادەکردنی پارتی شۆڕشگێڕی کوردستان بلاوکردەوەو لیژنەی ئامادەکردنیش پێکهاتبوو لە: (عەبدولستار تاهیر شەریف، عەبدولجەبار تاهیر، عەبدوڵڵا ئیسماعیل، عەبدوڵڵا عەلی کانی مارانی، بابەکر مەحمود پشدەری، لەتیف بەرزنجی، شەوقی حەمەخان ، عەبدوڵڵا هەمزە ، خورشید رەواندزی، سەعید جاف) بۆ زانیاریی زیاتریش دەربارەی ئەم پارتە بڕوانە: عبدالستار طاهر شریف، موجز تاريخ الحزب الثوري الكردستاني، مط المنشأة العامة لنقل الركاب في مدينة بغداد، بغداد، ١٩٧٧، ص٤٥-٥٣.

(١٨٢) ئەو پارتەش لەلایەن عەزیز ئاکرەیی‌و هاشم ئاکرەیی‌و ئیسماعیل مەلا عەزیز بەڕێوە دەبردرا کە هەرسێکیان لەناو شۆڕشی کورددا لێپرسراوێتی بەرزیان هەبوو کە یەکەمیان ئەندامی مەکتەبی سیاسیی‌و دوانەکەی تریش ئەندامی کۆمیتەی ناوەندیی (پ.د.ك) بوون، بەلام لەساڵی ١٩٧٣ لە (پ.د.ك) جیابوونەوەو بەهەمان ناوو بە پاڵپشتی دەسەلاتدارانی عێراق پارتێکیان دامەزراند، دوای دەستپێکردنەوەی شەڕیش لەساڵی ١٩٧٤(لەنێوان رژێمی بەعس‌و شۆڕشی رزگاریخوازی کوردستان) ئەم دەستەیە لە بەغدا رۆژنامەیەکی کوردییان بەناوی (برایەتی) دەردەکرد، کە لە لاپەڕەکانیدا پشگیری رژێمی عێراقیان دەکردو هێرشیان دەکردە سەر شۆڕشگێڕانی کوردستان.

١٤– له گفتوگۆکانی نێوان سەرکردایەتی شۆڕشی کوردستان‌و رژێمی بەعس، ماوەی چوار ساڵ دانرابوو بۆ جێبەجێکردنی خاڵەکانی بەیاننامەی ١١ی مارت[(١٨٣)] دانانی ئەو ماوە درێژە لە کەموکوڕییە بەرچاوەکانی بەیاننامەکە بووو پێڕازیبوونی سەرکردایەتیی شۆڕشی رزگاریخوازی کوردستانیش هەڵەیەکی گەورە بوو، چونکە مەبەستی بەعسییەکان لە دانانی ئەو چوار ساڵە، سوود وەرگرتن بوو لە کات بەسەربردن‌و خۆ مەڵاسدان بۆ رەگاژۆکردن‌و بەهێزکردنی کورسیی حوکمڕانیی، پاشانیش پاشگەز بوونەوە لە جێبەجێکردنی خاڵەکانی بەیاننامەکە. رۆژگاریش ئەو راستییەی سەلماند.

لەم پرسەشدا سیاسەتمەدارانی کورد جیاڕان. بۆ نموونە، مەسعود بارزانی پێیوایە کە دانانی چوار ساڵەکە هەرچەندە کەموکوڕییەکی بەیاننامەکە بوو، بەڵام ئیشتباهێك بووو کاریگەریی رۆڵی یەکێتی سۆڤیەت وای لە سەرکردایەتی شۆڕشی کوردستان کرد ئەو سازشانە بکات[(١٨٤)]، هەرچی مەحمود عوسمانیشە دەڵێت: ئێمە لە گفتوگۆکانماندا لەگەڵ دەسەڵاتدارانی عێراق، سوور بووین لەسەر یەکسەر جێبەجێکردنی خاڵەکانی بەیاننامەکە، بەڵام ئەوان واتە دەسەڵاتدارانی عێراق، پێیان وابوو کە بەجێهێنانە کارگێرییەکان‌و گۆڕینی بارودۆخ‌و یاساکان‌و باوەڕ پێهێنانی وڵاتانی عەرەبیی ماوەی هەشت ساڵیان پێویستە. ئیتر گفتوگۆی زۆر سەبارەت بە ماوەدانان کرا کە ئەوان هەر لەسەر رای خۆیان سوور بوون. بەڵام دواتر بە ناوبژیی یەکێتی سۆڤیەت‌و میسرو عەزیز شەریف‌و دۆستانی تر، وەك چارەسەرێکی مامناوەند ماوەی چوار ساڵ پەسەند کرا[(١٨٥)]

---

(١٨٣) دیدار لەگەڵ دکتۆر مەحمود عوسمان، هەولێر، ٢٦/٩/٢٠٠٣.

(١٨٤) دیدار لەگەڵ مەسعود بارزانی، هاوینەهەولری سەری رەش، ٢٢/٦/٢٠٠٣.

(١٨٥) دیدار لەگەڵ دکتۆر مەحمود عوسمان، هەولێر، ٢٦/٩/٢٠٠٣.

١٥– بەياننامەى ١١ى مارت، دوازدە خاڵى نهێنيى‌و رانەگەيەنراوى لەخۆ گرتبوو[١٨٦]. هەرچەندە ئاشكرانەكردنى ئەم خاڵانە لەسەر داواى رژێمى عێراق بوو[١٨٧]، كە بەدنيازيى بەعسييەكان لە بەرانبەر چارەسەركردنى كێشەى كورددا نيشان دەدات. خاڵى يازدەمى پاشكۆ نهێنى يەكەش، بەڵگەيەكى زەقى ئەو بەدنيازييە بوو، كە بەپێى ناوەرۆكى ئەم خاڵە هەردوولا، واتە ئەندامێكى (ئەنجومەنى سەركردايەتى شۆڕش)ى عێراق‌و نوێنەرى كورد (مستەفا بارزانى)، تەنيا يەك وێنەى واژۆ دەكەن، كە ئەويش لاى سەرۆك كۆمار دەپارێزرێت.

١٦– بەو پێيەى كەمينەى ئاشوورى لە كوردستاندا دەژين، دەبوايە مافە نەتەوەييەكانى ئەو كەمينەيە لەنێو بەياننامەى ١١ى مارتدا ديار بكرابايە[*]

---

(١٨٦) بۆ زانياريى زياتر سەبارەت بەو خاڵە نهێنييانە بڕوانە:مسعود البارزاني، البارزاني والحركة التحررية الكردية، ج٣ ، ص٦٢١–٦٢٢

(١٨٧) ديدار لەگەڵ مەسعود بارزانى، هاوينەهەوارى سەرى رەش، ٢٠٠٣/٦/٢٢.

(*) هەرچەندە بەپێى قسەكانى مەحمود عوسمان لە دانوستانەكانى پێش راگەياندنى بەياننامەى ١١ى مارت شاندى كورد لەگەڵ حكومەتى عێراق وتوێژى لەسەر ئەو پرسە كردووە، بەڵام سەركردايەتى بەعس ئەوەى پەسەند نەكردووە، وتويەتى ئەوە بۆ دواى چارەسەركردنى كێشەى كورد هەڵدەگرين‌و خۆمان مافەكانيان پێدەبەخشين. ديدار لەگەڵ دكتۆر مەحمود عوسمان، هەولێر، ٢٠٠٣/٩/٢٦؛ هەڵبەت ئەو هەڵوێستەى بەعس بۆ ئەوە دەگەڕايەوە كە ئەو كەمينانە لە بزووتنەوەى رزگاريخوازى كوردستان دابڕ بكات، ئەوەبوو بەر لە راگەياندنى بەياننامەى ١١ى مارت (ئەنجومەنى سەركردايەتى شۆڕش)ى عێراق لە ٢٤ى كانوونى دووەمى ١٩٧٠دا بەياننامەيەكيان بۆ پێدانى مافە رۆشنبيرييەكانى توركمان بانگدا. بڕوانە: الجمهورية العراقية، القرارات العامة لمجلس قيادة الثورة (١٩٦٨–١٩٧٧)، المجلد الثاني، ص٤٥٢. دواتريش پاش راگەياندنى بەياننامەى ١١ى مارت، لە٢٠ى شوباتى ١٩٧٢دا بەياننامەيەكيان بۆ مافە

بەم شێوەیە بۆمان دەردەکەوێت، بەیاننامەی ١١ی مارتی ١٩٧٠ ئەگەرچی دەسکەوتێکی مێژوویی گەورە بوو بۆ نەتەوەی کوردو جوولانەوە رزگاریخوازەکەی، بەلام لە هەمان کاتدا لە کەموکورتی بەدەر نەبوو، کە لە ئاییندەدا بووە هۆی جێبەجێنەکردنیو دەسپێکردنەوەی شەڕ دژی کورد.

رۆشنبیرییەکانی ئاشووری دەرکرد، بڕوانە: الجمهورية العراقية، القرارات العامة لمجلس قيادة الثورة (١٩٦٨–١٩٧٧)، المجلد الثاني، ص٤٥٤–٤٥٥.

## تەوەری یەکەم:

# گەڕانەوەی باڵی (برایم ئەحمەد- جەلال تاڵەبانی/"م.س") بۆ نێو پارتی دیموکراتی کوردستان

شۆڕشی ئەیلول هەر لە ساڵی (١٩٦٤)ەوە، لە ئەنجامی ئەو کەرتبوون و لێکدابڕانەی کە بەهۆی بیروڕای جیاوازی نێو سەرکردایەتی شۆڕشەکەوە هاتەئاراوە، دووچاری هەژانێکی گەورە هات و دوژمنانی کورد توانیان ناکۆکی و ململانێیەکە قووڵتر بکەنەوەو بۆ بەرژەوەندی تایبەتی خۆیان بیقۆزنەوە. دەرەنجام لاباڵێکی بزووتنەوەکەیان بۆ خۆیان راکێشاو بۆ سەنگەر گرتن لە شۆڕشی رزگاریخوازی کوردستان لەپاڵ خۆیاندا بەکاریان هێنان[١٨٨].

ئەو باڵەی لە پارتی دیموکراتی کوردستان جیابۆوە بەهەمان ناو کاریان دەکردو لەلایەن برایم ئەحمەدو جەلال تاڵەبانی سەرکردایەتی دەکران. کاتێکیش چوونە پاڵ حوکمەتی عێراق، وایان بڵاوکردەوە کە مستەفا بارزانی رابەری شۆڕشی کوردستان (داردەست و دەسکەلای ئیمپریالیزم و کۆنەپەرستانە!) و شۆڕشەکەشیان بە (ئاشوب و ئاژاوەنانەوە!) لە قەڵەمدا. ئەوان پێیانوابوو ئەو (ئاشوب و ئاژاوەنانەوەیە!) بەشێکی زۆری سوپای عێراقی خەریک کردووەو وایکردووە حوکمەتی عێراق نەتوانێ ئەو سوپایە لە کوردستاندا بکێشێتەوەو هاوشانی هێزەکانی دیکەی عەرەبی بینێرێتە شەڕ دژی ئیسرائیل[١٨٩].

---

(١٨٨) بگەڕێوە بۆ بەرایی باسەکەمان.

(١٨٩) بڕوانە: بۆچی ئەبێ بچین بەگژ جوڵانەوە چەکدارەکەی مەلا بارزانی دا، "رزگاری" (گۆڤارێکی هەفتانەی گشتییە)، ژ(٢)، ساڵی یەکەم، ٢٧ی نیسانی ١٩٦٩، ل٢٧.

هەڵوێستی تۆمەت خستنەپاڵ شۆڕشی کوردستان و رابەرەکەی، ئەگەر راستیش بوو بێت (کەواش نەبوو)، هەروەها بەرگری کردن و پاڕانەوەیان بۆ رژێمی بەعس کە بەرانبەر گەلی کورد سیاسەتی جینۆسایدی گرتبووە بەر، هەڵگەڕانەوەیەکی گەورەبوو لە خەباتی رزگاریخوازانەی گەلی کورد. تەنانەت گرتنەبەری ئەو سیاسەتە لەلایەن باڵی (برایم ئەحمەد- جەلال تاڵەبانی/ "م.س")، هەروەك نەوشیروان مستەفا ئەمین باسی لێوە کردووە، ببووە مایەی ناڕازیبوونی بەشێك لە ئەندامانی نێوخودی باڵەکەش[190]

ئەو باڵە، لەکاتێکدا تۆمەتی (داردەست و دەسکەلای ئیمپریالیزم!)یان دەخستەپاڵ مستەفا بارزانی و جووڵانەوە شۆڕشگێڕییەکەی، خۆشیان وەك حەبیب محەمەد کەریم دەڵێ: هاندان و دەست لەپشتدانی ئێران فاکتەرێکی کاریگەریی جیابوونەوەیان بوو لە شۆڕشی رزگاریخوازی کوردستان[191].

ئەوان هەر ئەوەندەیان بەس نەبوو تۆمەت بخەنە پاڵ شۆڕشی کورد، بەڵکو هاوسەنگەر لەگەڵ سەربازانی رژێمی عێراق و لەژێر سەرکردایەتی ئەفسەرانی سوپای ئەو رژێمە، بەرانبەر پێشمەرگەکانی شۆڕشی کوردستان دەجەنگان، وەك لە شەڕەکانی ساڵی ١٩٦٩ لە ناوچەکانی شارەزوور هەڵەبجە، گەرمیان، قەرەداغ شوان، شێخ بزێنی، ئاغجەلەر، پشدەر، پیرەمەگروون، سورداش[192] تەنانەت هەندێ لە سەرکردەکانی ئەو باڵە، بۆ لێدانی شوێنی حەوانەوەی شۆڕشگێڕانی

(١٩٠) پەنجەکان یەکتری ئەشکێنن، ل٩٨.

(١٩١) دیدار لەگەڵ حەبیب محەمەد کەریم، هاوینەهەواری شەقڵاوە، ٢٧/٧/٢٠٠٤.

(١٩٢) بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: مسعود البارزاني، البارزاني والحركة التحررية الكردية، ج٣، ص٢١٤ و ٢١٧–٢٢٢؛ الفريق الركن اسماعيل تايه النعيمي، تجربتي في القيادة، ج١، سلسلة بحوث عسكرية الرقم(٤٨)، ط١، دائرة التدريب مديرية التطوير القتالي، بغداد، تشرين اول ١٩٨٥، ص٧٨–٧٩و٨١–٨٣–٨٥و ١٠١و١٠٣.

کورد، لەناو فرۆکە جەنگییەکاندا ڕێنیشاندەری فرۆکەوانەکانی حوکمەتی بەعس بوون[١٩٣]. ئەو بارودۆخەش تا ساڵی ١٩٧٠ درێژەی کێشا.

ئەو باڵە دوای ڕاگەیاندنی بەیاننامەی ١١ی مارتی ١٩٧٠، کەوتنە ژێر کاریگەریی دەرهاویشتەکانی بەیاننامەکەو ڕۆژی دواتر دەقی بەیاننامەکەیان لە ڕۆژنامەکەی خۆیاندا (النور) بڵاوکردەوەو هەر بەو بۆنەیەشەوە بەناوی ڕۆژنامەکە پیرۆزباییان لە سەرۆك کۆماری عێراق کرد[١٩٤] دەبێ ئەوەش بگوترێ کە بەیاننامەی ١١ی مارت، هەروەك نەوشیروان مستەفا باسی کردووە "سەرکەوتنێکی گەورەبوو بۆ بارزانی و بۆ کورد، بەڵام تێکشانێکی سیاسیی کوشندەبوو بۆ جەلالی[*]، کە ورەی هێزەکانی دابەزی و لەبەریەك هەڵوەشا، ڕێکخراوە سیاسییەکانیشی کەوتبوونە ژێر گوشاری مەلایی[**] و خەڵك"[١٩٥]

هەرچۆنێك بێت، بارودۆخی دوای بەیاننامەی ١١ی مارت لەکوردستاندا، هەستێکی نوێی لای کورد پەیدا کرد و بۆ نەهێشتنی ئەو دووبەرەکییەی کە ڕیزەکانی بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی کوردستانی گرتبۆوە، جموجۆڵ دەستپێکرد.

---

(١٩٣) بڕوانە: اسماعيل تايه النعيمي، هـ س، ل١١٠-١١١.

(١٩٤) بڕوانە: "النور"، ع(٤٢٢)، ١٩٧٠/٣/١٢.

(*) جەلالی: زاراوەیەك بوو بۆ ئەو باڵەی پارتی دیموکراتی کوردستان بەکاردەهێنرا کە لەلایەن برایم ئەحمەد و جەلال تاڵەبانی سەرکردایەتی دەکران، کە زاراوەکەش دەگەڕایەوە بۆ ناوی جەلال تاڵەبانی.

(**) مەلایی: زاراوەیەك بوو بەسەر ئەو باڵەی پارتی دیموکراتی کوردستاندا بڕابوو کە لەلایەن مستەفا بارزانییەوە ڕابەرایەتی دەکرا، زاراوەکەش بۆ ناوی مەلا مستەفا بارزانی، دەگەڕایەوە.

(١٩٥) پەنجەکان یەکتری ئەشکێنن، ل١٠٣.

هەر لەوماوەیەشدا، تۆفیق وەهبی بەگ(*) کە لە وڵاتی بەریتانیا دەژیا، نووسراوێکی ئاراستەی مستەفا بارزانی کردو تیایدا جەختی لەسەر پێویستی یەکگرتنی کورد کردبوو و ئاشتبوونەوەی گشتی نێوان هەردوو باڵی جووڵانەوەی کوردی بەپێویست زانیبوو(١٩٦)

ماوەیەکیش دوای راگەیاندنی بەیاننامەی ١١ی مارت، مستەفا بارزانی دەسپێشخەریی ئاشتبوونەوەو یەکگرتنەوەی کرد. بۆ ئەو مەبەستەش فاخیر مێرگەسۆری(**) بۆ پێوەندیی کردن بە جەلال تاڵەبانی وەك نوێنەری خۆی ناردە

---

(*) تۆفیق وەهبی بەگ: تۆفیق کوڕی مەعروفی کوڕی محەمەدە ساڵی ١٨٩١ لەسلێمانی هاتۆتە دنیاوە، دوای تەواوکردنی خوێندنی سەربازی بۆتە ئەفسەر لەسوپای عوسمانی، پاشان لە دوای جەنگی یەکەمی جیهانی گەڕاوەتەوە کوردستانو بەشداری لە راپەڕینی دووەمی شێخ مەحموود کردووە، چوارجار پلەی وەزیری وەرگرتووە، دوای چواردەی تەموزی ١٩٥٨ عێراقی جێهێشتووەو لە لەندەن نیشتەجێبووە. ساڵی ١٩٨٤ لەوێدا کۆچی دوایی کردووە، بڕوانە: میر بەسری، ناودارانی کورد، و:عەبدولخالق عەلائەدین، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی، ٢٠٠٢، ل١٨٣-١٨٥.

(١٩٦) رەفیق پشدەری، کورد دوژمنی خۆت بناسە، چ١، (بێ ش.چ)، ١٩٩٩، ل٢٢.

(**) فاخیر کوڕی حەمەد ئاغای مێرگەسۆرییە ساڵی ١٩٣٧ لە مێرگەسۆر لەدایك بووەو لە ناوەڕاستی پەنجاکانەوە لە رێکخستنەکانی حیزبی شیوعی عێراق خەباتی سیاسیی کردووە، ساڵی ١٩٦٦ وەك فەرماندەیەکی شیوعی رۆڵێکی گرنگی گێڕاوە لە شکاندنی سوپای عێراق لەشەڕی هندرێن. ساڵی ١٩٦٧ دەچێتە ریزەکانی (پ.د.ك)و لەساڵی ١٩٧٠ دەبێتە ئەندامی کۆمیتەی ناوەندیی تاکو لەساڵی ١٩٧١ تەجمید دەکرێ. بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: شەپۆل فاخیر مێرگەسۆری، زمانی تاوان هاتە قسە، چ١، بێ چ، سلێمانی، ١٩٩٧.

بەغداو پێیڕاگەیاند: مستەفا بارزانی هەست بە مەترسی بارودۆخی کورد دەکات و دەیەوێ بتبینێت(١٩٧)

ئەو دەسپێشخەرییەی مستەفا بارزانی لەوکاتەدا ئەوە دەگەیەنێت کە هەرچەندە بە راگەیاندنی بەیاننامەی ١١ی مارت سەرکەوتنێکی بەدەستهێنا، بەڵام بیری لەوە نەکردەوە تۆڵەی خۆی لە باڵی (برایم ئەحمەد– جەلال تاڵەبانی/ "م.س" ) بکاتەوەو نەیویست بە ئەنجامدانی کارێکی لەو چەشنە دوژمنانی دڵخۆش بکات و دەیزانی جووڵانەوەی کورد لە بارودۆخی شەڕو ئاشتیدا، پێویستی بە یەکگرتوویی و یەکریزیی هەیە. ئەمە لەلایەك، لەلایەکی دیکەشەوە هەڵبژاردنی فاخیر میرگەسۆری لەلایەن مستەفا بارزانییەوە بۆ ئەو مەبەستە کارێکی زیرەکانە بوو، چونکە فاخیر لەناو پارتی دیموکراتی کوردستاندا هەڵگری بیروباوەڕی چەپ بووە. بە گوتەی جەلال تاڵەبانیش، فاخیر، رۆڵێکی گرنگی بۆ یەکگرتنەوە گێڕابوو و پێی گوتبوو: "ئێمە ئەو باڵەی کە چەپین لەناو پارتی، هاوکاری ئێوە دەبین بۆ ئەوەی سەرکردایەتییەکی راستەقینەی پارتی دروست بکەین"(١٩٨).

جێی ئاماژەپێدانە (ساڵح یوسفی)یش رۆڵێکی گەورەو بەرچاوی لەو یەکگرتنەوەیەدا گێڕاوەو مستەفا بارزانی و سەرکردایەتی پارتەکەی زۆر هانداوە تا بۆ ئاشتبوونەوە پێوەندیی بە باڵی (برایم ئەحمەد– جەلال تاڵەبانی/ "م.س") بکەن(١٩٩)

---

(١٩٧) دیدار لەگەڵ جەلال تاڵەبانی، هاوینەهەواری دوکان، ٢٠٠٤/٦/١٢.

(١٩٨) دیدار لەگەڵ جەلال تاڵەبانی، هاوینەهەواری دوکان، ٢٠٠٤/٦/١٢؛ بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: شەپۆل فاخیر مێرگەسۆری، س پ، ل٥٠–٥٢.

(١٩٩) دیدار لەگەڵ حەبیب محەمەد کەریم، هاوینەهەواری شەقلاوە، ٢٠٠٤/٧/٢٧

پاش سەردانەکەی فاخیر مێرگەسۆری بۆ بەغدا، جەلال تاڵەبانی دوای پرس و راوێژکردن بە هەڤاڵانی، ئابی ١٩٧٠ سەردانی مستەفا بارزانی کرد[٢٠٠] و سەرەتا هەردووکیان لەسەر هەڵوێستی رابردوویان گلەیی و گازاندەیان ئاراستەی یەکتر کردبوو، پاشان مستەفا بارزانی بە جەلال تاڵەبانی گوتبوو: بارودۆخی کورد لە مەترسیدایەو بەیاننامەی ١١ی مارتیش تەڵەیەکە لەلایەن حوکمەتی عێراقەوە بۆ جووڵانەوەی کورد نراوەتەوە، بۆیە پێویستە یەکبگرین. هەرچەندە جەلال تاڵەبانی پێی گوتبوو: با لەم پێناوەدا بەرەیەك لەنێوان هەردوولامان دروست بکەین، بەڵام مستەفا بارزانی بڕوای وابوو بە دروستکردنی بەرە کێشەکە چارەسەر نابێت، لەبەرئەوە بە جەلال تاڵەبانی گوتبوو: باشتروایە بێنەوە ریزی ئێمەو پارتەکەمان بکەینەوە یەك[٢٠١] بێگومان مستەفا بارزانی دەیویست ناکۆکییەکانی نێو ریزەکانی بزووتنەوەی سیاسیی کورد لە رەگەوە چارەسەر بکات، ئەوەش تەنها بە هەڵوەشانەوەی باڵەکەی تر پێکدەهات، لەبەرئەوەی ئەگەر ئەو یەکگرتنەوەیە ئەنجامنەدرابا، ئەوا حوکمەتی عێراق دەیتوانی کەڵك لە نەبوونی یەکریزیی بزووتنەوەکە وەرگرێ و درزی نێوانیان گەورەتر بکات.

هەرچی باڵەکەی تر بوو، دەیویست قەوارەی حیزبەکەیان بپارێزن و لەگەڵ پارتی دیموکراتی کوردستان دۆست و هاوکاربن و سەرکردایەتییەکەیان لای مستەفا بارزانی جێگیر بێت و رابەرایەتی ئەو قبوڵ بکەن، بەڵام مستەفا بارزانی بەوە رازی نەبوو ئەوان وەکو حیزبێکی سەربەخۆو جیاواز بمێننەوە، لەبەرئەوەی گومانی ئەوەی دەکرد جارێکی دیکەش لێی هەڵگەڕێنەوە، هەربۆیەش تەنها رێگەی تێکەڵاوبوونەوەی لەگەڵ (پ.د.ك) بۆ دانان[٢٠٢]

(٢٠٠) مسعود البارزاني، البارزاني والحركة التحررية الكردية، ج٣، ص٢٥٤.

(٢٠١) دیدار لەگەڵ جەلال تاڵەبانی، هاوینەهەواری دوکان، ٢٠٠٤/٦/١٢.

(٢٠٢) نەوشیروان مستەفا ئەمین، پەنجەکان یەکتری ئەشکێنن، ل١٠٣.

جێی ئاماژە پێدانە، لەکاتێکدا کە گفتوگۆو راگۆڕینەوە بۆ یەکگرتنەوە لەنێوان هەردوو باڵدا لە ئارادابوو، لقی ئەورووپای باڵی (برایم ئەحمەد– جەلال تاڵەبانی/ "م.س") ڕێبازێکی تری گرتبووەبەر. ئەوەبوو لە کۆتایی ئابی ١٩٧٠دا ئەو لقە بە سەرپەرشتی دکتۆر کەمال فوئاد[*] بەیاننامەیەکی بڵاوکردەوەو تیایدا جووڵانەوەی کورد کە لەلایەن مستەفا بارزانییەوە رابەرایەتی دەکرا، بە (بەکرێگیراوو جاسوسی ئیمپریالیزم و پەیمانی سەنتۆ) ناوبرد[٢٠٣]، بەڵام دواتر سەرکردایەتی ئەو باڵە لە بەرانبەر مستەفا بارزانیدا بێئاگایی و پێناخۆشبوونی خۆیان سەبارەت بەو بەیاننامەیەی لقی ئەورووپایان نیشانداو پێیان وابوو کە کارێکە دوژمن پێی کردوون و هەر بۆیەش سەرکۆنەیان کرد[٢٠٤].

دوابەدوای سەردانەکەی بۆ لای مستەفا بارزانی، جەلال تاڵەبانی گەڕایەوە لای هەڤاڵانی و لە کۆبوونەوەیەکی خۆیاندا بڕیاریاندا پێشنیارەکانی مستەفا بارزانی بۆ تێکەڵبوونەوە پەسەند بکەن[٢٠٥].

هەر لەو ماوەیەشدا دەستەیەکی باڵی (برایم ئەحمەد– جەلال تاڵەبانی/ "م.س") کە ناویان لەخۆیان نابوو لیژنەی بەرزی بزووتنەوەی شۆڕشگێڕانی کورد (رزگاری)، بەیاننامەیەکیان دەرکردو خۆیان هەڵوەشاندەوەو وایان بینی کە ئەو

---

(*) دکتۆر کەمال فوئاد ساڵی ١٩٣٢ لەشاری سلێمانی لەدایك بووە، یەکێك بووە لە سەرکردەکانی ئەو باڵەو دواتریش یەکێك بووە لە دامەزرێنەرانی یەکێتی نیشتمانی کوردستان لە ساڵی ١٩٧٥، ئێستاش ئەندامی دەستەی کارگێڕی یەکێتی نیشتمانی کوردستانە.

(٢٠٣) جەمال نەبەز، کوردستان و شۆڕشەکەی، ل٣٢٣.

(٢٠٤) بڕوانە: کۆبوونەوەیەکی نێوان برایم ئەحمەدو هەڤاڵانی لەگەڵ مستەفا بارزانیدا کە لەسەر کاسێت دەنگەکانیان تۆمارکراوە، ١٥لەسەر ١٦/١٠/١٩٧٠، (ئەو کاسێتەمان لە ئەرشیفی کەناڵی ئاسمانیی تەلەفزیۆنی کوردستان وەرگرتووە).

(٢٠٥) دیدار لەگەڵ جەلال تاڵەبانی، هاوینەهەواری دوکان، ١٢/٦/٢٠٠٤.

بارودۆخەی بەهۆی بەیاننامەی ١١ی مارتەوە هاتۆتە ئارا، هیچ هۆیەکی بۆ مانەوەی ڕێکخراوەیی بزووتنەوەکەیان نەهێشتۆتەوە. لەبەرئەوە داوایان لە هەموو ئەندامانی خۆیان کرد بچنە ریزەکانی پارتی دیموکراتی کوردستان، بە رابەرایەتی مستەفا بارزانی[٢٠٦]

پاش پەسەندکردنی پێشنیارەکانی مستەفا بارزانی بۆ تێکەڵبوونەوە، جارێکی دیکە شاندێکی باڵی (برایم ئەحمەد- جەلال تاڵەبانی/ "م.س" ) چووەلای مستەفا بارزانی و دوای ئەوەی کە هەردوولا هەندێ مەرجیان بۆ یەکتر دانا، پێکهاتن لەسەرئەوەی ئەو باڵە بگەڕێتەوە ژێر سەرکردایەتی مستەفا بارزانی رێژەی سێیەکی پایەو رێکخستنەکانی لق و ناوچەو رێکخراوەکانیان پێبدرێت و لە ماوەی ساڵێکیشدا پارتی دیموکراتی کوردستان کۆنگرەی خۆی ببەستێت و سەرکردایەتییەکی نوێ هەڵبژێرێتەوە[٢٠٧]

لە ١٥ی تشرینی یەکەمی ١٩٧٠شدا شاندێکی پایەبەرزی باڵی (برایم ئەحمەد- جەلال تاڵەبانی/ "م.س" ) کە پێکهاتبوو لە برایم ئەحمەدو عومەر دەبابەو عەلی عەسکەری، سەردانی مستەفا بارزانییان کردو لەگەڵیدا کۆبوونەوە[٢٠٨]. لە کۆبوونەوەکەدا مستەفا بارزانی جەختی لەسەر ئەوە کردەوە کە جگە لە بەرژەوەندی کورد هیچی دیکەی نیە. برایم ئەحمەدیش بەناوی هەڤاڵانیەوە باسی لەوەکرد کە لەماوەیەکی نزیکدا بڕیارێك دەرئەکەن و کێ بچێت لەگەڵیان دەچنە خزمەتی و فەرمانەکانی جێبەجێ دەکەن، هەر کەسێکیش لە بڕیارەکەیان دەربچێت لە ئەوروپا بێت یا لە ئاسیا بێت یاخود لە ئەفریقیا ئەوا

(٢٠٦) بۆ زانیاریی زیاتر دەربارەی بەیاننامەکە بڕوانە: "هاوکاری"، ژ(٤٢)، ١٩٧٠/١٠/٢٤

(٢٠٧) دیدار لەگەڵ جەلال تاڵەبانی، هاوینەهەواری دوکان، ٢٠٠٤/٦/١٢.

(٢٠٨) مسعود البارزاني، البارزاني والحركة التحررية الكردية، ج٣، ص٢٥٥.

بەبێ لەبەرچاوگرتنی ئەوەی کەپێشتر لەگەڵیان بووە وەکو دوژمنی کورد سەیری دەکەن، لەبەرئەوەی پێی وابوو هەموو کورد کۆبکرێتەوە بەشی ئەو کارانە ناکات کە لە ئەنجامی ئەو بارودۆخە نوێیە هاتۆتە کایەوە، چ جای پارچە پارچەش بن[٢٠٩] ئەو گیانی هەست بە بەرپرسیارێتیکردنەش لەو سەردەمەدا شتێکی گەورەو پڕبەهاو پڕ بەپێستی ئەو ئەرك و پێویستییانە بوو کە لە ئەنجامی بارودۆخی دوای راگەیاندنی بەیاننامەی ١١ی مارتی ١٩٧٠ هاتبووە ئاراو بووە فاکتەرێکی گرنگ بۆ یەکخستنەوەی ئەو سەردەمەی جووڵانەوەی رزگاریخوازی کورد، کەوتبووە سەرشانیان.

لێرەدا دەبێ ئاماژە بەوەش بکەین کە هەردوو رژێمی عێراق و ئێران، لە بەرانبەر ئەو تەباییە سیاسییەی کوردو هەوڵەکانی یەکگرتنەوەی بزووتنەوەکەی بێ هەڵوێست نەبوون، بەڵکو هەرزوو، بەتایبەتی لە رێگەی باڵی (برایم ئەحمەد-جەلال تاڵەبانی/ "م.س")، هەوڵیاندا ئاستەنگ بۆ ئەو یەککگرتنەوەیە دروستکەن ، بەڵام هەوڵەکانیان بێئاکام بوون.

بۆ نموونە، جارێکیان جەلال تاڵەبانی لەرێگای چوونیدا بۆ لای مستەفا بارزانی، تووشی (سەعدون غێدان)ی وەزیری ناوخۆی عێراق دەبێت کە ئەویش لای مستەفا بارزانی دەگەڕێتەوە. لەوکاتەدا (غێدان) رەنگی دەموچاوی سپی دەبێت، چونکە دەزانێ ئەوانیش هەر بۆ هەمان شوێن دەچن. ئەوەبوو لێی پرسی بوون: بۆ کوێ دەڕۆن، جەلال تاڵەبانییش گوتبووی: "تۆ لە کوێ بووی ئێمەش بۆ ئەوێ"[٢١٠]. دوای ئەوەش دەسەڵاتدارانی عێراق لەژێرەوە زۆر هەوڵیان

(٢٠٩) کۆبوونەوەیەکی نێوان برایم ئەحمەدو هەڤاڵانی لەگەڵ مستەفا بارزانی کە لەسەر کاسێت دەنگەکانیان تۆمارکراوە، ١٥لەسەر١٦/١٠/١٩٧٠.

(٢١٠) دیدار لەگەڵ جەلال تاڵەبانی، هاوینەهەواری دوکان، ١٢/٦/٢٠٠٤.

لەگەڵدابوون نەچنەوە ناو ئەو سەرکردایەتییەی لێی جیابببوونەوە. تەنانەت پێشیانڕاگەیاندبوون کە ئەو ڕێککەوتنەی بەعس لەگەڵ مستەفا بارزانی کردوویەتی، شتێکی کاتییە[٢١١]، بەڵام دیارە سەرکردایەتی باڵی (برایم ئەحمەد– جەلال تاڵەبانی/ "م.س") بەهۆی لەبەرچاوگرتنی بەرژەوەندییە نیشتمانی و نەتەوەییەکانی کوردستان نەچووبوونە ژێر باری هەوڵەکانی ڕژێمی بەعس و گوێیان پێنەدابوون.

هاوکات، ڕژێمی ئێرانیش بۆ هەمان مەبەست هەوڵەکانی خستەگەڕ. بۆ نموونە دوای ڕاگەیاندنی بەیاننامەی ١١ی مارت، لە ڕێگەی نوێنەرێکی دەزگا هەواڵگرییەکانییەوە لە لەندەن پێوەندییان بە برایم ئەحمەدەوە کرد کە ئەوکاتە بۆ چارەسەری نەخۆشی چووبووە ئەوێ، لەدژی مستەفا بارزانی بەڵێنی هاوکارییان پێدا، لەو پێناوەی باڵی (برایم ئەحمەد– جەلال تاڵەبانی/ "م.س" ) نەگەڕێتەوە ژێر سەرکردایەتی مستەفا بارزانی، بەڵام برایم ئەحمەد بەو شێوەیە وەڵامی دابوونەوە: "بچۆرەوە بە شا بڵێ ئەوڕۆ کورد ئەوەی لە عێراقدا دەستی کەوتووە، دەتوانێ ئەو بە کوردەکانی ئێرانی بدا؟"[٢١٢]. بەم شێوەیە هەوڵەکانی ئێرانیش پووچەڵبوون.

شایانی باسە چەند کەسێك لەناو پارتی دیموکراتی کوردستانیش دژی ئەوە بوون ڕێکخستنەکانی (برایم ئەحمەد– جەلال تاڵەبانی/ "م.س" ) بچنەوەپاڵیان. لەو چوارچێوەیەشدا پێشنیاریان کرد کە ئەندامانی ئەو باڵە بە تۆمەتی ناپاکیی

---

(٢١١) دیدار لەگەڵ جەلال تاڵەبانی، هاوینەهەواری دوکان، ٢٠٠٤/٦/١٢.

(٢١٢) بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: حوسێن محەمەد عەزیز، پێنج کاتژمێر لەگەڵ برایم ئەحمەد، ج١، چاپخانەی باران، ١٩٩٥، ل٥٧–٥٨.

گەورە بدرێنە دادگا، بەڵام مستەفا بارزانی بە توورەییەوە پێشنیارەکەیانی ڕەتکردەوە[٢١٣].

کۆتایی کانوونی یەکەمی ١٩٧٠ باڵی (برایم ئەحمەد– جەلال تاڵەبانی/ "م.س") کۆنگرەی حەوتەمی خۆی بەست و پرسی چوونەپاڵ پارتی دیموکراتی کوردستان و سەرکردایەتی مستەفا بارزانییان شرۆڤە کرد. وەك زەمینە خۆشکردنێکیش بۆ ئەو کردارە، وێڕای جیاوازی بیروڕایان، زۆرینەی ئەندامانی کۆنگرە گەیشتنە ئەو بڕیارەی لەپێناو ڕێگاخۆشکردن بۆ خۆهەڵوەشاندنەوەو یەکگرتنەوەیان لەگەڵ (پ.د.ك)، ناوی پارتەکەیان بگۆڕن بۆ پارتی شۆڕشگێڕی کوردستان[٢١٤].

دوابەدوای ئەو هەنگاوانە، لە ئاکامدا لە ١٠ی شوباتی ١٩٧١ پارتی شۆڕشگێڕی کوردستان بەیاننامەی خۆهەڵوەشاندنەوەو خەبات کردن لە ریزەکانی پارتی دیموکراتی کوردستانی لەژێر رابەرایەتی مستەفا بارزانی، راگەیاند. لە هەمان ڕۆژیشدا (پ.د.ك) بەیاننامەیەکی بڵاوکردەوەو تیایدا خۆشحاڵی خۆی بەرانبەر ئەو هەنگاوەی پارتی شۆڕشگێڕی کوردستان دەربڕی و داوای لە ڕێکخراوو تێکۆشەرانی خۆی کرد کە بەپێی باوەڕیان بە ڕێکخستنی دیموکراتییانە، باوەش بۆ هەڤاڵانی نوێیان بکەنەوە[٢١٥].

---

(٢١٣) مسعود البارزاني، البارزاني والحركة التحررية الكوردية، ج٣، ص٢٥٥.

(٢١٤) بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: الدكتور شيركو فتح الله عمر، الحزب الديمقراطي الكوردستاني وحركة التحرر القومي في العراق ١٩٤٦–١٩٧٥، ط٦، مط رون، السليمانية، ٢٠٠٤، ص٢١٩–٢٢٠؛ ئیبراهیم جەلال، س پ، ل٢٨٢–٢٨٥.

(٢١٥) بۆ زانیاریی زیاتر دەربارەی هەردوو بەیاننامەکە بڕوانە: "هاوکاری"، ژ(٦)، ١٩٧١/٢/٢٠.

مستەفا بارزانییش فەرمانیدا چاودێری بکرێن و لە سوکایەتی پێکردنیش بپارێزرێن و هەروەها پێشیان گوترا: ئازادن لە گرتنەبەری هەر ڕێگایەك بۆ پاراستنی خۆیان، ناشبێ لێکدانەوەی خراپ بۆ هیچ هەنگاوێك بکەن کە لەلایەن سەرکردایەتی (پ.د.ك)ەوە بنرێ بەمەبەستی پارێزگاری لێکردنیان. هەروەها سەرکردەکانی (پارتی شۆڕشگێڕی کوردستان)ی پێشووش، هەریەکەو لە ناوچەیەك لە دەوروبەری بارەگای مستەفا بارزانی نیشتەجێکران. برایم ئەحمەدو خێزانەکەی لەناوپردان، عەلی عەسکەری و خێزانەکەی لە گەلاڵە، عومەر مستەفا دەبابەو خێزانەکەیشی لە دەربەند، جەلال تاڵەبانیش ماوەیەك لە خانوویەك لە قەسرێ کە بارەگای مستەفا بارزانی لێبوو، مایەوە[٢١٦]

نیشتەجێکردنی ئەو ناوبراوانەش لەو شوێنانە یەکێك بوو لە مەرجەکانی مستەفا بارزانی[٢١٧]. جەلال تاڵەبانی پێی وایە دوو هۆکار لەپشت ئەو مەرجە بوون، یەکەمیان: مستەفا بارزانی پێی خۆشبوو، کە ئەوانە لە نزیك خۆی و لە پەنای ئەودابن تاکو ئەولاو ئەولا نەکەن. دووەمیان: بۆئەوەی بوو وا نیشاندا کورد یەکیگرتۆتەوەو هەموو لەژێر سەرکردایەتی ئەودا کۆبوونەتەوە[٢١٨]

سەبارەت بەدانانی هەریەکە لەوانەش لەشوێنێك، ئەوا دەتوانین وا لێکبدەینەوە، کە سەرکردایەتی (پ.د.ك) بۆیە ئەوکارەی کردووە تاکو بەربگرێت لە دووبارە بوونەوەی هەر کارێك کە مەترسی لێبکەوێتەوەو جارێکی دیکە پارتەکەیان بەرەو کەرتبوون بەرێت، بەلام تانسکۆی شۆڕشی رزگاریخوازی کوردستان لە ساڵی ١٩٧٥داو دواتریش کەسیان بیریان لەوەنەکردەوە جارێکی

---

(٢١٦) مسعود البارزاني، البارزاني والحركة التحررية الكردية،ج٣، ص٢٥٥.

(٢١٧) نەوشیروان مستەفا ئەمین، پەنجەکان یەکتری ئەشکێنن،ل١٠٤.

(٢١٨) دیدار لەگەڵ جەلال تاڵەبانی، هاوینەهەواری دوکان، ٢٠٠٤/٦/١٢.

دیکە پارتی دیموکراتی کوردستان بکەنەوە دووبەش. هەروەك مەسعود بارزانیش جەختی لەسەر کردەوە، دوای گەڕانەوەی پارتی شۆڕشگێڕی کوردستان، هەستیان بەوە نەکردووە کە سەرکردەو ئەندامانی ئەو پارتە هەوڵی پیلانگێڕیی و خراپەکاری بدەن لەناو (پ.د.ك)[٢١٩]، ئەوەش نیشانەی ئەوەیە، هەموو کوردێك هەستی بەلێپرسراوێتی کردووە بەرانبەر ئەو بارودۆخەی، دوای بەیاننامەی ١١ی مارت لە کوردستاندا هاتبووە کایەوە.

دەبێ ئەوەش بگوترێت ئەو ئاشتبوونەوەو یەکگرتنەوەیە ببووە مایەی نارەزایی و نارەحەتی بەعس، لەبەرئەوەی چاوەڕوان بوو شەڕی ناوخۆو تۆڵەسەندن لەنێو کورددا روویدات، تا بەئاسانی پیلانەکانی دژی بزووتنەوەی رزگاریخوازی کورد جێبەجێ بکات.

(٢١٩) دیدار لەگەڵ مەسعود بارزانی، هاوینەهەواری سەری رەش، ٢٠٠٣/٦/٢٢

## تەوەرى دووەم:

# سەرهەڵدانى كۆمەڵەى ماركسيى- لينينيى كوردستان

سەركەوتنى شۆڕشى سۆشياليستى ئۆكتۆبەرى روسيا لەساڵى ١٩١٧دا، پاشان ژێركەوتنى بەرەى فاشستى لە جەنگى دووەمى جيهانيى، دواتريش سەركەوتنى شۆڕشى سۆشياليستى چين لە ساڵى ١٩٤٩، كاريگەريى بەگوڕبوون بۆ بڵاوبوونەوەى بيرى ماركسيزم و سۆشياليزم لە سەرانسەرى جيهاندا. لە رۆژهەڵاتى ناوەڕاستيشدا فەرمانڕەوايى دەوڵەت لەلايەن تاكەكەس و حيزبى دەسەڵاتدارەوە قۆرخكرابوون. ئەو بارودۆخە پڕ مەينەتييەش گەلانى بندەستى ئەم دەڤەرەى جۆشدا لەپێناو رزگاربوون لە چەوسانەوەو وەدەستهێنانى ئازادى پەنا ببەنەبەر پێكهێنانى جووڵانەوەى شۆڕشگێڕيى و رزگاريخوازى نەتەوەيى و چينايەتى، كە زۆربەيان لە پرەنسيپى سياسييياندا لە ئايدۆلۆژياى ماركسيزم– لينينيزم سەرچاوەيان دەگرت.

لە كوردستانى ژێر چنگى عێراقيشدا لەژێر كاريگەريى ئەو فاكتەرە جيهانييانەى ناوبران زۆر بزاڤى سياسيى و شۆڕشگێڕو ئازاديخواز بەرپابوون، بەگشتى سەرجەمى ئەو بزاڤە شۆڕشگێڕو ئازاديخوازانە –بەشۆڕشى ئەيلوليشەوە– ئەو قاڵبووەوەى پرسى چينايەتى و ئايديۆلۆژياى سۆشياليزم نەبوون و ببوونە مايەى پەيدابوونى كەلێنێكى گەورە لەنێو بزاڤى رزگاريخوازيى كوردستان.

بۆ پڕکردنەوەی ئەو کەلێنەش ژمارەیەك لاوی نیشتمانپەروەری ڕووناکبیرو گۆشکراو بە بیروباوەڕی مارکسیزم، لە کۆتایی ساڵانی شەستەکان و سەرەتای ١٩٧٠ کەوتنەگەڕو خۆسازدانی نهێنی، بۆ پێکهێنانی ڕێکخراوێکی چەپ لە کوردستاندا.

ئەو بیرۆکەیەش لەناو باڵی (برایم ئەحمەد–جەلال تاڵەبانی/ "م.س")،چەکەرەی کرد، لەبەرئەوەی هەروەك نەوشیروان مستەفا ئەمین کە هەم ئەندامێکی ئەو باڵە بووەو هەم یەکێکیش بووە لەوانەی ئەم بیرۆکەیان لا گەڵاڵە بووە، دەڵێت: ئێمە گەیشتبووینە ئەو باوەڕەی کە ئەم.جۆرە پارتانە ناتوانن کورد ڕزگار بکەن و لەوەوە نائومێد بووین. پێمان وابوو کە هەم (ح.ش.ع)بەهەردوو باڵەکەیەوە، هەم پارتی دیموکراتی کوردستان بەهەردوو باڵەکەیەوە شکستیان هێناوە لە سەرکردایەتی کردنی جووڵانەوەی کورددا و ناتوانن جووڵانەوەکە بە ئەنجام بگەیەنن، لەبەر ئەوە بیرمان لە پێکهێنانی ڕێکخراوێك کردەوە، بۆ ئەو مەبەستەش سوودمان لە چینییەکان وەرگرتبوو کە تیۆرێکیان هەبوو بۆ ڕزگاری گەلان، ئەویش بریتی بوو لە (حیزبی پێشڕەو، لەشکری گەل، بەرەی نیشتمانیی) کە مەبەست لە بەرەی نیشتمانییش حیزبێکی پێکهاتوو لە چەند چینێك بوو، نەك بەرەی نێوان چەند حیزبێك[٢٢٠].

هەرچەندە ئەو ڕەوتە سیاسییە چەپەش لەنێو باڵی (برایم ئەحمەد–جەلال تاڵەبانی/ "م.س") لەساڵی ١٩٦٧ سەری هەڵدا، بەڵام جگە لەوەی ئاماژەمان پێدا، لەژێر کاریگەریی چەندین پرس و فاکتەری دەرەکی و ناوخۆیی دیکەشدا بوون، بەجۆرێك کە یارمەتیدەر بوون بۆ پەرەپێدانی بیرۆکەکەیان.

---

(٢٢٠) دیدار لەگەڵ نەوشیروان مستەفا ئەمین، سلێمانی، ٥/١١/٢٠٠٢.

دەتوانین گرنگترین ئەو پرس و فاکتەرانە لەم چەند خاڵەی خوارەوەدا، ریزبەند بکەین:–

١. لەو سەردەمەدا گفتوگۆیەکی گەورە پەیدا ببوو لەنێوان هێڵی یەکێتی سۆڤیەت و هێڵی چین، هەرچەندە هەردوو وڵات سۆشیالیستی بوون، بەڵام لە سیاسەت و تێڕوانینیان بەرانبەر جیهان جیاواز بوون. گفتوگۆکانیش وابوو کە سەرکردایەتی سۆڤیەت و هەموو ئەو هێزانەی لە بازنەی سیاسەتی ئەواندا دەخوولانەوە، لەلایەن چین بەلادەر لە پرسە نیشتمانیی و چینایەتییەکان، تۆمەتبار دەکران. ئەو ململانێ و گفتوگۆ فراوانەش بووە هۆی دروستبوونی ناکۆکی و دابەشبوون لەنێو چەندین حیزبی شیوعیدا لەوانە حیزبی تودەی ئێران کە باڵێکی لێ جیابۆوە بە ناوی (سازمانی ئینقلابی حیزبی تودەی ئێران)[٢٢١] پاشان ئەوانە لەساڵی ١٩٦٨ هاتنە کوردستانی ژێر چنگی عێراق و لە بەکرەجۆ لای جەلال تاڵەبانی میوان بوون. دواتر لە رێگەی سازدانی کۆڕو کۆبوونەوەدا، کاریگەرییەکی زۆریان خستەسەر ئەندامانی باڵی (برایم ئەحمەد–جەلال تاڵەبانی/ "م.س") بۆ زیاتر ئاشنابوونیان بەبیروباوەڕی چەپ بەگشتی و بیروباوەڕی (ماوتسی تۆنگ) بەتایبەتی[٢٢٢]

(٢٢١) دیدار لەگەڵ فەرەیدون عەبدولقادر، سلێمانی، ٢٠٠٣/٩/٢٤. فەرەیدون عەبدولقادر ساڵی ١٩٤٧ لە شاری کەرکووک لەدایك بووە و لە سلێمانی پەروەردە بووە، یەکێك بووە لە دامەزرێنەرانی کۆمەڵەی مارکسیی–لینینیی کوردستان، لە ساڵی ١٩٨٣یشەوە ئەندامی مەکتەبی سیاسیی یەکێتی نیشتمانی کوردستانە. دیدار لەگەڵ فەرەیدون عەبدولقادر، سلێمانی، ٢٠٠٣/٩/٢٤.

(٢٢٢) دیدار لەگەڵ ئاوات عەبدولغەفور، سلێمانی، ٢٠٠٣/٩/٢١ ئاوات عەبدولغەفور ساڵی ١٩٤٧ لە خانەقین لەدایك بووە. ساڵی ١٩٦٢ وەك قوتابییەك چۆتە نێو ژیانی سیاسیی و ساڵی ١٩٦٣ لەلایەن رژێمی عێراقەوە دەسگیرکراوە کاتێکیش، بۆ

بەدرێژایی مێژووش حیزبە چەپەکانی ئێران کاریگەرییان لەسەر ڕەوتی سیاسیی چەپ هەبووە لە عێراقدا[٢٢٣].

جێی ئاماژەپێدانە، ململانێی نێوان یەکێتی سۆڤیەت و چین کاریگەریی خستە سەر حیزبی شیوعی عێراقیش لەو سەردەمەدا، کە باڵی لیژنەی مەرکەزی ئەو حیزبە لایەنگیری سیاسەتی یەکێتی سۆڤیەتی دەکرد، بەڵام باڵی قیادەی مەرکەزی لایەنگیری سیاسەتی چین بوو. لەگەڵ ئەوەشدا (ح.ش.ع) بەهەردوو باڵەکەیەوە نەیتوانیبوو تینوێتی چەپڕەوانی کورد، بشکێنی[٢٢٤] ئەمەش بۆشاییەکی گەورەی دروستکردبوو.

---

ئەنجامدانی تاقیکردنەوەکانی، لەزیندانەوە بردوویانە بۆ قوتابخانە، بەیارمەتی چەند هاوڕێیەکی رایکردووەو هەر دوای رزگاربوونی خۆی گەیاندۆتە ریزی شۆڕش. لەساڵی١٩٧٠شەوە بۆتە یەکێك لە کادیرە سەرەتاییەکانی کۆمەڵەو ساڵی ١٩٧٦ لەگەڵ شەهاب شێخ نووریو ژمارەیەك هاوڕێی دیکەیدا لەلایەن رژێمی ئێرانەوە تەسلیم بە رژێمی عێراق کراوەو تا ساڵی ١٩٧٩ زیندانیی کراوە. لە دوای ئازادبوونیشیەوە بەردەوامە لە خەباتی سیاسیی و ئێستا لەریزەکانی یەکێتی نیشتمانی کوردستاندا کاردەکات. دیدار لەگەڵ ئاوات عەبدولغەفور، سلێمانی، ٢٠٠٣/٩/٢١.

(٢٢٣) دیدار لەگەڵ حیکمەت محەمەد کەریم (مەلا بەختیار)، سلێمانی، ٢٠٠٣/٩/١٧. ساڵی ١٩٥٤ لە خانەقین لەدایك بووە. ساڵانی شەستەکان لەریزەکانی یەکێتی قوتابیانی کوردستان خەباتی کردووە. ساڵی ١٩٧٠ پێوەندیی بە کۆمەڵەی مارکسیی–لینینیی کوردستان کردووەو یەکێك بووە لە کادیرە سەرەتاییەکانی ئەو رێکخراوە. ئێستاش ئەندامی مەکتەبی سیاسیی یەکێتی نیشتمانی کوردستانە. دیدار لەگەڵ حیکمەت محەمەد کەریم (مەلا بەختیار)، سلێمانی، ٢٠٠٣/٩/١٧.

(٢٢٤) دیدار لەگەڵ ئەرسەلان بایز، سلێمانی ٢٠٠٣/٩/٢١. ئەرسەلان بایز ساڵی ١٩٥٠ لە دەشتی هەولێر لەدایك بووە، یەکێك بووە لە کادیرە سەرەتاییەکانی کۆمەڵەی مارکسیی–لینینیی کوردستان، ساڵی ١٩٨٢ بۆتە ئەندامی سەرکردایەتی یەکێتی

٢. کاریگەریی شۆڕشەکانی جیهان وەکو شۆڕشی چین و ڤێتنام و فەلەستین لەسەر گەشەسەندنی بیروباوەڕی چەپ لای چەپڕەوانی کورد. شێوەی ئەو کاریگەرییەش لە شۆڕشێکەوە بۆ شۆڕشێکی دیکە جیاوازی هەبوو، بۆ نموونە کاریگەرێتی شۆڕشی چین بەهۆی بارودۆخی لەیەکچووی کوردستان و وڵاتی چین بوو، کە لەڕووی ئابووری و کۆمەڵایەتییەوە کۆمەڵگایەکی جووتیارییان تێدا دەژیا[٢٢٥] ئەمە سەرەڕای کاریگەریی دانراوەکانی ماوتسی تۆنگ بەتایبەتی (تحليل طبقات المجتمع الصيني) و(في التناقض) و (الممارسة العملية) و (مقالات عسكرية) و (چەپکێك لە ووتەکانی ماوتسی تۆنگ)، کە لەنێو ڕووناکبیرە چەپەکانی کوردا بەردەوام گفتوگۆیان لەسەر دەکرا[٢٢٦]. بەهۆی پێوەندییەکانی

نیشتمانی کوردستان و لە ساڵی ١٩٩٦یشەوە بۆتە ئەندامی مەکتەبی سیاسیی و لێپرسراوی مەکتەبی ڕێکخستن، ساڵی ٢٠٠٢یش لەزانکۆی سلێمانی دکتۆرای لەئەدەبی کوردی وەگرتووە. دیدار لەگەڵ ئەرسەلان بایز، سلێمانی ٢٠٠٣/٩/٢١.

(٢٢٥) دیدار لەگەڵ ئاسۆ شێخ نووری، سلێمانی، ٢٠٠٣/٩/٢١ ئاسۆ شێخ نووری ساڵی ١٩٤٧ لە شاری سلێمانی لەدایك بووە، یەکێك بووە لە کادیرە سەرەتاییەکانی کۆمەڵەی مارکسیی–لینینیی کوردستان، لەسەرەتای ئایاری ٢٠٠١یشەوە بۆتە پارێزگاری سلێمانی و تاکو ئێستاش لەسەر کارەکەی بەردەوامە. دیدار لەگەڵ ئاسۆ شێخ نووری، سلێمانی، ٢٠٠٣/٩/٢١

(٢٢٦) دیدار لەگەڵ شاخەوان عەباس عەولا، هەولێر ٢٠٠٣/٤/٣٠ . شاخەوان عەباس ساڵی ١٩٥٢ لە هەولێر لەدایك بووە، دەرچووی ئامادەیی کشتوکاڵە، ساڵی ١٩٦٦–١٩٦٧ پێوەندیی بە یەکێتی قوتابیانی کوردستان وپارتی دیموکراتی کوردستان کردووە، ساڵی١٩٧٢چۆتە ڕیزی کۆمەڵەی مارکسیی–لینینیی کوردستان. ساڵی (١٩٧٧)ەوە بەبێ دابڕان پێشمەرگە بووەو لە کۆنگرەی یەکەم ودووەمی یەکێتی نیشتمانی کوردستان، بە ئەندامی سەرکردایەتی هەڵبژێردراوە. دیدار لەگەڵ شاخەوان عەباس عەولا، هەولێر ٢٠٠٣/٤/٣٠. جێی ئاماژەپێدانە شاخەوان عەباس لە ١ی شوباتی ٢٠٠٤ لە

جەلال تاڵەبانیشەوە، چینییەکان لەرێگەی باڵیۆزخانەکەیانەوە لە بەغدا، ژمارەیەکی زۆریان لەو جۆرە کتێبانە، کە وەرگێڕدرابوونە سەر زمانی عەرەبی، بۆ خوێنەرو رووناکبیرانی کورد دەنارد[227]، بۆئەوەی زیاتر ئاشنای بیروباوەڕی شۆڕشی چین بن. هەندێ لەو رووناکبیرانەش لەشاری بەغدا بۆ بڵاوکردنەوەی ئەو کتێب ونامیلکانە کتێبخانەیەکیان بەناوی (بیری نوێ) دامەزراند[228]. هەر لەژێر کاریگەریی بیروباوەڕی ئەو شۆڕشەش گۆڤاری (رزگاری)[*] لەساڵی ١٩٦٩ دەرچوو، کە ئەویش کاریگەرییەکی گەورەی هەبوو لەسەر بڵاوکردنەوەی ئایدیۆلۆژیای ماویزم، تەنانەت دواتر دامەزرێنەرانی کۆمەڵەی مارکسیی–لینینیی کوردستانیش لەو کەسانە بوون کەپێشتر لە دەوری ئەو گۆڤارە کۆببونەوەو لەژێر کاریگەریی بیروباوەڕەکانیدا بوون[229].

فەلەستینییەکانیش کە زووتر بۆ گەشەپێدانی بیری چەپ لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاست دەسپێشخەر بوون، لێکۆڵینەوەی نێو گۆڤارو بڵاوکراوەکانیان،

---

بارەگای مەڵبەندی سێی یەکێتی نیشتمانی کوردستان لە هەولێر لە ئەنجامی کردەوەیەکی تیرۆریستی لەگەڵ ژمارەیەك پێشمەرگەو خەڵکی دیکە شەهید کرا.

(٢٢٧) دیدار لەگەڵ ئاوات عەبدولغەفور، سلێمانی، ٢١/٩/٢٠٠٣.

(٢٢٨) دیدار لەگەڵ شاخەوان عەباس، هەولێر، ٣٠/٤/٢٠٠٣؛ دیدار لەگەڵ ئاسۆ شێخ نووری، سلێمانی، ٢١/٩/٢٠٠٣.

(*) رزگاری گۆڤارێکی هەفتانەی گشتی بوو، لەشاری سلێمانی دەردەچوو، خاوەنی ئیمتیاز نەوشیروان مستەفاو سەرنووسەرەکەشی شازاد سائیب بوون، یەکەم ژمارەی ئەو گۆڤارە ٢٠ی نیسانی ١٩٦٩ دەرچووە، ژمارە (١٥)شی کە دوا ژمارەی بووە لە ٢٧ی ئاداری ١٩٧٠ دەرچووە جەمال خەزنەدار، رابەری رۆژنامەگەری ی کوردی، مط الجمهورية، بغداد، ١٩٧٣ ، ل١٠٤.

(٢٢٩) دیدار لەگەڵ نەوشیروان مستەفا ئەمین، سلێمانی، ٥/١١/٢٠٠٢.

کاریگەرییەکی گەورەیان کردبووە سەر نەشونماکردنی ئەو بیروباوەڕە لای ڕووناکبیرو لاوە خوێنگەرمەکانی کورد[٢٣٠]

٣. فاکتەرێکی دیکەی بڵاوبوونەوەی بیروباوەڕی ماویزم لەسەر بنەمای بیری مارکسیزم–لینینیزم، کردنەوەی ئەو خولە ڕووناکبیرییانە بوو کە جەلال تاڵەبانی لە بەغدا لە ساڵانی ١٩٦٩ و ١٩٧٠ بۆ هەندێ لە لاوان و ئەو قوتابیە کوردانەی کە لە زانکۆی بەغدا دەیانخوێندو سەر بە باڵی (برایم ئەحمەد–جەلال تاڵەبانی/ "م.س") بوون، سازی کردبوون[٢٣١]. ئەو بابەتانەش کە لەو خولانە پێشکەش دەکران لە سەرچاوەکانی جووڵانەوەی چەپ و ئایدیۆلۆژیای ماویزمەوە هەڵقوڵابوون یەکێك لەو بابەتانەش بەناونیشانی (بەرەی نیشتمانیی یەکگرتوو) بوو کە لەلایەن جەلال تاڵەبانییەوە نووسرابوو[٢٣٢]

ئیتر ئەو بیروباوەڕەو هێڵە فیکرییەی ئەوسا بووەهۆی ئەوەی کە گەنجەکانی ناو باڵی (برایم ئەحمەد–جەلال تاڵەبانی/ "م.س")، دوو دوو سێ سێ پێکەوە کتێب بکڕن و بیخوێننەوەو ئەڵقەی ڕووناکبیریی بکەنەوە بۆ خۆڕووناکبیرکردنیان، لەمەشەوە چەندین ئەڵقەی لەو چەشنە دروستبوون کە هەندێکیان ئاگاداری یەکتر بوون ووردە ووردەش ئەو ئەڵقانە فراوانبوون و دواتریش یەکیان گرتەوەو ڕێکخراوی کۆمەڵەی مارکسیی–لینینیی کوردستانیان دامەزراند[٢٣٣]. شایانی باسیشە ئەو سەردەمە دۆخی ناو یەکێتی قوتابیانی کوردستان دۆخێکی پڕ لە

---

(٢٣٠) دیدار لەگەڵ فەرەیدوون عەبدولقادر، سلێمانی، ٢٤/٩/٢٠٠٣.

(٢٣١) دیدار لەگەڵ ئەرسەلان بایز، سلێمانی، ٢١/٩/٢٠٠٣.

(٢٣٢) دیدار لەگەڵ فەرەیدوون عەبدولقادر، سلێمانی، ٢٤/٩/٢٠٠٣.

(٢٣٣) دیدار لەگەڵ ئەرسەلان بایز، سلێمانی، ٢١/٩/٢٠٠٣.

پرسیارو گفتوگۆو سازدانی سیمنیار بوو[٢٢٤]، کە ئەمەش زەمینەیەکی لەباربوو بۆ پەرەسەندنی بیری پێشکەوتنخواز.

هەموو ئەوانەی لەسەرەوە خستمانەڕوو، فاکتەری کاریگەربوون بۆ تەشەنەکردنی بیروروباوەڕی مارکسیزم-لینینیزم-ماویزم لەنێو لاوانی کوردو رەخساندنی زەمینەیەکی لەباریش بوو بۆ هاتنەکایەی رێکخراوێکی چەپی کوردستانیی.

لەنێو ئەو بارودۆخەدا سێ گروپی چەپڕەو سەریان هەڵدا[٢٣٥]، کە جەلال تاڵەبانی و شەهاب شێخ نووری[*] و نەوشیروان مستەفا ئەمین هەریەکەیان سەرپەرشتی گروپێکی دەکرد[٢٣٦] هەریەك لەو گروپانەش، هەمیشە ئەندامانیان

---

(٢٣٤) دیدار لەگەڵ فەرەیدوون عەبدولقادر، سلێمانی، ٢٠٠٣/٩/٢٤.

(٢٣٥) دیدار لەگەڵ نەوشیروان مستەفا ئەمین، سلێمانی، ٢٠٠٢/١١/٥.

(*) شەهاب شێخ نووری ساڵی ١٩٣٢ لەشاری سلێمانی لەدایك بووەو کوڕی شێخ نووری شێخ ساڵحی شاعیرەو هەر لە منداڵییەوە لە نێو ژیانی سیاسی و نیشتمانپەروەرییدا قاڵبووە. ساڵی ١٩٦١ پێوەندیی بەشۆڕشی کوردستانەوە کردووەو دواتر هێزی چەپڕەویی هەڵگرتووەو یەکێك بووە لەدامەزرێنەرانی کۆمەڵەی مارکسیی- لینینیی کوردستان. ساڵی ١٩٧٥، دوای تێکچوونی باری سیاسیی کوردستان و دەسگیرکردنی ژمارەیەك لە هاوڕێیانی، لەگەڵ ژمارەیەك هاوڕێیانی دیکەیدا چۆتە ئێران، لەوێدا رژێمی ئێران دەسگیریکردوون و ساڵی١٩٧٦ بەرانبەر (١٠) ئەفسەری خۆی کە پێشتر لە عێراق دەسگیرکرابوون، ئاڵوگۆڕیکردوون و لە زیندانی بەعس ئاخنراون. شەهاب شێخ نووری لە ١٩٧٦/١١/٢١دا لە سێدارە دراوە.

(٢٣٦) دیدار لەگەڵ ئاسۆ شێخ نووری، سلێمانی، ٢٠٠٣/٩/٢١؛ دیدار لەگەڵ شاخەوان عەباس، هەولێر، ٢٠٠٣/٤/٣٠؛ دیدار لەگەڵ کۆسرەت رەسول عەلی، سلێمانی، ٢٠٠٣/٩/٢٢، کۆسرەت رەسول عەلی ساڵی ١٩٥٢ لە هەولێر لەدایك بووە، دەرچووی پەیمانگەی کشتوکاڵەو لە ریزەکانی یەکێتی قوتابیانی کوردستان کاری کردووە، پاشان لە ساڵی

لە گفتوگۆو تاوتوێکردنی ڕای یەکتر بوون بۆ پێکهێنانی ڕێکخراوێکی مارکسیی—لینینیی کوردستانیی کە بتوانێت پرسە چینایەتی و نەتەوایەتییەکان پێکەوە گرێبدات و خەباتیان لەپێناودا بکات. لەبەرئەوەی ئەندامانی هەرسێ گروپەکەش لەناو باڵی (برایم ئەحمەد—جەلال تاڵەبانی/ "م.س") بوون، بۆیە بیروڕاکانیان لە یەکتر نزیك بوون و بەشێوەیەکی گشتیش زۆربەیان لەژێر کاریگەریی جەلال تاڵەبانیدا بوون(٢٣٧)

دوای ڕاگەیاندنی بەیاننامەی ١١ی مارتی ١٩٧٠ش، ئەوانەی ئەو بیرۆکەیان لەلا گەڵاڵە ببوو، پێیان وابوو لە ڕۆژگارێکدا ئەو پارتەی برایم ئەحمەد سەرکردایەتی دەکات بمێنێ، بۆشاییەکی سیاسیی بۆ گەشەی ئەو تێزە فیکرییە نارەخسێ، هەربۆیەش ئەوانەی کۆششیان بۆ پێکهێنانی ڕێکخراوێکی چەپ دەکردو دواتر کۆمەڵەی مارکسیی—لینینیی کوردستانیان دامەزراند، فاکتەرێکی چالاك بوون بۆ هەڵوەشاندنەوەی پارتەکەی برایم ئەحمەد. هاوکاتیش، پێیان وابوو ئەو دوو حیزبە (واتا پارتی دیموکراتی کوردستان بەهەردوو باڵەکەیەوە)،

---

١٩٧٦دا پێوەندیی بە کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان کردووە. ساڵی ١٩٧٧ لە لایەن ڕژێمی بەعس دەستگیر کراوە، دواتر ئازاد کراوە. ساڵی ١٩٧٨ و ١٩٧٩ ئەندامی سەرکردایەتی کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان بووە. ساڵی ١٩٨٤ بۆتە ئەندامی سەرکردایەتی یەکێتی نیشتمانی کوردستانو لێپرسراوی مەڵبەندی هەولێر، ساڵی ١٩٨٨ بۆتە لێپرسراوی ڕێکخستنو ساڵی ١٩٩١ بۆتە ئەندامی مەکتەبی سیاسیی یەکێتی نیشتمانی کوردستانو لێپرسراوی بەرەی کوردستانی لە هەولێر، ساڵی ١٩٩٢ بۆتە ئەندامی پەرلەمانی کوردستان. ساڵی ١٩٩٣ش بۆتە سەرۆکی حوکمەتی هەرێمی کوردستان. ئێستاش لێپرسراوی کارگێڕی مەکتەبی سیاسیی یەکێتی نیشتمانی کوردستانە. دیدار لەگەڵ کۆسرەت ڕەسول عەلی، سلێمانی، ٢٠٠٣/٩/٢٢

(٢٣٧) دیدار لەگەل شاخەوان عەباس، هەولێر،٢٠٠٣/٤/٣٠.

لەڕووی پێکهاتەی چینایەتی و ڕەوتی سیاسیی و ئایدیۆلۆژییەوە لەیەکچوون، بۆیە بەباشتریان دەزانی بۆئەوەی حیزبێکی تری خاوەن سیاسەت و ئایدۆلۆژیای نوێ بێتە نێو گۆڕەپانی سیاسیی کوردستان، هەردوو حیزبەکە یەکتر بگرنەوە[(٢٣٨)]

لەو هەلومەرجەدا سێ لاوی چەپڕەوی کورد (شەهاب شێخ نووری و فازڵ مەلا مەحمودو فەرەیدوون عەبدولقادر) دەستپێشخەرییان کردو بڕیاریاندا بۆ دامەزراندنی ڕێکخراوێکی هەڵگری بیرو ڕێبازی سیاسیی نوێ، هەنگاو بنێن. ئەوان هەرچەندە هەستیان بە هەبوونی کەرەسەیەکی بەپێز دەکرد، وەکو ئەو سیاسەتمەدارو ڕووناکبیرانەی لە گۆڤاری ڕزگاری ئالآ بوون و ئەو لایەنگیرییەی کە لە ڕیزەکانی قوتابیاندا پەیدایان کردبوو، بەڵام پێویستیان بە کەسێك بوو کە شارەزابێ، تەمەنی هەبێ، ناوداربێ لەناو جووڵانەوەی ڕزگاریخوازی کوردستاندا، چونکە ئەوانیدیکە هەموویان گەنج بوون و زۆربەشیان قوتابی زانکۆ بوون. لەبەرئەوە پێوەندییان بە جەلال تاڵەبانییەوە کرد بۆ ڕێنوێنیکردنیان[(٢٣٩)] ئەویش پێی گوتبوون: یەکەمیان دەبێ بزانم کێن ئەوانەی بەم کارە هەڵساون. دووەمیان دەبێ کوردستانی بن، ئەگینا ئیشتان لەگەڵدا ناکەم. کاتێکیش زانی شەهاب شێخ نووری ڕۆڵی سەرەکی لەم کارەدا هەیە، زۆر خۆشحاڵبوو، لەبەرئەوەی بە کەسێکی بەتواناو لێهاتووی دەزانی، تەنانەت ماوەیەك دوای ئەوە جەلال تاڵەبانی لە نامەیەکیدا بۆ کۆمەڵەی مارکسیی-لینینیی کوردستان سەبارەت بە شەهاب دەڵێت: "من ئامادەم سەرباز بم لە لەشکرێکدا، شەهاب فەرماندەی بێت"، بەم جۆرە جەلال تاڵەبانیش چووە نێو ئەو ڕێکخستنەوە[(٢٤٠)]

---

(٢٣٨) دیدار لەگەڵ نەوشیروان مستەفا ئەمین، سلێمانی، ٢٠٠٢/١١/٥.

(٢٣٩) دیدار لەگەڵ فەرەیدوون عەبدولقادر، سلێمانی، ٢٠٠٣/٩/٢٤.

(٢٤٠) دیدار لەگەڵ ئاوات عەبدولغەفور، سلێمانی، ٢٠٠٣/٩/٢١.

لەهەمان کاتیشدا پێوەندییان بە نەوشیروان مستەفا ئەمین و شازاد سائیب و مەحمودی مەلا عیزەت و شاسوار جەلال/ ئارام و جەعفەر عەبدولواحیدو فوئاد قەرەداغی و دلێر سدیق و ژمارەیەکی زۆر لە هاوڕێیانی دیکەیان کرد. لەو پێوەندییەدا نەوشیروان گوتبووی: ئەوە بڕیارێکی باشەو ئێمەش ئامادەین، بەڵام با جەلال تاڵەبانی تێدا نەبێت، لەبەرئەوەی ئەویش یەکێك بووە لە بەرپرسەکانی شکستی ئەزموونەکانی پێشووتری جووڵانەوەی کورد. جگەلەوەش نەوشیروان پێی وابوو کە ئەگەر جەلال تاڵەبانی لەنێو ئەو ڕێکخستنە نوێیەدابێ، ئەوا بەهۆی شارەزایی و لێهاتووییەکەی، دەبێ لە هەموو شتێك لە ڕیزی پێشەوە دابێت و دەبێتە کەسی یەکەمی ئەو ڕێکخستنەش، بەمەش سیاسەت و بیروباوەڕی ئەو بەسەر ڕێکخراوە سیاسییە نوێیەکەدا زاڵ دەبێ و گەشەی پێدەدرێت[٢٤١]. کەچی جەلال تاڵەبانیش دەڵێت: من خۆم قسەم لەگەڵ نەوشیروان مستەفا کرد، بۆئەوەی بێنە نێو ئەو ڕێکخستنەوە، بەڵام ئەوان لە سلێمانی تاقمێك بوون سەریان پێکەوەنابوو و (شەهاب شێخ نووری)یان قبوڵ نەبوو[٢٤٢]

هەرچۆنێك بێت جموجۆڵ دەستپێکرد بۆ دامەزراندنی ڕیکخراوەکەو نەوشیروان مستەفا تێیدا بەشدار نەبوو، بەڵکو تەنها پێوەندییەکی تاکەکەسی لەگەڵ دروستکردن و گوتبووشی: هەموو هاوڕێیانی خۆم ئاراستە دەکەم کە بێنە نێو ئەم ڕێکخراوە، بەڵام خۆم نایەم بۆ سەرکردایەتیکردنی[٢٤٣]

بارودۆخەکە بەم شێوەیە ڕۆیشت تاکو لە ١٠ی حوزەیرانی ١٩٧٠دا کۆبوونەوەی دامەزراندنی کۆمەڵەی مارکسیی–لینینیی کوردستان لە بەغدا

---

(٢٤١) دیدار لەگەڵ فەرەیدوون عەبدولقادر، سلێمانی، ٢٤/٩/٢٠٠٣.

(٢٤٢) دیدار لەگەڵ جەلال تاڵەبانی، هاوینەهەواری دوکان، ١٢/٦/٢٠٠٤.

(٢٤٣) دیدار لەگەڵ فەرەیدوون عەبدولقادر، سلێمانی، ٢٤/٩/٢٠٠٣.

سازدرا، ئەوانەی تێیدا بەشداریشیان کرد بریتی بوون لە جەلال تاڵەبانی و شەهاب شێخ نووری و فەرەیدوون عەبدولقادرو دلێر سدیق و فوئاد قەرەداغی، لەبەرئەوەی زۆربەشیان خوێندکاری زانکۆ بوون لە بەغدا یاخود شوێنی نیشتەجێبوونیان لەوێبوو، بۆیە کۆبوونەوەکە لەو شارە ئەنجامدرا. لەو کۆبوونەوەیەشدا هەندێ هێڵی گشتی بۆ نووسینەوەی دەستوورو بەیاننامەیەك دەستنیشانکران و فەرەیدوون عەبدولقادرو فوئاد قەرەداغی بۆ پوختەکردن و دارشتنەوەیان راسپێردران، پێش بڵاوکردنەوەش، بۆ چاوپێخشاندنەوەو دەسکاریکردن، دەستوورەکەیان بۆ جەلال تاڵەبانی نارد. ئیدی (دەستووری کۆمەڵەی مارکسیی–لینینیی کوردستان)، بووە یەکەم بڵاوکراوەی کۆمەڵە[٢٤٤]

ئەو رێکخراوە بۆ ئەوەی هەر لەسەرەتاوە ناسنامەی خۆی لە حیزب و هێزە سیاسییەکانی دیکە جیابکاتەوەو، بێ پێچ وپەنا رێبازی خۆی دیاری بکات و لەبواری کارو جێبەجێکردندا ناوەرۆکی بیروباوەڕی مارکسیزم–لینینیزم دەربخات ناوی خۆی نا (کۆمەڵەی مارکسیی–لینینیی کوردستان)[٢٤٥] لەوەش زیاتر ئەو ناوە بەو مەبەستە بوو ئەو کەسانە کۆبکاتەوە کە باوەڕیان بەم ئایدۆلۆژیایە هەبوو، رێکخراوەکەش هەر بۆ رێکخستن و یەکخستنی هێزە مارکسییەکانی نێو کوردستانیش دامەزرابوو، سەرچاوەکانی ئایدۆلۆژیاشی بریتی بوون لە مارکسیزم–لینینیزم و ئەندێشەی ماوتسی تۆنگ[٢٤٦] لەژێر کاریگەریی ئەو سەرچاوە

---

(٢٤٤) دیدار لەگەڵ فەرەیدوون عەبدولقادر، سلێمانی، ٢٠٠٣/٩/٢٤.

(٢٤٥) بڕوانە: "کۆمەڵە" (ئۆرگانی ناوەندیی کۆمەڵەی مارکسیی–لینینیی کوردستان)، ژ(٢)، زستانی ١٩٧٩، ل١٢ (٤٢).

(٢٤٦) دیدار لەگەڵ جەلال تاڵەبانی، هاوینەهەواری دوکان، ٢٠٠٤/٦/١٢.

ئایدۆلۆژییایەش کۆمەڵە دروشمی (ئەی کرێکاران‌و گەلانی زۆرلێکراوی جیهانی یەکگرن)ی بەرزکردبۆوە[٢٤٧].

کۆمەڵە بەنهێنی دامەزراو زۆر بەنهێنیش کارەکانی ئەنجامدەدا تاکو نسکۆی جووڵانەوەی رزگاریخوازی کوردستان لە ساڵی ١٩٧٥[٢٤٨] لەپێناو پاراستنی رێکخراوەکەش بە ئاسانی متمانە بە هەموو کەس نەدەکرا، بەڵکو کەسانی رووناکبیرو چەپڕەو لەنێو ئەڵقەی رووناکبیریی کۆدەکرانەوەو بۆ ماوەیەك پەروەردە دەکران کە هەبوو ماوەکەی شەش مانگ بوو هەشبوو دووساڵ بوو، ئیتر بەپێی تێگەیشتن و پابەندی ئەو کەسە بەراستگۆیی و چەپی راستەقینەوە تاکو بە تەواوی متمانەی پێدەکرا، ئینجا پێی دەوترا رێکخراوێکی نهێنی هەیە بەناوی کۆمەڵەی مارکسیی–لینینیی کوردستان[٢٤٩] تەنانەت هەندێ جار کەسێك دوای پەروەردەکردنی دەگەیشتە ئەو ئاستەی بیر لە دروستکردنی رێکخراوێکی چەپی کوردستانی بکاتەوە، ئینجا کۆمەڵەی پێ دەناسێنراو دەخرایە نێو

(٢٤٧) دیدار لەگەڵ فەرەیدوون عەبدولقادر، سلێمانی، ٢٠٠٣/٩/٢٤؛ دیدار لەگەڵ سەعدون یەدوڵڵا شەفی فەیلی، سلێمانی، ٢٠٠٣/٩/٢١. سەعدون فەیلی ساڵی ١٩٥٣ لە شاری بەغدا لەدایك بووە. سەرەتای حەفتاکان پێوەندیی بە رێکخستنەکانی کۆمەڵەی مارکسیی–لینینیی کوردستانەوە کردووە. ساڵی ١٩٧٩ لە زیندانی بەعس، شەشەمی ئامادەیی تەواو کردووە، پاش ئازادکردنیشی لە ئەکادیمیای هونەرە جوانەکانی بەغدا وەرگیراوە، بەڵام بەعسییەکان رێگربوونە لەبەردەم تەواوکردنی خوێندنی، بۆیە ساڵی ١٩٨٢ پێوەندیی بەهێزی پێشمەرگەی یەکێتی نیشتمانی کوردستان کردووە. ئێستاش جێگری وەزیری مافی مرۆڤ و ئاوارەو ئەنفالە. دیدار لەگەڵ سەعدون یەدوڵڵا شەفی فەیلی، سلێمانی، ٢٠٠٣/٩/٢١.

(٢٤٨) دیدار لەگەڵ جەلال تاڵەبانی، هاوینەهەواری دوکان، ٢٠٠٤/٦/١٢.

(٢٤٩) دیدار لەگەڵ حیکمەت محەمەد کەریم (مەلا بەختیار)، سلێمانی، ٢٠٠٣/٩/١٧.

ڕێکخستنەکانییەوە[250] شێوەی ڕێکخستنەکش تەزبیحی بوو کە نەیاندەهێشت ئەندامانیان یەکتری بناسن[251]، بۆ ئەوەی ئەگەر یەکێکیان پچڕا، ئەوانیدیکە ئاگایان لێنەبێ[252].

هۆکاری ئەو نهێنی کارکردنەش بە بۆچوونی کادیرانی ئەو سەردەمەی ڕێکخراوەکە دەگەڕایەوە بۆ مەترسییان بەرانبەر دەزگا ئەمنییەکانی ڕژێمی بەعس و دەزگای پاراستنی پارتی دیموکراتی کوردستان[253] تەنانەت هەندێ لەو کادیرانە دەگێرنەوە کە ئەو سەردەمە (پ.د.ك) گۆڕەپانی سیاسیی کوردستانی بۆ خۆی قۆرخ کردبوو کە نەك هەر ڕێگەیان بەڕێکخراوێکی لەم چەشنە نەدەدا بێتە نێو گۆڕەپانەکە و چالاکی سیاسیی خۆی ئەنجام بدات، بەڵکو ئەگەر هەستیان بەجووڵەی کەسێکیش کردبا بۆ ئەم کارە، بانگیان دەکرد و سووکایەتیان پێدەکرد، بەڵام بەهۆی نهێنی ڕێکخراوەکەوە، (پ.د.ك) نەیتوانیوە دەستبگرێت بەسەر کادیرانیدا[254]. هەرچی مەسعود بارزانی کەئەوکات لێپرسراوی دەزگای پاراستن بوو دەڵێت: ئێمە لەسەرەتاوە زۆر ئاگاداری جموجۆڵ و چالاکییەکانی کۆمەڵە بووین، بەڵام تەنها چاودێریمان خستبووە سەریان، هیچ کاردانەوەیەکی خراپمان بەرانبەریان نەبوو، لەبەر ئەوەی هیچ کاریکیان نەدەکرد دژی (پ. د.ك) بێت[255] کەچی جەلال تاڵەبانی دەڵێت: ئەم قسەیە وانیەو سەرەتا ئاگاداری

(٢٥٠) دیدار لەگەڵ ئاوات عەبدولغەفور، سلێمانی، ٢٠٠٣/٩/٢١.

(٢٥١) دیدار لەگەڵ فەرەیدوون عەبدولقادر، سلێمانی، ٢٠٠٣/٩/٢٤.

(٢٥٢) دیدار لەگەڵ ئەرسەلان بایز، سلێمانی، ٢٠٠٣/٩/٢١.

(٢٥٣) دیدار لەگەڵ شاخەوان عەباس، هەولێر، ٢٠٠٣/٤/٣٠.

(٢٥٤) دیدار لەگەڵ ئەرسەلان بایز، سلێمانی، ٢٠٠٣/٩/٢١.

(٢٥٥) دیدار لەگەڵ مەسعود بارزانی، هاوینەهەواری سەری ڕەش، ٢٠٠٣/٦/٢٢

چالاکییەکانمان نەبوون، بەڵکو دوای چەند ساڵێك هەستیان کردو بەدوای ئەندامانی ڕێکخراوەکەدا دەگەڕان[٢٥٦] ئاوات عەبدولغەفوریش دەڵێت: قسەکەی مەسعود بارزانی راستی زۆری تێدایە، لەبەرئەوەی کەسێك زانیاریی لەسەر کۆمەڵە پێدابوون[٢٥٧] بۆیە دەکرێ پشگیری لەبۆچوونەکەی مەسعود بارزانی بکرێ.

کۆمەڵەی مارکسیی–لینینیی کوردستان هەر لە سەرەتای دامەزراندنییەوە رووبەڕووی هەندێ کێشەو ململانێی ناوخۆیی نێو ڕێکخستنەکانی بۆوە. یەکێك لەوانەش ململانێی نێوان بیری کوردستانی و عێراقچێتی نێو ئەندامانی بوو، کە هەندێکیان لەژێر کاریگەریی (حیزبی شیوعی عێراق/ کۆمیتەی ناوەندیی)، پێیان وابوو لە وڵاتێکدا پرۆلیتاریا دەبێ یەکێتی هەبێ و ڕێکخستنەکەشی یەکگرتوو بێت. لەسەر ئەو بنەمایەش هەبوونی ڕێکخستنێکی پرۆلیتاری عێراقییان بەپێویست دەزانی، لەبەرئەوە ئاراستەی بیری عێراقچێتی لەنێو کۆمەڵە سەریهەڵدا. ئەوەی سەرکردایەتی ئەو ئاراستەیەشی دەکرد، فازڵ مەلا مەحمود بوو. سەرکردایەتی کۆمەڵەش بە ئامۆژگارییەك داوای لە ڕێکخستنی نێو شارەکان کرد، سەبارەت بەو پرسە لەنێوان خۆیاندا بکەونە گفتوگۆ[٢٥٨].

ئیتر ئەو ململانێیە قووڵ بۆوە تاوای لێهات بۆ یەکلاکردنەوەی، لەنێو ڕێکخستنەکاندا راپرسی بکرێت، ئەنجامەکەشی دەرکەوت کە ژمارەیەکی کەم لەگەڵ ئەوەبوون کە ئاراستەی بیری ڕێکخراوەکە بەرەو ئاقاری عێراقچێتی بچێت، بەڵکو زۆرینەی ئەندامان سووربوون لەسەرئەوەی کە کۆمەڵە هەر بە کوردستانی بمێنێتەوە. ئەنجامی ئەو راپرسییەش لە لێدوانێکی ناوخۆییدا ئاشکرا کراو تیایدا

---

(٢٥٦) دیدار لەگەڵ جەلال تاڵەبانی، هاوینەهەواری دوکان، ٢٠٠٤/٦/١٢.

(٢٥٧) دیدار لەگەڵ ئاوات عەبدولغەفور، سلێمانی، ٢٠٠٣/٩/٢١.

(٢٥٨) دیدار لەگەڵ فەرەیدوون عەبدولقادر، سلێمانی، ٢٠٠٣/٩/٢٤.

ئەوەشیان ڕاگەیاند کە ڕێکخستنەکە هەر بە کوردستانی دەمێنێتەوە، ئەوانەی کە لەگەڵ ئەم ئاراستەیەشدا نین دەتوانن بمێننەوەو ململانێی فیکریی خۆشیان بکەن، بەڵام دەبێ لە سەرکردایەتی بهێنرێنە خوارەوە وەکو فازڵ مەلا مەحمودو فوئاد قەرەداغی[٢٥٩]. دواتر ئەوانیش چوونە دەرەوەو وازیان لە کۆمەڵە هێنا[٢٦٠].

هەروەها کادیرانی کۆمەڵەی مارکسیی – لینینیی کوردستان پێشتر کە زۆربەیان لەنێو باڵی(برایم ئەحمەد–جەلال تاڵەبانی/ "م.س") بوون و جەماوەریشیان زیاتر لەنێو توێژەکانی ڕووناکبیرو فەرمانبەرو وردە بۆرژوادا بوو، بۆیە ئەو دوو پرسەیان بە کێشەیەك بینی و چارەسەرکردنیشیان بەپێویست زانی. چونکە پێیان وابوو ئەگەر لەو ڕێکخراوە نوێیەدا پەل نەهاوێژن بۆ ئەو کەسانەی لەڕووی بیرکردنەوە لەخۆیان نزیکن و لە دەوری خۆیان کۆیان نەکەنەوە بەتایبەتی ئەوانەی لە ریزەکانی پارتی دیموکراتی کوردستان و حیزبی شیوعی عێراق خەباتیان دەکرد، ئەوا لەنێو خەڵك بەدرێژەپێدەری باڵی جەلالی دەناسرێن، بۆیە کەوتنە هەوڵدان بۆ ڕاکێشانی ئەو کەسانە بۆ نێو کۆمەڵە. لەلایەکی دیکەشەوە ئەم کادیرانە خۆیان بە نوێنەری چینی کرێکاران و ڕەنجدەرانی کوردستان دەزانی، بۆ ئەمەش بەپێویستیان زانی بەرنامەیەکی تایبەت بەخۆیان دابنێن و خەڵکی سەر بەو چینەش لە ریزەکانی خۆیاندا کۆبکەنەوە، نەك تەنها لەنێو توێژی وردەبۆرژوادا چەقبەستبن[٢٦١].

کێشەیەکی دیکە کە ڕووبەڕووی کۆمەڵەیمارکسیی–لینینیی کوردستان بۆوە، نووری جەلال تاڵەبانی بوو لەو ڕێکخراوە، لەبەرئەوەی دوای هەڵوەشاندنەوەی

---

(٢٥٩) دیدار لەگەڵ ئاوات عەبدولغەفور، سلێمانی، ٢٠٠٣/٩/٢١.

(٢٦٠) دیدار لەگەڵ ئاسۆ شێخ نووری، سلێمانی، ٢٠٠٣/٩/٢١.

(٢٦١) هـ.س.

باڵی (برایم ئەحمەد–جەلال تاڵەبانی/ "م.س") ماوەیەك لە گەلاڵە مایەوە، پاشان لەسەر داخوازی خۆی لەساڵی ١٩٧٢ەوە چووە دەرەوەی کوردستان دوای بێئومێدبوونی لەو گۆڕانکارییانەی کە چاوەڕوان بوو مستەفا بارزانی لەناو (پ.د.ك)دا لە بەرژەوەندی ئەوو هەڤاڵانیدا بیکات[٢٦٢] ئیتر ئەو دوورکەوتنەوەیەی لە کوردستان کێشەیەکی گەورە بوو بۆ کۆمەڵە، بەمەبەستی چارەسەرکردنیشی لەو ماوەیەدا شەهاب شێخ نووری بەهۆی زیرەکی و لێهاتووییەکەیەوە، بە پراکتیکی رۆڵی سکرتێری کۆمەڵەی دەگێڕا هەرچەندە وەك رێککەوتنێك لەنێوان کادیرە بنەڕەتییەکانیدا، جەلال تاڵەبانی بە سکرتێر هەڵبژێردرا بوو. دوورییەکەشی چەندین پرسیاری لەنێو ئەو کادیرانە دروستکردبوو بۆ وەلامی ئەو پرسیارانەش، ساڵی ١٩٧٣ کۆمەڵە بەپێویستی زانی شەهاب شێخ نووری بنێرێتە سوریاو بەیروت بۆئەوەی لەنزیکەوە لەگەڵ جەلال تاڵەبانی تاوتۆی چەند بابەتێکی پێویستی رێکخراوەکە بکات و هەندێ رێنمایی لێوەربگرێت. دوای ئەوەش شەهاب گەڕایەوە کوردستان. شایانی باسیشە جەلال تاڵەبانی لەو ماوەیەی لە دەرەوە بوو، ساڵی ١٩٧٣ نامەیەکی بۆ کادیرانی کۆمەڵە ناردبووو داوای پێکهێنانی حیزبێکی نیشتمانیی فراوانی لێکردبوون، بەلام دوای تاوتوێکردنی ئەو پرسە، کادیرانی رێکخراوەکە بەو پێشنیارە رازی نەبوون[٢٦٣]

کۆمەڵە تا ساڵی ١٩٧٣ هیچ بلاوکراوەیەکی نەبوو کەبێتە زمانحاڵی، بۆ ئەوەی بیروڕاو هەڵوێستەکانی خۆی تێدا دەرببڕێت بەرانبەر رووداوەکانی کوردستان و عێراق و جیهان، بەلام لەو ساڵەدا کۆششەکانی خۆی خستەگەڕ بۆدەرکردنی بلاوکراوەیەکی خوولیی رێکوپێك بەناوی (ئالای سوور ) کەشەهاب

(٢٦٢) دیدار لەگەڵ جەلال تاڵەبانی، هاوینەهەواری دوکان، ٢٠٠٤/٦/١٢.

(٢٦٣) دیدار لەگەڵ فەرەیدوون عەبدولقادر، سلێمانی، ٢٠٠٣/٩/٢٤.

شێخ نووری ڕۆڵی سەرەکی تێدا گێڕا، بەڵام بەهۆی هەلومەرجی ئەوکاتەوە تەنها (٣) ژمارەی لێ بڵاوکرایەوە[٢٦٤].

کۆمەڵەی مارکسیی– لینینیی کوردستان درێژەی بەتێکۆشانی نهێنی خۆیدا تاکو گرژبوونی پێوەندیی نێوان ڕژێمی بەغدا و سەرکردایەتی جووڵانەوەی ڕزگاریخوازی کوردستان لەساڵی ١٩٧٤و١٩٧٥.ئیتر لەو ماوەیەدا، بەتایبەتی لەکاتی ڕێککەوتننامەی جەزائیر لەڕێگەی (شەهاب شێخ نووری)یەوە پێوەندییان بەئیدرس بارزانی و ژمارەیەك ئەندامی دیکەی سەرکردایەتی پارتی دیموکراتی کوردستانەوە کرد بۆ درێژەپێدانی شۆرش و بەرخودان، بەڵام گوێیان لێ ڕانەگیرا[٢٦٥].

(٢٦٤) "کۆمەڵە"، ژ (١) ، پاییزی ١٩٧٨ ، ل٢.

(٢٦٥) دیدار لەگەڵ فەرەیدوون عەبدولقادر، سلێمانی ،٢٠٠٣/٩/٢٤؛ دیدار لەگەڵ ئەرسەلان بایز، سلێمانی، ٢٠٠٣/٩/٢١.

## تەوەری سێیەم:

# پێوەندیی نێوان پارتی دیموکراتی کوردستان و حیزبی شیوعی عێراق

(ح.ش.ع) و (پ.د.ک) وەکو دوو هێزی سیاسیی و جەماوەری لەسەرەتای دامەزراندنیانەوە[*] ڕۆڵێکی کاریگەریان لە مێژووی سیاسیی عێراق بە گشتی و کوردستان بەتایبەتی گێڕاوە، بەڵام پێوەندیی نێوانیان هەر لەسەرەتاوەو تەنانەت لە ماوەی شۆڕشی ئەیلولیشدا لە هەڵکشان و داکشاندا بووە[٢٦٦].

ڕاگەیاندنی بەیاننامەی ١١ی مارت ١٩٧٠ش بارودۆخێکی نوێی هێنایە کایەوە، بەو هۆیەشەوە پێوەندیی نێوان (ح.ش.ع) و ( پ.د.ک) پەیوەست بوو بەو بارە نوێیەوە. ئەو دەسدرێژییانەی کە دوای ڕاگەیاندنی بەیاننامەی ١١ی مارت لەلایەن بەعسەوە دەکرایە سەر حیزبی شیوعی، زیاتر فاکتەری پتەوتر بوونی پێوەندیی نێوان (پ.د.ک) و (ح.ش.ع) بوو، ئەویش بە هۆی ئەو پشتگیرییەی کە پارتی لە شیوعییەکانی دەکرد.

---

(*) (ح.ش.ع) لە ١٩٣٤/٣/٣١ دامەزراوەو (پ.د.ک)یش لە ١٩٤٦/٨/١٦ دامەزراوە.

(٢٦٦) بۆ زانیاریی زیاتر دەربارەی ئەم بابەتە بڕوانە: مەکتەبی ناوەندیی دیراسات و توێژینەوە (پ.د.ک)،س پ، ل٥٥–٦١و ١٠٧–١٣٢، شمیئة ناجي یوسف و نزار خالد، سیرة مناضل سلام عادل ، ج٢، ط١، منشورات دار المدى، ٢٠٠٩، ص١١٨–١٤٥؛ عزیز سباهي، عقود من تاریخ الحزب الشیوعي العراقي، ج٢، منشورات "الثقافة الجدیدة"، دمشق، ٢٠٠٣، ص٥٠٥–٥١٦، ٥٦٢–٥٦٤.

پێوەندیی دۆستانەی نێوان هەردوو حیزب گەیشتبووە ئاستێك كە پارتی دیموكراتی كوردستان لە كۆنگرەی هەشتەمیدا كە سەرەتای تەموزی ۱۹۷۰ لە ناوپردان بەسترا، رێگای بە نوێنەری حیزبی شیوعی عێراقدا لەرێگەی خوێندنەوەی وتارێكیانەوە(*)، هۆڵی كۆنگرە بكەنە مینبەرێك بۆ رەخنەگرتن لە سیاسەتی بەعس، تەنانەت خوێندنەوەی ئەو وتارە نوێنەری ئامادەبووی بەعسییەكانی لە كۆنگرەكە هێندە دلگران كرد كە هەوڵی چوونە دەرەوە بدات لە هۆڵەكە و ناڕەزایی بەرانبەر بە پارتی نیشان بدات سەبارەت بەرێگەدان بۆ خوێندنەوەی وتارەكەی (ح.ش.ع)، بەڵام مستەفا بارزانی نەیهێشت نوێنەرەكەی حیزبی بەعس هۆڵی كۆنگرەكە جێبهێڵێت و گوتی: ئێوە هەقتان نیە ناڕەزایی بەرانبەر ئێمە نیشان بدەن، لەبەرئەوەی كۆنگرەی خۆمانە و میوانەكانیشمان سەربەستن لە دەربڕینی بیروڕایان لەرێگەی خوێندنەوەی وتارەكانیاندا(۲٦۷).

هەڵبەتە ئەو هەڵوێستەی پارتی لەرێگەپێدانی شاندی (ح.ش.ع) لە خوێندنەوەی ووتارە رەخنە ئامێزەكەیان بەرانبەر رژێمی بەعس، لەوەوە سەرچاوەی گرتبوو كە دەیویست شیوعییەكان وەكو كارتێكی گوشار بەرانبەر رژێمی بەعس بەكاربهێنێ و ئەوەش لە شیوعییەكان بگەیەنێت كە بەرێككەوتنیان لەگەڵ بەعس دۆستایەتیی (ح.ش.ع) و (پ.د.ك) فەرامۆش ناكات.

دوای ئەوە حیزبی شیوعی عێراق لەماوەی نێوان كۆتایی مانگی ئاب و سەرەتای ئەیلولی ۱۹۷۰ ، لە كوردستاندا لە ناوچەیەكی نزیك ناحیەی بارزان،

---

(*) ئەو وتارە لەلایەن كەریم ئەحمەد خوێندرایەوە كە ئەوكات ئەندامی مەكتەبی سیاسیی (ح.ش.ع) بوو، بۆ زانیاریی زیاتریش دەربارەی ووتارەكە بڕوانە: "التآخي"، ع(٤٧٨)، ١٩٧٠/٧/٤.

(۲٦۷) دیدار لەگەڵ كەریم ئەحمەد، هەولێر، ۲۰۰۳/۷/۲۳.

دواى تێپەڕبوونى ٢٥ ساڵ بەسەر كۆنگرەى يەكەمى، دووەمين كۆنگرەى نيشتمانيى خۆى بەست[٢٦٨]. ئەم كۆنگرەيە هەرچەندە بەهۆى رلوە دوونانى بەعسييەكانەوە لە ناوچەيەكى ژێر دەسەڵاتى پارتى ديموكراتى كوردستان بەسترا، بەڵام لەگەڵ ئەوەش بانگهێشتى نوێنەرانى (پ.د.ك) يان نەكردبوو، بۆ ئامادەبوون لە رۆژى كردنەوەى كۆنگرە[٢٦٩] پاكانەى ئەو بانگهێشت نەكردنەش بەلاى شيوعييەكانەوە ئەوە بوو كە ئەوان بارودۆخى پارتييان لەبەر چاو گرتووەو نەيانويستووە پێوەندیى نێوان پارتى و حيزبى بەعس گرژى تێبكەوێت لەبەرئەوەى بەعسييەكان ئەو كاتە دوژمنايەتى (ح.ش.ع) يان دەكرد[٢٧٠].

سياسەتى توندوتيژى بەعسييەكان بەرانبەر شيوعييەكان ، بووە هۆى پتەوتر بوونى پێوەنديى نێوان پارتى و حيزبى شيوعى ، ئەوە بوو مستەفا بارزانى رايگەياند: "دەرگا دەكەمەوە بۆ گشت ئەو كەسانەى پەنامان بۆ دێنن" ئەوەش ئاماژە بوو بۆ پەنادانى شيوعيەكان كە دووچارى ئەشكەنجەدانى رژێمى عێراق ببوون[٢٧١]، كە ئەو هەڵوێستەى مستەفا بارزانييش لەساڵى (١٩٦٣)ەوە نوێنراوە.

جگەلەوەش (ح.ش.ع) بنكەى سەربازى لە زۆربەى ناوچەكانى كوردستان هەبوو كەلە چوارچێوەى لەشكرى كوردستان و بەبڕيارى مستەفا بارزانى دەجووڵان[٢٧٢] هەموو ئەوانەش ئەوە دەسەلمێنن كەوا (پ.د.ك) دواى رێككەوتنشيان لەگەڵ رژێمى بەعس، حيزبى شيوعى عێراقيان بە دۆستى ستراتيژى خۆيان زانيوە بۆيە بەم شێوەيە مامەڵەيان لەگەڵدا كردوون.

---

(٢٦٨) صلاح الخرسان، صفحات من تاريخ العراق السياسي الحديث، ص١٣٦.

(٢٦٩) پارتى ديموكراتى كوردستان (سەركردايەتى كاتى)، س پ، ل٣٥.

(٢٧٠) ديدار لەگەڵ كەريم ئەحمەد، هەولێر، ٢٢/٧/٢٠٠٣.

(٢٧١) ژيرارد چاليان، گەلێكى پەژموردەو نيشتمانێكى پەرت، سويد، ١٩٩٨، ل٢٩٣.

(٢٧٢) ديدار لەگەڵ بەهائەدين نوورى، سلێمانى، ١٨/٩/٢٠٠٣.

کاتێکیش ئەیلولی ۱۹۷۱ بەعس پیلانێکی سەرنەکەوتووی بۆ لەناوبردنی مستەفا بارزانی ئەنجامدا، شاندێکی بالآی حیزبی شیوعی عێراق کە لە عەزیز محەمەد سکرتێری حیزب و موکەرەم تاڵەبانی و دکتۆر رەحیم عەجینەو کەریم ئەحمەدو عەبدولرەزاق ئەلصافی ئەندامانی لیژنەی مەرکەزی و مەکتەبی سیاسیی پێکهاتبوو، سەردانی سەرۆکی(پ.د.ک)یان کرد بۆ پیرۆزبایی لێکردنی بەبۆنەی دەربازبوونی لەو پیلانگێرییەو داواشیان لێکرد دان بە خۆیدا بگرێت[۲۷۳]

شایانی باسیشە وێڕای پێوەندیی دۆستانەی نێوان هەردوو حیزب، بەلام (پ.د.ک) لە ۱۱ی مارت ۱۹۷۰ەوە بەتەنیا کاروباری کارگێری لە کوردستاندا دەگێرا، دوور لە بەشداركردنی (ح.ش.ع)، گەرچی شیوعییەکان داوای بەشداربوونیان کردووە[۲۷٤]. تەنانەت ئەو کاتە لە لایەن خودی عەزیز محەمەدیشەوە ئەو پرسە بەرانبەر (پ.د.ک) وروژێنراوە، بەلام پارتی گوێی پێنەداوە[۲۷٥]. دیارە هۆکاری رەتکردنەوەی داواکارییەکەشیان هەروەك مەسعود

---

(۲۷۳) مسعود البارزاني، البارزاني والحركة التحررية الكردية، ج۳، ص۲٦۷.

(۲۷٤) راپۆرتی کۆبوونەوەی تەواوی کۆمیتەی ناوەندیی حیزبی شیوعی عێراق، ۲٥ی کانونی دووەمی ۱۹۷٤، لە بلاوکراوەکانی بیری نوێ، ل٦۲

(۲۷٥) دیدار لەگەڵ عەزیز محەمەد، هەولێر، ۲۰۰٤/۳/۱٥. عەزیز محەمەد ساڵی ۱۹۲٤ لە گوندی (بێرکۆت)ی شاری هەولێر لەدایکبووە. پێش تەمەنی ۱۸ ساڵی چۆتە نێو ژیانی سیاسیی و سەرەتا لە (حیزبی هیوا) دەستیپێکردووە، پاشان لە ساڵی ۱۹٤۳دا پێوەندیی بە (کۆمەڵی میللەت) کردووە کە دواتر ئەو رێکخراوە بۆتە بەشێك لە (یەکێتی تێکۆشین)، پاشانیش چۆتە نێو (حیزبی شۆرش). زستانی ۱۹٤٥ چۆتە نێو (ح.ش.ع). ساڵی ۱۹٤۸– ۱۹٥۸ لە زینداندا ژیانی بردۆتەسەر، پاشان دوای ئازادبوونی کرا بە ئەندامی کۆمیتەی ناوەندیی (ح.ش.ع)و ساڵی ۱۹٥۹ش بۆتە ئەندامی مەکتەبی سیاسیی. ساڵی ۱۹٦٤– ۱۹۹۳ سکرتێری (ح.ش.ع) بووە. دیدار لەگەڵ عەزیز محەمەد، هەولێر. ۱٥/۳/۲۰۰٤.

بارزانى جەختى لەسەر كردەوە بۆ ئەوە دەگەڕايەوە كە بەعس رازى نەدەبوو لەڕێگەى پارتييەوە، حيزبى شيوعى لە هيچ شتێك بەشدار ببێت، تەنانەت بەوەش رازى نەبوو كە ئەندامێكى ئەو حيزبە لەڕێگەى (پ.د.ك)ەوە دابمەزرێت[٢٧٦]، ئەو پرسەش بووە فاكتەرێكى لاوازبوونى پێوەنديى نێوان پارتى و حيزبى شيوعى.

كاتێكيش حيزبى بەعس پرۆژەى پەيمانى كارى نيشتمانيى[*] لە تشرينى دووەمى ١٩٧١ خستە ئاراوە، (ح.ش.ع) بەرەوپيرى ئەو پرۆژەيە چوو، دەستى بە گفتوگۆيەكى راستەوخۆ كرد لەگەڵ بەعس[٢٧٧] لەماوەى گفتوگۆكانيشيدا بەشێكيان كەوتبوونە ژێر كاريگەريى پيلانەكانى رژێمى بەعس دژى پارتى، لەهەمان كاتيشدا بەشێكى پارتى ديموكراتى كوردستانيش گوێيان بە تێكچوونى پێوەندييەكانيان نەدەدا لەگەڵ حيزبى شيوعى عێراق، بەڵكو هيواشيان بۆ ئەو تێكچوونە دەخواست[٢٧٨] ئەوەش فاكتەرێكى ديكەى ساردى پێوەنديى نێوانيان بوو.

وێڕاى ئەوانەش لە ١٣ى ئايارى ١٩٧٢ شاندێكى مەكتەبى سياسيى حيزبى شيوعى عێراق هاتنە كوردستان و سەردانى مەكتەبى سياسيى پارتى ديموكراتى كوردستانيان كرد بۆ گفتوگۆكردن لە پێناوى پلاندانانى هاوكاريى كردن لەنێوان هەردوو حيزبدا لەئەنجامدا رێككەوتنێكى بەرەييان مۆركرد كە چەند تەوەرێكى

---

(٢٧٦) ديدار لەگەڵ مەسعود بارزانى، هاوينەهەوارى سەرى رەش، ٢٠٠٣/٦/٢٢.

(*) سەبارەت بەو پرۆژەيە بڕوانە: وزارة الاعلام مديرية الاعلام العامة: ميثاق العمل الوطني، مط الجمهورية، بغداد، ١٩٧١.

(٢٧٧) لە بەڵگەنامەكانى سێيەمين كۆنگرەى حيزبى شيوعى عێراق ئايارى ١٩٧٦، لەپێناوى چەسپاندن و قووڵكردنەوەى رێڕەوى شۆڕشگێڕانەى عێراقدا رووەو سۆشياليزم، چاپخانەى (الرواد)، ل٣٨.

(٢٧٨) پارتى ديموكراتى كوردستان (سەركردايەتى كاتى)، س پ، ل٣٦.

گرنگی لە خۆگرتبوو وەك دەسەڵاتدارێتی سیاسیی لە عێراق و پرسی کورد و هاوکاریی نیشتمانیی[٢٧٩]. بەڵام دوای گەڕانەوەی شاندەکەی حیزبی شیوعی بۆ بەغدا یەکسەر ڕێبازی دژ بەهاوکاریی کردن لەگەڵ پارتی لەناویاندا پەرەیسەندو توانی کاریکاتە سەر سەرکردایەتی ئەو حیزبە تاکو خۆی لە ڕێککەوتنەکە بکێشێتەوە بەبیانووی ئەوەی کەڕێککەوتن لەگەڵ (پ.د.ك) کارێکی خراپ دەکاتە سەر گفتوگۆکانی (ح.ش.ع) لەگەڵ بەعس کە ئەوەش ڕاست نەبوو ، لەبەرئەوەی ڕێککەوتنەکە بە هیچ شێوەیەك دژی حیزبی بەعس نەبوو، بەپێچەوانەشەوە تیایدا داوای پتەوکردنی هاوکاریی کرا بوو لەگەڵ حیزبی بەعس[٢٨٠] ئەوەش گرژی پێوەندیی نێوانیانی زیاترکرد و کاتێکیش لە ١٥ی ئایاری ١٩٧٢ (ح.ش.ع) بە دوو وەزیر[*] بەشداری لە حوکمەتدا کرد، (پ.د.ك) شاڵاوێکی ڕاگەیاندنی کردەسەریان، هەرچەندە خۆیشیان لە دوای ڕاگەیاندنی بەیاننامەی ١١ی مارت ١٩٧٠ ەوە بە پێنج وەزیر لەو حوکمەتەدا بەشداربوون[٢٨١]، دیارە هۆکاری ئەو هەڵوێستەی پارتییش بۆ ئەوە گەڕاوەتەوە کە ( ح.ش.ع) هەر لەگەڵ بەشداربوونی لەوەزارەت هەڵوێستیان بەرانبەر بە کورد گۆڕاوە، بەڵام نەك هەر هەموویان، بەڵکو

---

(٢٧٩) بۆ زانیاریی زیاتر دەربارەی خاڵەکانی ئەو ڕێککەوتنە دووقۆڵییە بڕوانە: ڕۆژنامەی "برایەتی"، ژ(٢٢)، ١٩٧٤/٢/٢.

(٢٨٠) ڕۆژنامەی "برایەتی"، ژ(٢٣)، ١٩٧٤/٢/٤.

(*) دوو وەزیرەکەی حیزبی شیوعی یەکێکیان دکتۆر موکەڕەم تاڵەبانی (وەزیری ئاودێری)و ئەویتریان عامر عەبدوڵڵا (وەزیری دەوڵەت) بوون کە هەردووکیشیان ئەندامی کۆمیتەی ناوەندیی (ح.ش.ع) بوون.

(٢٨١) د. مكرم الطالباني، نحو حل صحيح للمسألة القومية الكردية في العراق، بغداد، ١٩٩٥ (مخطوطة وغير منشورة)، ص٢٨٢.

سەرەڕاى ئەوەى كە هەندێكيان بەرەو پيرى بەعس چوون ، هەندێكى ديكەيان خۆيان قورس ڕاگرت[(٢٨٢)]

بەو شێوەيە پێوەنديى نێوان ئەو دوو حيزبە لەو كاتەوە بەرەو گرژى زياتر دەڕۆيشت، بەڵام بەر لە ڕاگەياندنى بەرەى نيشتمانيى و نەتەوەيى پێشكەوتنخواز[(*)]، مستەفا بارزانى ڕەشنووسێكى پێشكەشى (ح.ش.ع) كرد بۆ بەرنامەى هاوكاريى نێوان هەردوولا بەمەبەستى دوور خستنەوەى لەبەرەى ناوبراوو كەنارگيركردنى حيزبى بەعس. حيزبى شيوعيش لە بەرانبەر ئەو پێشنيازەدا ئەمانەى خوارەوەى پێشنيازكرد –

١– فراوانكردنى بنكەى بەرە بۆ گرتنەخۆى سەرتاپاى حيزب و هێزە نيشتمانييەكان، لەوانەش حيزبى بەعس.

٢– ئامانجى بنەڕەتى ئەو هاوكارييە، كارى هاوبەشى دڵسۆزانە بێ بۆ پاراستنى سەربەخۆيى وڵات و ئارامى خاكەكەى و تێكۆشان دژى دەست وپێوەندەكانى كۆنەپەرستى و كۆلۆنياليزمى ناوچەكە.

٣– سووربوون لەسەر چارەى ئاشتىو ديموكراسى پرسى كورد.

كەچى مستەفا بارزانى سووربوو لەسەر ئەوەى بەرەيەكى دوو قۆڵى بێ لە نێوان (پ.د.ك) و (ح.ش.ع) بە ئامانجى ڕووخاندنى فەرمانڕەوايى بەعس ، بەڵام حيزبى شيوعى بڕواى وابوو كەبەرەيەكى لەو جۆرە لەشوێنى خۆيدا هەڵدەخليسكێ بۆ پێگەى پيلانى كۆلۆنياليزم[(٢٨٣)] ئەوەش ئەوە دەسەلمێنێ كە حيزبى شيوعى لەو سەردەمەدا كەوتبووە ژێر كاريگەريى ئەو دروشمە

(٢٨٢) پارتى ديموكراتى كوردستان (سەركردايەتى كاتى)، س پ، ل٣٥.

(*) بەرەى ناوبراو بەرەيەكى دووقۆڵى نێوان حيزبى شيوعى عێراق و حيزبى بەعس بوو كە لە ١٧ى تەمووزى ١٩٧٣ مۆركرا.

(٢٨٣) د. مكرم الطالباني، نحو حل صحيح للمسألة القومية الكردية في العراق، ص٢٨٠

دیماگۆجییانـەی بەعـسییەکان بانگەشـەیان بـۆ دەکـرد، کـە لـە پرسـەکانی سۆشـیالیزمو بەرەنگاربوونـەوەی هێـزە ئیمپریالیـستەکان خـۆی دەنوانـد. جگەلەوەش (ح.ش.ع) بەردەوام لەژێر کاریگەریی یـەکێتی سـۆڤیەتدا بـووە، بۆیـە دەتوانین بڵێین پەیماننامەی دۆستایەتیی و هاوکاریی نێوان مۆسکۆو بەغدا کە ساڵی ۱۹۷۲ مـۆرکرا، فاکتـەرێك بـوو بـۆ هانـدانی سـەرکردایەتی (ح.ش.ع) بـۆ هاوپەیمانێتی لەگەڵ بەعس و لەبیرکردنی ئەو کارەسات و مەینەتییانەی کە ساڵی ۱۹٦۳ بەدەستی بەعسییەکان دووچاری هاتبوو.

هەرچـۆنێك بێـت لـە ۱۷ی تـەموزی ۱۹۷۳ بـەرەی دووقـۆڵی لـەنێوان حیزبـی شـیوعی و حیزبـی بـەعس مـۆرکرا[٢٨٤]. دوای ئـەوەش بـەرێنمایی بەعـسییەکان، (ح.ش.ع) هـەوڵی دەدا بـۆ رازیکردنـی (پ.د.ك) بـۆ ئـەوەی وەکـو لایـەنی سـێیەم بـچێتە نـاو ئـەو بەرەیـەوە. بـۆ ئـەو مەبەسـتەش یـەك بـە دوای یـەك شـاندی سەرکردایەتی دەناردە لای مستەفا بارزانی، بەڵام سەرکردایەتی پارتی ئـەو شـێوە بەرەییـەی رەتکـردەوە کـە تیایـدا دەسـەڵاتی راسـتەقینە بدرێتـە بەعـسییەکان و ئـەوانیش و حیزبـی شـیوعییش رۆڵـی لاوەکـی تێـدا ببیـنن[٢٨٥] کەچـی (ح.ش.ع) بڕوای وابوو کە پێکهێنانی بەرەی نیشتمانیی بۆ پرسی کورد بەسـوودەو هـەروەها وایدەبینی کە ئەوان لەگەڵ حیزبێکی نیشتمانیی پێشکەوتنخوازدا نەوەك لایەنێکی گومان لێکراوی دوژمن بە گەل، پەیمانیان مۆرکردووە[٢٨٦]

بەو شێوەیە سەرکردایەتی پارتی رازی نەبوو بچێتە ناو ئەو بەرەیەو لە مانگی ئابی ۱۹۷۳ یش بەیاننامەیەکی بڵاوکردەوە کە وێڕای خـستنە ڕووی سـەرنجەکانی خـۆی دەربـارەی ئـەو بەرەیـە، تیایـدا ئەوەشـی راگەیانـد کـە ئـەوان تـا رۆژی

---

(٢٨٤) صلاح الخرسان، صفحات من تاريخ العراق السياسي الحديث، ص١٤٥.

(٢٨٥) هـ س، ل١٤٧.

(٢٨٦) "بیری نوێ"، ژ(۷۳)، ۱۹۷۳/۱۱/۱۸.

بڵاوكردنـەوەى ئاگـادارى شـێوازى رێككەوتنەكـەى بـەعس و (ح.ش.ع) نەبوونـەو مەبەستيـشيان لـەو رێككەوتنـە شـڵەژاندنى پـارتى ديمـوكراتى كوردسـتانە[٢٨٧] دوابەدواى ئەوەش حيزبى شيوعى لە ٢٨ى ئابدا هەندێ تێبينى سـەرەتايى لەمـەڕ بەياننامەكـەى مەكتـەبى سياسـيى پـارتى لەرێگـەى راگەيانـدنى خۆيـەوە بڵاوكردەوە[٢٨٨]، هەروەها وێڕاى رەتكردنـەوەى ئـەو بابەتانـەى لـە بەياننامەكـەى پارتى دا هاتبوو ، حيزبـى شـيوعى بـەوەش رازى نـەبوو كـە (پ.د.ك) بەنوێنـەرى نەتەوەى كورد لە عێراق لەقەڵەم بدات[٢٨٩]. گرژى پێوەنديى نێوان هەردوو حيـزب دواى رێككەوتنى دوو قۆڵى نێـوان بـەعس و حيزبـى شـيوعى زيـاتر تـەشـەنەيكردو سـەرەنجامەكەى بەهەڵگيرسـانى شـەڕو پـەلاماردانى خوێنـاوى گەيـشت لـە نێـوان هەردوولادا. ئەوەبوو هەر لەمانگى ئابدا (١٢) كاديرى شـيوعى(*) لەوانـەى كـە لـە دەرەوەى عێـراق دەيانخوێنـد لـە رێگـەى كوردسـتانەوە گەڕانـەوە(**)، بـەڵام لـە

---

(٢٨٧) بۆ زانياريى زياتر دەربارەى ئەو بەياننامەيە بڕوانە: "دەنگوباسى كوردستان" (دەزگاى پەخش و راگەياندن لە مەكتەبى سياسيى پـارتى ديمـوكراتى كوردسـتان)، ژ(١٧)، ئـابى ١٩٧٣.

(٢٨٨) بۆ زانياريى زياتر لەم بارەيەوە بڕوانە: من وثائق الحزب الشيوعي العراقي، موقفنـا مـن المسألة القومية الكردية (مجموعة وثائق برنامجية)، مط الشعب، بغداد، ١٩٧٣، ص١١٦-١٢٨.

(٢٨٩) بۆ زانياريى زياتر بڕوانە: "بيرى نوێ"، ژ(٦٩)، ١٧/١٠/١٩٧٣.

(*) دوازدە شيوعييەكە ئەمانەبوون: شێروان جەميل باڵتـە، عومـەر قـادر ئەحمـەد، ربيـع عبـد رلجى، فاضل الموسـوي، مزهـر كريـدي، محمـد عبـدالامير المطـيري، نجـم الـدين حـاجي عثمان، محمد ناصر الحداد، نورالـدين احمـد، هاشـم حمـود، عبـدالله مهـدى و كەسـێكى ديكە. بڕوانە: "بيرى نوێ" ژ(٨٢)، ٢/٢/١٩٧٤.

(**) ئەوانە هەروەك لە نامەيەكى عەزيز محەمەد دەردەكـەوێت كـە لـە ٢ى كـانوونى يەكـەمى ١٩٧٣ بۆ مستەفا بارزانى ناردووە، بەر لەوەى كوردستان جێبهێڵن و لە گەڕانەوەشياندا

ناوچەیەکی سنووریی کوردستاندا لەلایەن هەندێ لە لێپرسراوانی ( پ.د.ك)، بێ سەروشوێن کران[٢٩٠] دوای تێپەڕبوونی ماوەیەکیش بەسەر ئەو ڕووداوە، مەکتەبی سیاسیی (ح.ش.ع) یادداشتێکی پێشکەشی بارەگای مستەفا بارزانی و مەکتەبی سیاسیی پارتی کرد بۆ دیاری کردنی چارەنووسی ئەو (١٢)کەسە[٢٩١]، بەڵام مەکتەبی سیاسیی (پ د ك) بە ڕێککەوتن لەگەڵ بارەگای مستەفا بارزانی لە ڕوونکردنەوەیەکدا لە ڕۆژی ١٢ی کانونی یەکەمی ١٩٧٣دا بێئاگایی خۆیان لەو ڕووداوە ڕاگەیاندو ئامادەییشیان نیشاندا کە لەگەڵ (ح.ش.ع)و هەر لایەنێکی دیکە کە خۆیان پێی ڕازی دەبن لەمەسەلەکە بکۆڵنەوە[٢٩٢]

لێرەشدا ناکرێ ڕۆڵی گەورەی عەزیز شەریف فەرامۆش بکرێت کە بەپشتیوانی یەکێتی سۆڤیەت دەیگێڕا بۆ ئارام کردنەوەی دۆخەکە و کۆششی بۆ گێڕانەوەی پێوەندیی نێوان هەردوو حیزب بۆ دۆخی جارانی کە هاوکات لەگەڵ ئەمە، مستەفا بارزانی و عەزیز محەمەد نامەیان ئاڵوگۆڕ کرد[٢٩٣]

لە کۆتایی مانگی ئەیلولی ١٩٧٣یشدا پێکدادانی چەکداری لە نێوان هەردوو حیزب لە ناوچەی ئەلقوش هەڵگیرسا، کە (ح.ش.ع) ئەو ڕووداوەیان کردە بیانوویەك و هۆیەك بۆ ئەوەی ژمارەیەکی زۆری چەك و جبەخانە لە هەندێ لای تایبەتی ناو حوکمەتی عێراق وەربگرن و بەشێوەیەکی فراوان خۆیان پێ

---

ئاگاداری لێپرسراوانی پارتی دیموکراتی کوردستانیان کردووە، بڕوانە: مسعود البارزاني، البارزاني والحركة التحررية الكردية،ج٣، ص٥٩٧.

(٢٩٠) دیدار لەگەل حەبیب محەمەد کەریم، هاوینەهەواری شەقلاوە، ٢٠٠٤/٧/٢٧.

(٢٩١) بۆ زانیاریی زیاتر دەربارەی ئەو یاداشتە بڕوانە: "بیری نوێ"، ژ(٧٧)، ١٩٧٣/١٢/١٢

(٢٩٢) بڕوانە: ڕۆژنامەی "برایەتی"، ژ(٨١)، ١٩٧٣/١٢/٢١.

(٢٩٣) مسعود البارزاني، البارزاني والحركة التحررية الكردية،ج٣،ص٢٨٤.

چەکداریکەن[٢٩٤]، هەرچەندە حوکمەتیش لە هەلێك دەگەڕا بۆ زیاتر گرژکردنی پێوەندیی نێوان ئەو دوو حیزبە. هەروەها بەیاننامەیەکی لیژنەی ناوخۆی (ح.ش.ع) لە پارێزگای نەینەوا لە ٣ی تشرینی یەکەمی ١٩٧٣ ئاماژە بەو دەستدرێژییانە دەکات کە پارتی لە ناوچەکانی دهۆك و موسڵ دژی ئەندامان و دۆستانی حیزبی شیوعی ئەنجامی داون[٢٩٥] لەبەیانی ٧ی تشرینی دووەمیشدا چەکدارەکانی حیزبی شیوعی لە دەربەندیخان پەلاماری بارەگای پارتییاندا، دوو پێشمەرگەی ناو بارەگاکەیان بریندار کرد ، بەڵام لە ئێوارەی هەمان رۆژدا نوێنەری هەردوولا لەدەربەندیخان کۆبوونەوەو لەسەر چەند خالێك رێککەوتن ، کەچی هەر ئەو رۆژە شیوعییەکان پەیمانەکەیان شکاندو لەهەندێ ناوچەی دەربەندیخاندا تەقەیان لە پێشمەرگەکانی ( پ.د.ك) کرد و لە رۆژی ٨ی هەمان مانگیشدا هەر لەو ناوچەیە چوار پێشمەرگەی پارتییان کوشت و نۆزدەی دیکەشیان بریندار کرد[٢٩٦]

رۆژی ١٢ی تشرینی دووەمیش مستەفا بارزانی لەتەلەگرافێکدا کە بۆ (محەمەد مەحمود عەبدولرەحمان/سامی)ی سەرۆکی لیژنەی ئاشتی مەکتەبی سیاسیی پارتی نارد بوو لە پێناو روونکردنەوەی بارودۆخەکە ، تیایدا باس لە چەکدار کردنی ئەندامانی ( ح.ش.ع) دەکات لەلایەن حیزبی بەعسەوە لە زۆر ناوچەی کوردستانداو لەهەمان کاتیشدا داوای لە بەعس کرد واز لەو ئاژاوەنانەوەیە

---

(٢٩٤) "کادر" (گۆڤاری تیۆری پارتی دیموکراتی کوردستان)، ژ(٢١) ساڵی شەشەم، شوباتی ١٩٧٤، ل٦٠.

(٢٩٥) بڕوانە: "بیری نوێ"، ژ(٦٨)، ٩٠-/١٠/١٩٧٣.

(٢٩٦) بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: رۆژنامەی "برایەتی"، ژ(٧٦)، ١٩٧٣/١١/١٦: ژێرارد چالیاند، س پ، ل٢٩٤–٢٩٥.

بهێنێت، سەرەڕای ئەوەش خواستی خۆیانی بۆ پاراستنی ئاسایش و کارکردن لەو پێناوەدا نیشاندا[٢٩٧].

هەر لەوەڵامی ئەو نامەیەی کە مەکتەبی سیاسیی (پ.د.ك) لە ١١ی تشرینی دووەمدا بۆ (ح.ش.ع)ی ناردبوو، حیزبی شیوعی لە ١٥ی هەمان مانگدا نامەیەکی ئاراستەی کۆمیتەی ناوەندیی پارتی دیموکراتی کوردستان کرد، کە تیایدا چەند داخوازییەکی تێدابوو سەبارەت بەولزهێنانی پارتی لە رلونانی شیوعییەکان لە کوردستان و ئازادکردنی گیراوەکانیان، لە کۆتایی نامەکەشدا ئامادەیی خۆیان بۆ چاوپێکەوتن و گفتوگۆ نیشاندابوو لەپێناو چارەسەر کردنی ناکۆکییەکان[٢٩٨].

لەسەر ئارەزووی هەردوولا، نوێنەرانی سەرکردایەتی هەردوو حیزب بە ئامادەبوونی عەزیز شەریف لە رۆژانی ١٩ و ٢٠ی تشرینی دووەمی ١٩٧٣ کۆبوونەوەو رۆژی دووەمی کۆبوونەوەکە بەیاننامەیەکی هاوبەشیان بڵاوکردەوە کە تیایدا جەخت کرابووە سەر نەهێشتنی شوێنەواری رووداوە ناخۆشەکانی نێوانیان و بەردەوامبوون لە چاوپێکەوتنی ناویەناو و پتەوکردنی پێوەندیی نێوانیان و هێزە سیاسییەکانی دیکەی وەك حیزبی بەعس[٢٩٩].

ئەو رێککەوتنەش هەروەك لەو یادداشتەدا دەردەکەوێت کە کۆتایی تشرینی دووەم (ح.ش.ع) بۆ (پ.د.ك)ی ناردووە، جێبەجێ نەکرا[٣٠٠]. هەروەها حیزبی شیوعی لە راگەیاندنەکانی خۆیدا ئەوەی دەخستە روو کە بەربەرەکانیکردنی

---

(٢٩٧) بڕوانە: رۆژنامەی "برایەتی"، ژ(٧٦)١٦/١١/١٩٧٣.

(٢٩٨) بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: "بیری نوێ"، ژ(٧٣)، ٢٨/١١/١٩٧٣.

(٢٩٩) بۆ زانیاریی زیاتر دەربارەی بەیاننامەکە بڕوانە: رۆژنامەی "برایەتی"، ژ(٧٧)، ٢٣/١١/١٩٧٣.

(٣٠٠) بۆ زانیاریی زیاتر دەربارەی ئەو یادداشتە بڕوانە: "بیری نوێ"، ژ(٧٨) ١٩/١٢/١٩٧٣.

شیوعییەکان لەلایەن پارتییەوە، بەربەرەکانیکردنی بیروباوەڕی شیوعێتییە[٣٠١].
بەوەش دەیویست لەلایەکەوە لەناوخۆی کوردستاندا تەواوی چەپڕەوان و هەڵگرانی ئەو بیروباوەڕە لە دەرەوەی حیزبەکەشیان، لە سەنگەری خۆیاندا کۆبکاتەوە بۆ دژایەتیکردنی (پ.د.ك). لەلایەکی دیکەشەوە لەو قسانەیان مەبەستیان بوو سەرنجی هاوبیرانیان لە دەرەوەی عێراق بۆ خۆیان رابکێشێن تاکو ئەوانیش دۆستایەتیان لەگەڵ پارتی تێك بدەن و لەبەرانبەریدا هەڵوێست وەربگرن، دیارە ئەو ئامانجەشیان تاڕادەیەك بۆ پێکهات و ژمارەیەك لە حیزبە شیوعییەکان لە وڵاتە جیاجیاکانەوە یاداشتی ناڕەزاییان بۆ پارتی نارد[٣٠٢] هەروەها لە نێوان تشرینی دووەمی ١٩٧٣ تا شوباتی ١٩٧٤ ژمارەیەك لە حیزبە شیوعییەکانی جیهان، (پ.د.ك)یان دایە بەر هێرشی رەخنەو تاوانباریان کرد بەوەی لە کوردستاندا شیوعییەکان قەڵاچۆ دەکەن[٣٠٣]. هەروەها ئامانجێکی دیکەی (ح.ش.ع) لە بڵاوکردنەوەی ئەو جۆرە وتارانە، زیاتر سەرنج راکێشانی یەکێتی سۆڤیەت بوو بۆ خۆیان، تاکو پێوەندیی نێوان ئەوانیش و بزووتنەوەی رزگاریخوازی کوردستان تێك بدەن.

لەبەرانبەر راگەیاندنی (ح.ش.ع) یشدا، (پ. د. ك) هەڵوێستی وەرگرت، چونکە بڕوایان وابوو بۆ سەرلێشێواندنی رای گشتی دەنگ و باس و رووداوی دوور لە راستی سەبارەت بەباری ژیانی شیوعییەکانی کوردستانی عێراق دەخەنە روو، لەبەرئەوە ١٠ی کانونی دووەمی ١٩٧٤ دەربارەی ئەو بابەتە لە یاداشتێکدا بۆ

(٣٠١) بڕوانە: "بیری نوێ"، ژ(٧٢)، ١٤/١١/١٩٧٣.

(٣٠٢) بۆ زانیاریی زیاتر سەبارەت بە هەندێ لەم یاداشتانە بڕوانە: "بیری نوێ"، ژ(٨١)، ٢٦/١/١٩٧٤ و ژ(٨٢)، ٢/٢/١٩٧٤.

(٣٠٣) ژیرارد چالیاند، س پ، ل٢٩٥.

حیزبەکان و نوێنەرانی رای گشتی لە ناوخۆ و دەرەوەی عێراق، روونکردنەوەیەکی بڵاوکردەوە[٣٠٤].

لەناو توێژە جیاوازەکانی کۆمەڵگای کوردستانیشدا، دەنگی نارەزایی دژی حیزبی شیوعی و ئەو رۆڵەی لە راگەیاندنەکانیاندا دەیانگێرا دژی پارتی دیموکراتی کوردستان، بەرزبۆوە، وەك نووسەران و رۆشنبیران[٣٠٥] و مامۆستایان و قوتابیانی زانکۆی سلێمانی[٣٠٦] و نەقابەی مامۆستایانی کوردستان[٣٠٧] و هیدیکەش. هەروەها لە دەرەوەی وڵاتیشدا کۆمەڵەی خوێندکارانی کورد لە ئەورووپا – لقی بەریتانیا و سکرتێری کۆمەڵەی خوێندکارانی کورد لقی سوید هەریەکەیان بەجیا نارەزاییان دەبڕی[٣٠٨].

سەبارەت بە پرۆژەی یاسای ئۆتۆنۆمییش[*]، ئەوا (ح.ش.ع) هاوڕاو پشتگیری بەعس بوو لەو پرۆژانەی کە هەر لەسەرەتاوە پێشکەشی سەرکردایەتی

---

(٣٠٤) بۆ زانیاریی زیاتر دەربارەی ئەو یاداشتە بڕوانە: رۆژنامەی "برایەتی"، ژ(٦)، ١٩٧٤/١/١٤.

(٣٠٥) بۆ نموونە بڕوانە: رۆژنامەی "برایەتی" ژ(٥)، ١٩٧٤/١/١٣ کە بروسکەی نووسەرانی هەولێری تێدایە؛ ژ(٧)، ١٩٧٤/١/١٥ کە بروسکەی نووسەران و رۆشنبیرانی شارۆچکەی کفری تێدایە؛ ژ(١٧)، ١٩٧٤/١/٢٧ کە یاداشتی نارەزایی رۆشنبیرانی قەڵادزێی تێدایە.

(٣٠٦) بڕوانە: رۆژنامەی "برایەتی"، ژ(١٩)، ١٩٧٤/١/٢٩ کە بروسکەی زانکۆی سلێمانی تێدایە کە ئەوکات تاکە زانکۆی کوردستان بوو.

(٣٠٧) بڕوانە: رۆژنامەی "برایەتی"، ژ(٢٤)، ١٩٧٤/٢/٥.

(٣٠٨) بڕوانە: رۆژنامەی "برایەتی"، ژ(١٨)، ١٩٧٤/١/٢٨.

(*) لە تەوەری سێیەمی بەشی سێیەمی باسەکەمان زیاتر لە پرۆژەکانی یاسای ئۆتۆنۆمی دواوین.

بزووتنەوەی رزگاریخوازی کوردستان دەکران بۆ رێککەوتن لەسەری ، کە پرۆژەکە شێوەیەك بوو لە شێوەکانی ناسەنتەری کارگێری و زۆر لە ئۆتۆنۆمی کەمتر بوو و بەهیچ شێوەیەك مافە نەتەولیەتییەکانی گەلی کوردی نەدەهێنایەدی[٣٠٩].

بەو شێوەیە دەبینین (ح.ش.ع) لەدوای رێککەوتنیان لەگەڵ حوکمەتی عێراق بوونە بەشێك لەوان دژی (پ.د.ك)، هەروەها بەعسییەکان رۆلێکی زۆریان گێرا لە قووڵترکردنەی ناکۆکییەکانی نێوان ئەو دوو حیزبە، تەنانەت لەسەر یەکێتی سۆڤیەتیشیان سەپاند کە پاڵەپەستۆ بخاتە سەر حیزبی شیوعی عێراق تاکو بکەونە سەنگەری دژایەتی کردنی پارتی دیموکراتی کوردستانەوە[٣١٠]. هەر لەوکاتەش بوو رژێمی عێراق هێرش و دەستدرێژی دەکردە سەر ناوچەکانی کوردستان[*]

ئەوەی ماوەتەوە بیڵێین سەبارەت بە پێوەندیی نێوان ئەو دوو حیزبە، بەرپرسیارێتی تێکچوونی پێوەندیی نێوانیانە، لەوەشدا مەسعود بارزانی بڕوای وایە کە ناکرێ هەموو بەرپرسیارێتییەکە بخرێتە ئەستۆی حیزبی شیوعی، بەڵکو هەندێکی لە ئەستۆی پارتیشدایە[٣١١] هەرچی عەزیز محەمەدیشە دەڵێت: لەو شەڕو ململانێیە هەردوو لامان زیانمان پێگەیشت و کەموکورتییەکەش بۆ هەردوولا دەگەڕێتەوە، بەڵام بەرپرسیارێتییەکە ئەگەر بۆ هەردوولاش بێت، دابەش ناکەم کە کام لایەن زیاتر بەرپرسیارێتییەکەی لەئەستۆدایە، بەڵکو هەردوولامان

(٣٠٩) بڕوانە: "کادر"، ژ(٢١)، ساڵی شەشەم، شوباتی ١٩٧٤، ل٧٤–٧٥.

(٣١٠) دیدار لەگەڵ مەسعود بارزانی، هاوینەهەواری سەری رەش، ٢٠٠٣/٦/٢٢.

(*) لە تەوەری یەکەم و دووەمی بەشی سێیەمی باسەکەمان زیاتر لەو بابەتە دواوین.

(٣١١) دیدار لەگەڵ مەسعود بارزانی، هاوینەهەواری سەری رەش،٢٠٠٣/٦/٢٢.

بەرپرسـین[٣١٢] . کـەریم ئەحمـەدیش پێیوایـە هەڵەکـە لەلایـەن هـەردوو حیزبـەوە بووە[٣١٣]

ئەو لێکترازانەش بووە هـۆی شکست بـۆ هـەردوولا، هـەروەك چـۆن مەسـعود بارزانی جەختی لەسەر دەکاتەوە بەوەی کاتێك بۆ رابردوو دەگەرێتەوە هەستدەکا لـەماوەی شۆرشـی ئەیلولـدا کـە هەرچـەندە لـەرووی دارایـی و تەقەمەنییـەوە هـەژاربوون ، بـەڵام هاوپـەیمانێتیو هاوشـانی هـەردوو حیـزب بـووە فاکتـەری سەرکەوتن ، کەچی دوای لەیەکدابرانیان هەرچەندە خاوەن پارە و چەکیش بـوون کەچـی دووچـاری تێکـشکان هـاتن[٣١٤] شـایانی باسیـشە، هـەردوو لایـەن لـە کۆنگرەکانی دواتری حیزبەکەیاندا ئەو رەوشەیان دروست هەڵسەنگاندو بەخۆیانـدا چوونەوە[٣١٥] .

(٣١٢) دیدار لەگەڵ عەزیز محەمەد، هەولێر، ٢٠٠٤/٣/١٥.

(٣١٣) دیدار لەگەڵ کەریم ئەحمەد، هەولێر، ٢٠٠٣/٧/٢٢؛ مسعود البارزاني، البـارزاني والحركـة التحررية الكردية، ج٣، ص٢٨٤.

(٣١٤) مسعود البارزاني، البارزاني والحركة التحررية الكردية، ج٣، ص٢٨٤.

(٣١٥) سـەبـارەت بـە هەڵـسەنگاندنی پـارتی بڕوانـە: پـارتی دیمـوکراتی کوردسـتان (سـەرکردایەتی کـاتی)،س پ، ل٣٤-٣٧؛ سـەبارەت هەڵسەنگاندنی حیزبـی شـیوعیش بڕوانە: وثـائق المـؤتمر الـوطني الرابـع للحـزب الـشيوعي العراقـي، ١٠-١٥تـشرين الثـاني ١٩٨٥، ص١٨٥-٢٢٥.

## تەوەری چوارەم:

# پێوەندییە دەرەکییەکانی بزووتنەوەی رزگاریخوازی کوردستان لەگەڵ:

### ١- ئێران

جووڵانەوەی رزگاریخوازی کورد لە کوردستانی ژێر دەسەڵاتی عێراقدا لەگەڵ هەڵگیرسانی شۆڕشی ئەیلول، پێی نایە قۆناغێکی نوێ. بەهۆی بەرفراوانبوونی کارو چالاکییەکانی جوڵانەوەکەو فراوانبوونی شەڕی بەرگری و رزگاری لەلایەکو، نابەرابەری نێوان هێزی شۆڕشی کوردستان و رژێمی عێراق لەلایەکی دیکەوە، سەرکردایەتی سیاسیی کورد لەپێناو هاوسەنگ کردنی تەرازووی هێزەکانیان لە بەرانبەر هێزی سەربازی عێراق، ناچاربوو رووبکاتە دەرەوەو پێوەندیی دەرەکی ببەستێت. لەو چوارچێوەیەشدا هاوسنووری ئێران لەگەڵ کوردستان فاکتەرێکی کاریگەر بوو بۆ بەستنی پێوەندیی لەگەڵ رژێمی شا.

ئەو پێوەندییەش لە کۆتاییەکانی ساڵی (١٩٦٢)ەوە دەستیپێکردو هەردوولا نوێنەریان بۆ لای یەکتر نارد. سەرەتاش پێوەندییەکە تەنها بریتی بوو لە گرنگیدان بەکاروباری مرۆیی و پێشکەشکردنی داوو دەرمان پاشان پەرەیسەند بۆ پێشکەشکردنی یارمەتی دیکەی دیاریکراو بۆ لەشکری کوردستان لەلایەن ئێرانەوە، بەڵام لەهەمان کاتیشدا لەساڵی ١٩٦٢ رژێمی شا یارمەتی حوکمەتی بەعسی دەدا دژی شۆڕشی کوردستان[٣١٦] ئەوەش لەوەوە سەرچاوەی گرتبوو کە

(٣١٦) بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: مسعود البارزاني، البارزاني والحركة التحررية الكردية،ج٣، ص٢٧٠-٢٧١.

حەزیان لە سەرکەوتنی هیچ لایەکیان نەدەکردو لەپێناو زیان پێگەیاندن و ماندوکردنیشیان لەیەك کاتدا یارمەتی هەردوولایان دەدا، بۆ ئەوەی بەشەڕی نێوانیان خەریکیان بکەن.

هەروەها یارمەتییەکانی دەسەڵاتدارانی ئێران بۆ شۆڕشی کورد بەپێی هەڵوێستی شا بەرانبەر حوکمەتی عێراق، لە هەڵچوون و داچووندا بوو. بۆ نموونە ئەو یارمەتییانە لەدوای هاتنی عەبدولسەلام عارفی سەرۆك کۆمار بۆ دەسەڵات، کە لایەنگیری سیاسەتی جەمال عەبدولناسری سەرۆك کۆماری میسر بوو، زۆر زیادی کرد[٣١٧]، چونکە لەو سەردەمەدا ئێران ململانێی لەگەڵ میسریش هەبوو[٣١٨].

بەو شێوەیە پێوەندییەکانی بزووتنەوەی رزگاریخوازی کوردستان لەگەڵ ئێران ساڵ لەدوای ساڵ باشترو یارمەتییەکانیش زۆرتر بوون، تاوای لێهات ئێران بۆ لاوازکردنی عێراق لەسەر ناکۆکییە سنوورییەکانیان، کێشەی کورد بکاتە مەرام و ساڵی ١٩٦٩پەیماننامەی ساڵی ١٩٣٧ی نێوان هەردوو وڵاتی رەتکردەوەو داوای نیوەی شەتولعەرەبی کردو هاوبەشیی کۆنترۆڵکردنی بە مافی خۆی زانی[٣١٩].

دوای ئەوە حوکمەتی شا هەوڵیدا لەرێگەی چەند ئەفسەرێکی عێراقی وەك (عبدالغني الراوي)و (عبدالرزاق النایف)ی سەرۆك وەزیرانی لەکار لادراو،

---

(٣١٧) جوناثان راندل، أمة في شقاق (دروب كردستان كما سلكتها)، ط١، دار النهار للنشر، بيروت، ١٩٩٧ ، ص٢٤٨.

(٣١٨) بڕوانە: روح الله رمضاني، سياسة ايران الخارجية ١٩٤١-١٩٧٣ دراسة في السياسة الخارجية للدول السائرة صوب التحديث، ت: علي حسين فياض و عبدالمجيد حميد جودي، منشورات مركز دراسات الخليج العربي بجامعة البصرة شعبة الدراسات الفارسية (للتداول المحدود)، ١٩٨٤، ص٤٢٤.

(٣١٩) أ. كاوه، قضية كردستان الجنوبية وآفاق المستقبلية، ط٢، منشورات مط(گەل) ١٩٩١، ص٧١-٧٢.

کودەتایەکی سەربازی دژی رژێمی بەعس لە عێراقدا رێکبخات، هەردوو ناوبراویش لەسەر داواکاری شا لە مانگی تەموزو تشرینی یەکەمی ١٩٦٩ سەردانی کوردستانیان کردو داوایان لە سەرکردایەتی شۆڕشی کورد کرد لە جێبەجێکردنی کودەتاکەیان هاوکاریان بکات، بەڵام داواکەیان رەتکرایەوە لەبەرئەوەی هیچ چارەیەکی گونجاویان بۆ کێشەی کورد پێنەبوو و سەرکردایەتی کوردیش داوای ئۆتۆنۆمی لێکردبوون[٣٢٠] تەنانەت (عبدالغني الراوي) لە وەڵامدا بڕوانەبوونی خۆی بەداواکارییەکە نیشاندابوو و پێی وابوو کە ئەوە تۆوی لێکهەڵوەشاندنەوەی عێراق دەچێنێ، هەروەها بڕواشی وابوو کە مێژووی کورد لە عێراق مێژووی عەرەبە[٣٢١]

دوای سەرنەگرتنی کودەتاکەش، ئێران زیاتر بایەخی بە شۆڕشی کوردستانداو پێوەندیی نێوانیان پەرەیسەندو هەرچی یارمەتییەکیش کە جووڵانەوەیکورد پێشتر داوای کردبوو و رژێمی شا رازی نەبوو بیدات، لەو ماوەیەدا رازی بوو لەسەری و شۆڕشی کوردستان یارمەتییەکانی وەرگرت[٣٢٢]

لە ١٥ی کانوونی دووەمی ١٩٧٠شدا، لەکاتێکدا کە دانوستان و گفتوگۆ لەنێوان سەرکردایەتی شۆڕشی ئەیلول و حوکمەتی عێراق لە ئارادا بوو، لەسەر داخوازی شا، مستەفا بارزانی چووە تاران. رۆژی دواتر شای ئێران پێشوازییەکی گەرمی لێکردو بەڵێنی ئەوەشی پێدا کە ئەگەر لە رێککەوتن لەگەڵ رژێمی بەعس پاشگەز بێتەوە ئەوا ئێران و وڵاتە یەکگرتووەکان هەموو پێداویستیەکانی شۆڕشی

(٣٢٠) بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: مسعود البارزاني، البارزاني والحركة التحررية الكردية، ج٣، ص٢٢٢–٢٢٣.

(٣٢١) بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: "مذكرات عبدالغني الراوي" (بخط يده وغير منشورة)، ٢كانون الثاني١٩٨٠، ص١٧.

(٣٢٢) پارتی دیموکراتی کوردستان (سەرکردایەتی کاتی)، س پ، ل٥٣.

کورد دابین دەکەن، بەڵام مستەفا بارزانی داواکەی شای رەت کردەوە. دوای گەڕانەوەشی بۆ کوردستان چەندین نامەی لە شای ئێرانەوە پێگەیشت کە دووپاتکردنەوەی هەمان داوای تێدابوو، تەنانەت دوانامەشی هەندێ هەڕەشەی لەخۆگرتبوو[٣٢٣].

دەتوانین بڵێین ئەو هەڵوێستەی ئێران لەوەوە سەرچاوەی گرتبوو کە دەیانویست لەڕێگەی یارمەتییەکانیانەوە بۆ شۆڕشی کوردستان رژێمی عێراق بێتواناو دەسەڵات بکەن، تاکو لە بەرانبەر رژێمی شادا تەنازول لە کێشە سنوورییەکانیان بکات هەروەك لە ساڵی ١٩٧٥ لە رێککەوتننامەی جەزائیر کردی. ئەمە لەلایەك، لەلایەکی دیکەشەوە دەسەڵاتدارانی ئێران ترسی ئەوەشیان هەبوو کە ئەگەر شۆڕشی کورد لە کوردستانی ژێر دەسەڵاتی عێراقدا لە ئەنجامی گفتوگۆ لەگەڵ رژێمی بەعس بە ئامانجەکانی خۆی بگات، ئەوا ئەو هەلومەرجە کاردەکاتە سەر جووڵانەوەی کورد لە کوردستانی ژێر دەسەڵاتی ئێرانیش و هانیان دەدات کە تێکۆشانیان پتەوتر بکەن لەو پێناوەدا.

دوای بە ئاکام گەیشتنی گفتوگۆی نێوان سەرکردایەتی شۆڕشی کوردستان و حوکمەتی عێراق و راگەیاندنی بەیاننامەی ١١ی مارت، پێوەندیی نێوان جووڵانەوەی رزگاریخوازی کوردو رژێمی ئێران رووی لە گرژی کرد(*)، بەڵام مستەفا بارزانی بەهۆی دووربینییەکەی لەلایەك و بێبڕوایی‌شی بەرانبەر بەعسییەکان لەلایەکی دیکەوە، نەیهێشت پێوەندیی سیاسیی لەگەڵ ئێران بپچڕێت. ئەوەبوو دوای بەستنی کۆنگرەی هەشتەمی پارتی دیموکراتی کوردستان

(٣٢٣) بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: مسعود البارزاني، البارزاني والحركة التحررية الكردية، ج٣، ص٢٣٦–٢٣٧.

(*) سەبارەت بە کاردانەوەی ئێران بەرامبەر راگەیاندنی بەیاننامەی ١١ی مارت بگەڕێوە بۆ تەوەری سێیەمی بەشی یەکەمی باسەکەمان.

لە تەموزی ١٩٧٠، کامەران بەدرخان بە ئاگاداری مستەفا بارزانی بۆ داوای یارمەتیدانی کورد سەردانی شای کردو پێیڕاگەیاند کە: "بارزانی دەڵێ لە ڕێککەوتنندا لەگەڵ بەعسییەکان چارم نەبوو و ڕێیەکی دی نەمابۆوە بۆم" شای ئێرانیش بەوە وەڵامی دایەوە کە: "ئێمە یارمەتی هەموو دۆستێ دەدەین بەڵام هەموو یارمەتییەکیش لە ئەنجامی متمانەکردن بەو کەسەوە دەبێ کە یارمەتی دەدرێ" [٣٢٤] وەڵامی شا ئەوەی دەگەیاند کە پێویستە بزووتنەوی ڕزگاریخوازی کوردستان کارێك بکات کە ببێتە مایەی متمانەی ڕژێمی ئێران.

دوای کشانەوەی هێزەکانی بەریتانیا لە ٢٩ی تشرینی دووەمی ١٩٧١ لە دوورگەکانی ئەبو موساو تونبی گەورەو تونبی بچووك، سوپای ئێران هەر سێ دوورگەکەی داگیرکردو ڕژێمی عێراقیش ڕاستەوخۆ دوای ئەوە پێوەندییە دیبلۆماسییەکانی خۆی لەگەڵ ئێران پچڕاند، بەوەش شەڕی ساردی نێوانیان دەستپێکرد. هەر بەوەشەوە نەوەستان ١٠ی نیسانی ١٩٧٢ دوای مۆرکردنی پەیماننامەی دۆستایەتی و هاوکاری نێوان عێراق و یەکێتی سۆڤیەت، پێکهەڵپڕژانی سنووری لەنێوان هێزەکانی ئێران و عێراق دەستپێکرد[٣٢٥] دەکرێ ئەو کێشانە بە فاکتەرێکی گرنگو کاریگەر لەقەڵەم بدەین بۆ پتەوتربوونی پێوەندیی و زیاتر نزیك بوونەوەی ئێران لە بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی کوردستان، بۆ ئەوەی لەو ڕێگەیەوە فشار بخاتە سەر حوکمەتی عێراق.

لەگەڵ هەموو ئەوانەشدا هەتا دوای ئەنجامدانی پیلانەکەی دەسەڵاتدارانی بەعس بۆ لەناوبردنی مستەفا بارزانی لە ئەیلولی ١٩٧١، پێوەندییەکی بایەخدار لەنێوان جووڵانەوەی کوردو کاربەدەستانی ئێران نەبوو، بەڵام کاتێك گومان نەما

---

(٣٢٤) بڕوانە: جەمال نەبەز، ڕۆژانی ئاوارەییم لە سوێسرە، چاپخانەی داناز، سلێمانی، ١٩٩٩، ل٧٤-٧٧.

(٣٢٥) بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: روح الله رمضاني، س پ، ل٤٥٣-٤٥٧.

لەنیازی بەعسییەکان بۆ جێبەجێ نەکردنی بەیاننامەی ١١ی مارتو لەناوبردنی جووڵانەوەی کورد، ئەوسا پێوەندییەکە دەستیپێکردەوە، بەڵام هەردوولا لە یەکتر بەگومان بوون. ئێران هەمیشە سەرکردایەتی کوردی هان دەدا شەڕ دەسپێبکاتەوەو بەڵێنی هەموو جۆرە یارمەتییەکیشی ئەدا بەبڕێکی زۆر زیاتر لە جاران، بەڵام سەرکردایەتی کورد باوەڕی پێنەدەکردن و رازی نەبوو بۆ جێبەجێکردنی داواکەیان[٣٢٦]

شایانی باسە مستەفا بارزانی هیچ کاتێك باوەڕی بەرژێمی ئێران نەبوو تا ساڵی ١٩٧٢و ١٩٧٣ کەوڵاتە یەکگرتووەکان دوای پەیماننامەی دۆستایەتی و هاوکاری نێوان مۆسکۆو بەغدا، هاتەناو هاوکێشەکە، لەو کاتەشدا سەرکردایەتی بزووتنەوەی کوردو خودی مستەفا بارزانییش باوەڕیان وابوو بە هاتنە ناوەوەی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا بۆ ناو هاوکێشەی پێوەندییەکان ئیدی ئێران ناتوانێ (ناپاکیی!) لە کورد بکات، بۆیە پێوەندیی لەگەڵ رژێمی شا بەرەو پێشچوو[٣٢٧]

وەك دەرەنجامێکیش بۆ بەرەو پێشچوونی ئەو پێوەندییە، حوکمەتی بەعس لە تشرینی یەکەمی ١٩٧٢ تۆمەتی ئەوەی خستە پاڵ پارتی دیموکراتی کوردستان کە لە رێگەی ئێرانەوە پێشمەرگەکانی خۆی پڕ چەك دەکات و لەنێو خاکی عێراقیشدا هاوکاریی دەزگا هەواڵگرییەکانی ئێران دەکات[٣٢٨]، بەڵام لەم بارەیەوە تۆمەتەکانی بەعس ئەگەر راستیش بووبێت، ئەوا پێوەندیی پارتی دیموکراتی کوردستان لەگەڵ ئێران لە ئەنجامی خۆدزینەوەی دەسەڵاتدارانی عێراق بوو لە جێبەجێکردنی بەیاننامەی ١١ی مارت، سەرەڕای سیاسەتە پیلانگێرییەکەیان و

---

(٣٢٦) پارتی دیموکراتی کوردستان (سەرکردایەتی کاتی)، س پ، ل٥٤.

(٣٢٧) دیدار لەگەڵ مەسعود بارزانی، هاوینەهەواری سەری رەش، ٢٠٠٣/٦/٢٢.

(٣٢٨) صلاح الخرسان، التيارات السياسية في كردستان العراق، ص٢٠١.

خۆئامادەکردنیان بۆ سەپاندنی دەسەڵاتی تاکرەوی خۆیان بەسەر کوردستان و نسکۆ پێهێنانی جووڵانەوەی کورد. هەروەك مەسعود بارزانییش دەڵێت: "دوای پەیماننامەی دۆستایەتی و هاوکاری نێوان عێراق و یەکێتی سۆڤیەت، ئێمەو بەعسییەکان لە یەکتر ئاشکرا بووین و ئەوان بڕیاری خۆیانداو ئێمەش بڕیاری خۆمانداو رازی نەبووین سیاسەتی ئەوان قبوڵ بکەین و ببینە پاشکۆی ئەوان کە ئەوەش پێویستی بە بەرگری هەبوو و بەردەوامبوونی بەرگریش پێویستی بە پاڵپشتی لایەنێك هەبوو"[٣٢٩]

حوکمەتی ئێران لە بەرانبەر کوردو جووڵانەوەکەی لەو ماوەیەدا سیاسەتێکی دووفاقی بەرێوە دەبرد، هەرچەندە پێوەندیی لەگەڵ بزووتنەوەی سیاسیی کورد هەبوو و هانی دەدان بۆ دەسپێکردنەوەی شەڕ لەگەڵ رژێمی بەعس، بەڵام لە هەمان کاتدا خۆیشیان گفتوگۆی نهێنیان لەگەڵ بەعس هەبوو. لەو چوارچێوەیەشدا لە تشرینی یەکەمی ١٩٧٢ بۆ چەسپاندنی ئاشتی نێوانیان، رژێمی شا مەرجی خۆی لەسەر حوکمەتی بەغدا دانا کە دەبێت لە پەیماننامەی ساڵی ١٩٣٧ پەشیمان بێتەوەو دان بەداگیرکردنی ئێراندا بنێت بەسەر نیوەی شەتولعەرەب، دەسەڵاتدارانی عێراقیش لەو داواکارییە وردبوونەوەو[٣٣٠] لە تشرینی یەکەمی ١٩٧٣یشدا بەیاننامەیەکیان دەرکردو ئامادەیی خۆیان نیشاندا بۆ گەڕاندنەوەی پێوەندییە دیبلۆماسییەکانیان لە گەڵ ئێران[٣٣١]

---

(٣٢٩) دیدار لەگەڵ مەسعود بارزانی، هاوینەهەواری سەری رەش، ٢٠٠٣/٦/٢٢.

(٣٣٠) پارتی دیموکراتی کوردستان (سەرکردایەتی کاتی)، س پ، ل٦٣

(٣٣١) سەبارەت بە دەقی بەیاننامەکە بڕوانە: المرکز العربي للدراسات الاستراتیجیة، دور الجیش العراقي في حرب تشرین ١٩٧٣، المؤسسة العربیة للدراسات والنشر، بیروت- لبنان، ١٩٧٥، ص٢٣٧-٢٣٨.

لێرەدا بەدەردەکەوێ ڕژێمی تاران حەزی بەسەرکەوتنی کورد نەکردووە، بەڵکو هیوایان ئەوەبوو جوولانەوەی کورد لەو ئاستەدا بمێنێ کە بتوانێت تواناکانی عێراق دابچۆڕێنێ. لە گفتوگۆیەکیشدا لەگەڵ ڕۆژنامەی لۆمۆندی فەرەنسی لە حوزەیرانی ١٩٧٥، شا دانی بەوە دانا کە کورد بۆ ئەو تەنیا کارتێك بووەو تا ئەمڕۆش بەدەستیەوە گرتووە[٢٣٢]

سەرکردایەتی بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی کوردستانیش لە زووەوە ئەو ڕاستییەیان دەزانی، بۆیە باوەڕییان بە ڕژێمی شا نەدەکردو دەیانزانی هەر کاتێك هەلی بۆ بڕەخسێ و بگاتە مەرام و ئامانجەکانی خۆی، بە سازشکردن لەسەر کێشەی ڕەوای کورد پشتی تێدەکات، ڕاستی ئەو پێشبینیەش ساڵی ١٩٧٥ لە ڕێککەوتننامەی جەزائیردا، دەرکەوت.

---

(٢٣٢) د.حامد محمود عیسی، المشکلة الکردیة في الشرق الاوسط، مکتبة مدبولي، ١٩٩٢، ص٢٢٥.

## ٢- تورکیا

داگیرکەرانی کوردستان بەدرێژایی مێژوو لەهەر پارچەیەکی خاکی کوردستاندا هەر شۆڕش و راپەڕینێك بەرپابووبێت، تەواوی وزەو توانای خۆیان خستۆتەگەڕو هاوکاری یەکترییان کردووە بۆ سەرکوتکردنی یان دەستەمۆکردن و بەکارهێنانی لەپێناو بەرژەوەندییە تایبەتییەکانی خۆیان.

سەبارەت بە تورکیا، هەرچەندە لە هەندێ سەرچاوە باسی ئەوەکراوە کە لەگەڵ سەرکردایەتی شۆڕشی ئەیلول پێوەندیی نەبووە، بەڵکو لەمیانی شێوە پێوەندییەکی سەرزارەکیشدا لێکتێگەیشتن و بێدەنگی هەبووەو نێردراویشیان چاوی بە مستەفا بارزانی کەوتبوو، ئەویش دڵنیای کردبوون کە هیچ پێوەندییەکی بە بزووتنەوەی کورد لە تورکیادا نیە[٣٣٣] سەرکردایەتی کورد لەوە تەواو بەهەڵەدا چوو بوو، "بێ دەنگی تورکیای بەوە دەکرێ کە داوای یارمەتی لە کوردەکانی تورکیا نەکات، بەڵام تورکیا بێ دەنگ نەبوو،بەڵکو هەر لە یەکەم رۆژی شۆڕشەوە هەتا دوا کاتی شۆڕش دژی وەستا"[٣٣٤]

بۆ نموونە، ساڵی ١٩٦٢ تورکیا پەناگەی ئەو جاشانە بووە کە بەرەنگاری شۆڕشگێڕانی کورد دەبوونەوەو لەکاتی تێکشکانیاندا پەنایان بۆ نێو خاکی تورکیا دەبردو لەلایەن رژێمی تورکەوە پشگیری دەکران[٣٣٥]. لەساڵی ١٩٦٣یشدا دەسەڵاتدارانی تورك دژی شۆڕشی کوردستان هاوکاری ئاسمانیی حوکمەتی عێراقیان کرد[٣٣٦]، هەروەها لە تەمموزی ١٩٦٣ لەپێناو سەرکوتکردنی شۆڕشی

(٣٣٣) حوسێن محەمەد عەزیز، س پ، ل١٠٦.

(٣٣٤) پارتی دیموکراتی کوردستان (سەرکردایەتی کاتی)، س پ، ل٢٠.

(٣٣٥) مسعود البارزاني، البارزاني والحركة التحررية الكردية، ج٣، ص٦٧.

(٣٣٦)هـ س، ل٣٧٢.

کـورد لـه ئۆپـەراسـیۆنی دیجلـەدا بەشـدار بـوون[٣٣٧] لەگـەڵ ئەوانەشـدا مـستەفا بارزانی دووجار بۆ بەستنی پێوەندیی، نامەی بۆ فەرمانڕەوایانی تورك نارد، بـەڵام ئەوان بێنەوەی نامەکان بکەنەوە، دەیانناردنەوە، لەبەرئەوەی پێیان وابـوو تـەنها ئەگەر نامەکانیش بکەنەوە، ئەوا دان بەبوونی کورددا ئەنێن[٣٣٨]

هەروەها ئـەو سـەرکەوتنانەی شۆڕشـی ئـەیلول لەسـاڵی ١٩٦٩ لـە بـەرەکانی شەڕدا دژی حوکمەتی عێراق بەدەستی هێنان، ڕژێمی تورکیای خـستە دڵـەراوکێو وای لێکرد کە دژی شۆڕشی کوردستان هاوکاری وڵاتانی بەرەی ڕۆژهەڵات و عێـراق بکات. ئەوەبوو ئەو فڕۆکانەی لە ئەڵمانیای ڕۆژهەڵاتەوە بۆمبای ناپاڵمیان بۆ بەغدا دەگواستەوە ڕێگای نیشتنەوەیان لە تورکیا پێدرا[٣٣٩]

لەکاتی ڕاگەیاندنی بەیاننامەی ١١ی مارتی ١٩٧٠شدا، ڕژێمی تورکیا نـاڕەزایی توندی دژی سەلماندنی مافەکانی نەتەوەی کورد نیشاندا[٣٤٠]

ساڵی ١٩٧٢ ڕژێمی تورکیا پڕۆتۆکۆڵێکی ئابووری لەگەڵ عێـراق مـۆرکرد، بـۆ فراوانکردنی بنکەی هاوکاری ئابووری نێوانیان لـە بوارەکـانی نـەوت و بازرگـانی و ترانزیت[٣٤١]

---

(٣٣٧) بۆ زیاتر زانیاریی بڕوانە: صدیق عثمان، عملیة دجلة والمؤامرة على ثورة ایلول، "گـولان العربي"، ع(١٦)، ٢٥ ايلول ١٩٩٧، ص٣١-٣٧.

(٣٣٨) گفتوگـۆ لەگـەڵ دکتـۆر مـەحمود عوسمـان، ڕۆژنامـەی "ئـەمڕۆ" (ڕۆژنامەیـەکی سیاسیی...ڕووناکبیریی ئازادە)، بەشی یەکەم، ژ(٢٨)، سەرەتای ئابی ٢٠٠٣

(٣٣٩) جەمال نەبەز، کوردستان و شۆڕشەکەی، ل١١٥.

(٣٤٠) بۆ زانیاریی زیاتر بگەڕێوە بۆ تەوەری سێیەمی بەشی یەکەمی باسەکەمان.

(٣٤١) عايدة العلي سري الدين، المسألة الكردية في ملف السياسة الدولية، ط١، منشورات دار الافاق الجديدة، بيروت، ٢٠٠٠، ص٢١.

له ٢٤ی ئابی ١٩٧٣شدا حوكمەتی عێراق رێككەوتننامەیەكی لەگەڵ كۆماری توركیا بەست بۆ راكێشانی بۆڕی نەوت بەنێو خاكی توركیا بۆ دەریای ناوەڕاست، بەپێی چەند مەرجێك كە بەقازانجی توركیا دەگەڕایەوە، ئەوەش بووە مایەی نارەزایی پارتی دیموكراتی كوردستان و لەسەرئەوە رەخنەی ئاراستەی رژێمی بەعس كردو حوكمەتی توركیاشی بە كۆنەپەرست لە قەڵەمدا[٣٤٢]

بەدرێژایی مێژوو دەسەلاتدارانی تورك لەهەر پارچەیەكی كوردستان هەر بزووتنەوەو شۆڕشێكی كوردستان بەرپابووبێت، بەمەترسی و هەڕەشەیان زانیوە بۆ خۆیان لەترسی ئەوەی نەوەك ببێتە مایەی جووڵاندنی كوردانی ژێر دەسەلاتی خۆیان، لەبەرئەوە لەپێناو شكست هێنانی ئەو شۆڕش و راپەڕینانەدا بەشداری و هاوكاری رژێمە داگیر كەرەكانی دیكەی كوردستانیان كردووە یاخود خۆشحاڵی خۆیان دەربڕیوە. هەر بەو پێودانگەش دوای رێكەوتننامەی جەزائیری ساڵی ١٩٧٥ و نسكۆی شۆڕشی ئەیلول، رژێمی توركیا بەختەوەر بوو كە شۆڕش سەركەوتنی بەدەست نەهێنا، لەترسی ئەوەی نەوەك كاریگەریی زیاتر بخاتە سەر كورد لە كوردستانی ژێر دەسەلاتی توركیا بەتایبەتی دوای ئەوەی شۆڕشەكە كاریگەریی زۆری خستبووە سەر بزواندنی هەستی نەتەوایەتی كورد لەو پارچەیەو لەژێر ئەو كاریگەرییە پارتی دیموكراتی كوردستان– توركیا سەریهەڵدابوو وێڕای بوونی رێكخستنی دیكەی كوردی لەوێدا[٣٤٣]

(٣٤٢) بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: "الكادر"، ع(٢٠)، السنة الخامسة، تشرين الثاني ١٩٧٣، ص٣٣–٤٠.

(٣٤٣) مثنى امين قادر، قضايا القوميات واثرها على العلاقات الدولية (القضية الكردية نموذجا)، منشورات مركز كردستان للدراسات الاستراتيجية، السليمانية، ٢٠٠٣، ص١٧٢.

## ٣- یەکێتی سۆڤیەت

کاریگەریی شۆڕشی ئەیلول هێجگار مەزن بوو. لەسەر ئاستی ناوخۆ چەندین جار رژێمە داگیرکەرە فەرمانڕەواکانی عێراقی هەراسانکرد و ناچاری کردن پەنا بۆ دانوستان بەرن و لەسەر مێزی گفتوگۆ لەگەڵ سەرکردایەتیی بزاڤی رزگاریخوازی کوردستان کۆببنەوە. لەسەر ئاستی دەرەوەش، چەندین وڵاتی زلهێزی بەرانبەر بەسیاسەتی کۆکوژی و رەگەزپەرستانەی دەسەڵاتدارانی عێراق بەدەنگ هێنا، لەوانەش یەکێتی سۆڤیەت.

بەرایی ئەو هەڵوێستەی یەکێتی سۆڤیەت لەوەدا خۆی نواند کە ساڵی ١٩٦٢ لەبەرانبەر ئەو سیاسەتەی رژێمی ئەوسای عێراق دژی کورد ئەنجامیدەدا بەتوندی نارەزایی خۆی پێشکەش بە نەتەوە یەکگرتووەکان کرد و ناوی نا "لەناوبردنی بەکۆمەڵ"(٣٤٤).

بەشێوەیەکی گشتییش، رۆژنامەو میدیاکانی سۆڤیەتیی، دوای ساڵی ١٩٦٢ هەڵوێستی سۆز و پشگیریيان بۆ شۆڕشی کورد نیشانداو کۆمەکە مادییەکانی ئەو دەوڵەتە لە ساڵی ١٩٦١ تاکو ١٩٧٢ بەردەوام گەیشتوونەتە شۆڕشگێرانی کوردستان(٣٤٥). لەماوەی نێوان ساڵانی ١٩٦٢–١٩٧٢شدا سەرکردەکانی پارتی و نوێنەرانی مستەفا بارزانی بەشانازیی و رێزلێگرتنەوە، لە یەکێتی سۆڤیەت پێشوازییان لێکراوە(٣٤٦). هەروەکو پێشتریش باسمان کرد، یەکێتی سۆڤیەت رۆڵێکی گەورەی لەرێکخستن وسەرخستنی گفتوگۆکانی ساڵی١٩٧٠ی نێوان

---

(٣٤٤) جوناثان راندل، س پ،١٨٠–١٨١.

(٣٤٥) بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: مسعود البارزاني، البارزاني والحركة التحررية الكردية، ج٣، ص٢٧٥.

(٣٤٦) پارتی دیموکراتی کوردستان (سەرکردایەتی کاتی)، س پ، ل٤٦.

بەعس و سەرکردايەتی کورددا گێراوە(*). دوای ئەو بەروارەش، دۆستايەتيی نێوان سۆڤيەت و بزاڤی سياسيی رزگاريخوازی کورد هەر بەردەوام بوو. لە تەمموزی ١٩٧٠، کە (پ د ك) کۆنگرەی هەشتەمی بەست، کۆميتەی ناوەنديی حيزبی شيوعی سۆڤيەتيی بروسکەی پيرۆزبايی بۆ نارد(٣٤٧) کاتێکش لە بەغدا، ١ی کانوونی يەکەمی ١٩٧٠ تەقە لە ئۆتۆمبێلی ئيدريس بارزانی کرا(**)، يەکێتی سۆڤيەت لە رێگەی ناردنی چەند نامەيەکەوە بۆ مستەفا بارزانی، داوای دان بە خۆداگرتنی لێکرد(٣٤٨) هەروەها دوای ئەو پيلانەی کە لە ٢٩ی ئەيلولی ١٩٧١، لەلايەن رژێمی بەعسەوە بۆ لەناوبردنی مستەفا بارزانی ئەنجامدرا(***)، يەکێتی سۆڤيەت نامەی بۆ سەرکردايەتی سياسيی کورد ناردو داوای لێکردن کەخۆيان لەدەسپێکردنەوەی شەڕ بەدوور بگرن. لە ٢٥ی تشرينی يەکەميشدا شاندێکی بالآی سۆڤيەت گەيشتە کوردستان و بۆ پيرۆزبايی لێکردنی بە بۆنەی دەربازبوونی، سەردانی مستەفا بارزانييان کرد. بەو بۆنەيەشەوە نامەيەکيان لەسەرکردايەتيی ولآتەکەيانەوە بۆ هێنابوو(٣٤٩). شايانی باسە پێوەنديی نێوان کوردو يەکێتی سۆڤيەت تەنها لە بواری سياسيدا نەبوو، بەڵکو لەرووی زانست و خوێندنيشەوە سۆڤيەتييەکان هاوکاريی کورديان دەکردو بواريان بۆ دەرەخساندن. بۆ نمونە ساڵی ١٩٧٢ (ئيحسان شێرزاد)ی سەرۆکی کۆڕی زانياريی

---

(*) لە تەوەری دووەمی بەشی يەکەمی باسەکەمان زياتر لەم بابەتە دواوين.

(٣٤٧) بۆ دەقی بروسکەکە بڕوانە: "التآخي"، ع(٤٧٧)، ١٩٧٠/٧/٢.

(**) لە تەوەری دووەمی بەشی سێيەمی باسەکەمان زياتر تيشك خراوەتە سەر ئەو رووداوە.

(٣٤٨) مسعود البارزاني، البارزاني والحركة التحررية الكردية، ج٣، ص٢٦٠.

(***) لە تەوەری دووەمی بەشی سێيەمی باسەکەمان زياتر لەو بابەتە دواوين.

(٣٤٩) بۆ زانياريی زياتر بڕوانە: مسعود البارزاني، البارزاني والحركة التحررية الكردية،ج٣، ص٢٦٥-٢٦٦.

کورد، نامەیەکی لە (ج.سکریابین)ی سکرتێری گشتیی ئەکادیمیای زانستەکانی سۆڤیەتیی پێگەیشت کە تیایدا بڕیاردرا بوو بە تەرخان کردنی پێنج کورسی خوێندنی باڵای دیراساتی کوردیی لە بوارەکانی زمان و ئەدەب و مێژوو و ئابووریی ئەتنۆگرافیا، بۆ ساڵی خوێندنی ١٩٧٢– ١٩٧٣،بۆ کۆڕی زانیاریی کورد(٣٥٠)

هەر لە چوارچێوەی ئەو پێوەندییە دۆستایەتیی و سیاسییەی نێوان یەکێتی سۆڤیەت و پارتی دیموکراتی کوردستان، شوباتی ١٩٧٢ لەکاتێکدا کە گرژیی پێوەندیی نێوان ڕژێمی بەعس و پارتی ڕوو لە زیادبوون بوو(*)، شاندێکی سۆڤیەتیی بە سەرۆکایەتیی ڕۆمانسیڤ کە ئەندامی کۆمیتەی ناوەندیی حیزبی شیوعی سۆڤیەتیی بوو، بۆ وتووێژکردن لەگەڵ مستەفا بارزانی سەبارەت بەگرژیی و ناکۆکییەکانیان لەگەڵ حوکمەتی بەعس، هاتە ناوپردان. لەو وتووێژەدا، مستەفا بارزانی داوای لە سۆڤییەتییەکان کرد لایەنگیری عێراق نەکەن و پڕچەکی نەکەن، لەبەرئەوەی دەسەڵاتدارانی عێراق ئەگەر بەهێزبن دەکەونە پەلاماردانی کوردان(٣٥١)، بەڵام سۆڤیەت گوێی بەداخوازییەکانی کورد نەداو لەپێناوی پتەوکردنی پێگەو دەسەڵاتی خۆی لەرۆژهەڵاتی ناوەڕاست، لە ٩ی نیسانی ساڵی ١٩٧٢ لە بەغدا، پەیمانی دۆستایەتیی و هاوکاریی لەگەڵ ڕژێمی عێراق بەست، کە لەلایەن (ئەلیسکی نیکولاییفیچ کوسیجین)ی سەرۆک وەزیرانی سۆڤیەت و(ئەحمەد حەسەن ئەلبەکر)ی سەرۆک کۆماری عێراقەوە، مۆرکرا(٣٥٢)

---

(٣٥٠) بڕوانە "التآخي"، ع(١١٢٠)، ٢٤ /٨/ ١٩٧٢.

(*) لە تەوەری دووەمی بەشی سێیەمی باسەکەمان بەدرێژی لە گرژی نێوان بەعس و (پ.د.ك) دواوین.

(٣٥١) ئیبراهیم جەلال، س پ، ل٣٥٣.

(٣٥٢) بۆ زانیاریی زیاتر دەربارەی پەیماننامەکەو ماددەکانی بڕوانە: "الوقائع العراقية"، ع(٢١٢٨)، ١٩٧٢/٤/٢٥.

ماددەی یەکەمی پەیماننامەکە، ئامارژە بەوەدەکات کە هەردوو دەوڵەت لەبواری سیاسیی و ئابوریی و بازرگانیی و تەکنیکیی و زانستیی و رووناکبیریی و هی دیکەش، لەسەر بنەمای رێزگرتنی سەروەریی دەوڵەت و دەستێوەرنەدان لەکاروباری ناوخۆی یەکتر، هاوکاریی نێوانیان پێشدەخەن[٣٥٣] لەمەشەوە هەڵوێستی یەکێتی سۆڤیەت بەروونیی دەردەکەوێت کە پشتگیریی و بەهێزکردنەوەی رژێمی رەگەزپەرستی عێراق و پشت کردنە لە بزاڤی رزگاریخوازی کوردستان.

شایانی باسە پێش مۆرکردنی ئەو پەیماننامەیە، سۆڤیەت شاندێکی پێکهاتوو لە دیپلۆمات و ئەفسەرانی هەواڵگریی و رۆژنامەوانی ناردە حاجی ئۆمەران، کە بارەگای سەرکردایەتیی سیاسیی کوردی لێبوو، بۆ ئاگادارکردنیان لە بەستنی پەیماننامەکەیان لەگەڵ حوکمەتی عێراق. بەڵام ئیسرائیل رۆڵێکی کاریگەریی نواند لەرازیکردنی مستەفا بارزانی بۆ رەتکردنەوەی هەر دەسپێشخەریی و لێکدانەوەیەکی سۆڤیەتییەکان[٣٥٤]، کە رەنگە مستەفا بارزانی خۆیشی هەستی کردبێت پەیماننامەکە لەبەرژەوەندی کورددا نابێت.

هەروەها یەکێتی سۆڤیەت، بەر لە مۆرکردنی پەیماننامەکە، شاندی دیکەشی ناردبووە لای مستەفا بارزانی، بۆئەوەی رازی بکات پێوەندیی خۆی لەگەڵ رژێمی عێراق باشبکاتەوەو هاوشانی حیزبی شیوعی عێراق، بەشداری پێکهێنانی بەرە بێت لەگەڵ بەعس. بەڵام لەبەرئەوەی نوێنەرایەتیی سۆڤیەت، تەنیا گوشاری رێککەوتن لەگەڵ دەسەڵاتدارانی عێراقی بۆ کورد دەهێناو هیچ فشارێکی بۆ بەدیهێنانی خواستەکانی کورد نەدەخستە سەر ئەوان، بۆیە سەرکردایەتیی کورد

(٣٥٣) بڕوانە: "الوقائع العراقية"، ع(٢١٢٨)، ١٩٧٢/٤/٢٥.

(٣٥٤) صلاح الخرسان، التيارات السياسية في كردستان العراق، ص٢٠٧.

گوێی بەداواکەیان نەدا[٣٥٥] لێرەدا دەتوانین بڵێین سۆڤیەتییەکان لە ناردنی ئەو شاندانەیان بۆ لای سەرکردایەتی سیاسیی کورد بەر لە مۆرکردنی پەیماننامەی دۆستایەتیی و هاوکاریی لەگەڵ عێراق، چەند ئامانجێکیان هەبووە، لەوانەش:

١- کۆتایی پێهێنانی کێشەی کورد و پشگیریکردنی رژێمی عێراق، بەمەبەستی زەمینە خۆشکردن بۆ بەدیهێنانی بەرژەوەندییەکانی لە عێراقدا.

٢- رێگرتن لە هەوڵی وڵاتانی رکابەری وەك ئێران و وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکاو ئیسرائیل،بۆ بەهێزکردنی پێوەندییان لەگەڵ بزووتنەوەیرزگاریخوازی کوردستان و بەکارهێنانی کورد بۆ جێبەجێکردنی پلان و بەرژەوەندییەکانیان. لەبەرئەوەی ئەو وڵاتانەش، کە خاوەن بەرنامەو بەرژەوەندی خۆیان بوونە لە ناوچەکەدا، لەو سەردەمەدا پێوەندییان لەگەڵ سەرکردایەتیی سیاسیی کورد هەبووە.

بەر لە مۆرکردنی پەیماننامەی دۆستایەتیی و هاوکاریی نێوان یەکێتی سۆڤیەت و عێراق، لە بەغدا کۆسیجین لەگەڵ شاندێکی پارتی کۆبۆوە، لەوێدا باس لە پێوەندیی نێوان حیزبی شیوعی سۆڤیەتی و پارتی، هەروەها پێوەندیی پارتی لەگەڵ حیزبی بەعس و، پێوەندیی حیزبی بەعس لەگەڵ دەوڵەتی سۆڤیەت کرا. هەر لەو کۆبوونەوەیەدا شاندی پارتی نامەی مستەفا بارزانی دا بە کۆسیجین[٣٥٦] لە نامەکەدا باسی لە پابەند نەبوونی رژێمی بەعس بە جێبەجێکردنی بەیاننامەی ١١ی مارت و ئەو دەستدرێژییانە کردبوو کە لەلایەن بەعسەوە کرابووە سەر کوردستان و پارتی دیموکراتی کوردستان[٣٥٧]، بەڵام ئەو نامەیەش بۆ فشار

---

(٣٥٥) بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: نەوشیروان مستەفا ئەمین، پەنجەکان یەکتری ئەشکێنن، ل١٠٨-١٠٩.

(٣٥٦) مسعود البارزاني، البارزاني والحركة التحررية الكردية،ج٣، ص٢٨٣.

(٣٥٧) بۆ زانیاریی زیاتر دەربارەی نامەکە بڕوانە: هـ س، ل٥٩٣-٥٩٥.

خستنە سەر دەسەڵاتدارانی بەغداو ناچارکردنیان بۆ جێبەجێکردنی بەیاننامەی ١١ی مارت و پەیرەوکردنی سیاسەتێکی دیموکراتیانەو ئاشتیخوازانە لە کوردستان، کاری لە سۆڤیەتییەکان نەکرد.

هەر لەمیانی ئەو سەردانەیاندا بۆ بەغدا، کۆسیجین و لێپرسراوانی دیکەی سۆڤیەت، داوایان لە وەزیرە کوردەکان کردبوو کە پارتی دیموکراتی کوردستانیش بەشداری پێکهێنانی بەرە بێت لەگەڵ حیزبی بەعس و حیزبی شیوعی عێراق، پشتیوانیش بۆ پەیماننامەی دۆستایەتیی و هاوکاریی دەرببڕێت. دوای مۆرکردنی پەیماننامەکەش شاندێکی سۆڤیەتیی بەیاوەریی عەزیز شەریف، سەردانی مستەفا بارزانی یان کردو داوایان لێکرد بروسکەی پشتیوانیی بۆ دەسەڵاتدارانی عێراق بنێری. بەڵام مستەفا بارزانی، نەك هەر ئامادەنەبوو پیرۆزباییان لێ بکات، بەڵکو بە توندییش نارەزایی خۆی دەربڕی، چونکە بڕوای وابوو کە عێراق لەرێگەی ئەو پەیماننامەیەوە چەك و تەقەمەنی لە سۆڤیەت وەردەگرێ و دژی کورد بەکاریدێنێ. هەروەها مستەفا بارزانی جەختیشی کردەوە کە (پ د ك) بەشداری پێکهێنانی بەرە نابێت[٣٥٨] لە دیدارێکیشدا لە ٢١ی نیسانی ١٩٧٢ لەگەڵ رۆژنامەی (لێ ڤیگارۆ)ی فەرەنسیی، مستەفا بارزانی رایگەیاند: "نزیك بوونەوەی عێراق و سۆڤیەت لە یەکتریی، دژی ئێمەیە. لەبەرئەوەی ئەو برە چەکانەی سۆڤیەت بەعێراقی دەدات، رژێمی عێراق ئەو چەکانە دژی ئێران و ئیسرائیل بەکار ناهێنی، بەڵکو دژی کورد بەکاریان دێنێ"[٣٥٩]

سەرکردایەتی کورد دڵنیابوون کە کاربەدەستانی عێراق خەمخۆری بووژاندنەوەی وڵاتەکەیان نین تا بیکەنە ئامانجی پەیماتی دۆستایەتیی لەگەڵ

(٣٥٨) نەوشیروان مستەفا ئەمین، پەنجەکان یەکتری ئەشکێنن، ل١٠٩.

(٣٥٩) صلاح الخرسان، التيارات السياسية في كردستان العراق، ص٢٠٧.

ولآتان، بەڵکو ئامانجیان لەو جۆرە سیاسەتە پتەوکردنی دەسەڵات و خۆ پڕچەك کردن و بەهێزکردنی توانای سەربازییە، بەنیازی بەرەنگاربوونەوەی نەیارانیان لە ناوەوەو دەرەوەی عێراق. هەر بۆیە، مستەفا بارزانی لە پێزانینی مۆرکردنی ئەو جۆرە پەیماننامەیە لەگەڵ ولآتێکی زلهێز، پرگومان بوو و دژی وەستا. ئەو هەڵوێستانەی سەرکردایەتیی سیاسیی کوردیش بووە فاکتەری لاوازبوونی پێوەندییەکانی لەگەڵ یەکێتی سۆڤیەت.

شایانی باسە کۆسیجین لە کۆبوونەوەیەکیدا لەگەڵ شاندی کورد، پێشنیاری کردبوو کە بۆ چارەسەرکردنی تەواوی کێشەی کورد، هەردوولایەنی حوکمەتی عێراق و سەرکردایەتی سیاسیی کورد، شاندی خۆیان بنێرنە مۆسکۆ، تاکو لەوێدا گفتوگۆی لەسەر بکەن، بەڵام دواتر ئەو پێشنیارە لەلایەن سۆڤیەتییەکانەوە پشتگوێ خرا[٣٦٠]

جگە لە مۆرکردنی پەیماننامەی نێوان سۆڤیەت و عێراق، فاکتەرێکی دیکەی لاوازبوونی پێوەندیی نێوان یەکێتی سۆڤیەت و جووڵانەوەی رزگاریخوازی کورد ئەو پێوەندییە نهێنیە بوو کە سەرکردایەتیی ئەو جووڵانەوەیە، لەو سەردەمەدا لەگەڵ کاربەدەستانی ولآتە یەککگرتووەکانی ئەمەریکادا بەستبووی[*] دەزگای هەواڵگری سۆڤیەتیش (KGB) ئاگاداری سەرەتاکانی دروستبوونی ئەو پێوەندییە بوو و چەند جارێکیش سەرکردایەتیی سیاسیی کوردی لەم پێوەندییە ئاگادار کردبۆوە، لەبەرئەوەی سۆڤیەتییەکان دژی پێوەندیی کوردو ولآتە یەککگرتووەکانی ئەمەریکا بوون. بۆیە پێوەندیی نێوان کوردو یەکێتی سۆڤیەت زیاتر بەرەو

(٣٦٠) کریس کۆچیرا، س پ، ل٤٣٥.

(*) لەلاپەڕەکانی داهاتوو باس لە پێوەندیی نێوان کوردو ولآتە یەککگرتووەکانی ئەمەریکا کراوە.

ساردبوون چوو، تاگەیشتە ئاستی لێکپچڕان[٣٦١]. شایانی باسە کاربەدەستانی سۆڤیەت، دوای مۆرکردنی پەیماننامەکەیان لەگەڵ حوکمەتی عێراق، هەوڵیاندا چەند سیاسەتمەدارێکی کورد، لەوانەش جەلال تاڵەبانی، رازیبکەن بچنە پاڵ رژێمی بەعس[٣٦٢]، بەڵام ئەوەشیان بۆ مەیسەر نەبوو.

دەبێ ئەوەش بگوترێ، هەر لەپاش نیوەی دووەمی ساڵی ١٩٧٢ سەرکردایەتیی سیاسیی کورد هەوڵێکی ئەوتۆی نەدا کە پێوەندییەکانی لەگەڵ هێزە سۆشیالیست و پێشکەوتنخوازەکانی جیهان بپارێزێت. تەنانەت لەنێو ئەو سەرکردایەتییەدا کەسانی واهەبوون کە بەئاشکرا دژایەتی ئەو پێوەندییانەیان دەکرد[٣٦٣]. ئەمەش لەوەوە سەرچاوەی گرتبوو، کە ئەو کەسانە کەوتبوونە ژێر کاریگەریی ئەو پێوەندییانەی سەرکردایەتیی جووڵانەوەی رزگاریخوازی کورد، لەو سەردەمەدا لەگەڵ هەریەکە لە ئێران و ئیسرائیل و وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکادا هەیبوو.

بەو شێوەیە لەگەڵ مۆرکردنی پەیماننامەی دۆستایەتیی و هاوکاریی نێوان بەغداو مۆسکۆ، چیدیکە سۆڤیەت پشتگیری لەکورد نەکرد، تەنانەت لەنسکۆی شۆڕشی کوردستان لەساڵی ١٩٧٥دا، کەمترین هاوکاریی ئەو جووڵانەوەیەی نەکرد، بەڵکو زیاتر بەرژەوەندییە تایبەتییەکانی خۆی لەبەرچاوگرت و کەوتە هاریکاریکردنی حوکمەتی عێراق.

---

(٣٦١) مسعود البارزاني، البارزاني والحركة التحررية الكردية،ج٣، ص٢٨١–٢٨٢و ٢٧٥.

(٣٦٢) بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: هـ س، ل٢٨٢.

(٣٦٣) پارتی دیموکراتی کوردستان (سەرکردایەتی کاتی)، س پ، ل٦٤.

## ٤- وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا

وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا وەك زلهێزێکی سیاسیی سیاسیی خاوەن بەرژەوەندی لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا، هەر لە سەرەتای بەرپابوونی شۆڕشی ئەیلولەوە لە کوردستانی ژێر دەسەڵاتی عێراق، بە بایەخێکی زۆرەوە لە رێگەی باڵیۆزخانەکانی لە بەغداو وڵاتانی دەوروبەر، چاودێری ئەو گۆڕانکارییانەی دەکرد کە بەهۆی شۆڕشەکەوە لە عێراق و کوردستان دەهاتنە ئارا واشیان لە پرسی کورد دەڕوانی کە کێشەیەکی ناوخۆیی عێراقەو رێگاچارەی سیاسیی پێویستە. تەنانەت هەندێ جار هەڵوێستیان نواندووەو داوایان لە دەسەڵاتدارانی عێراق کردووە کە سیاسەتێکی نەرم لە بەرانبەر گەلی کورد پەیڕەو بکەن[٣٦٤] لە ساڵی (١٩٦٥)یشەوە وڵاتە یەگرتووەکان بواری بە شۆڕشی رزگاریخوازی کوردستان دا نوێنەرایەتی خۆی لەو وڵاتەدا دابمەزرێنێ و لە رێگەی نوێنەرایەتی وەزارەتی دەرەوەشیەوە پێوەندیی لەگەڵ دامەزراندن، بەڵام تا ساڵی ١٩٧٢، کە لەو ساڵەدا بە هۆی ئێران و ئوردنەوە ئەنجامیدا، هیچ کۆمەکێکی شۆڕشی کوردستانی نەکرد[٣٦٥]

---

(٣٦٤) بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: مومتاز حەیدەری، د.کوردستان موکریانی، د.دلێر ئیسماعیل حەقی شاوەیس، کۆنگرەی یادەوەریی سەد ساڵەی بارزانی نەمر، ب١، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠٣، ل١٧٧-١٩٧.

(٣٦٥) دیدار لەگەڵ د. شەفیق قەزاز، هەولێر،٢٠٠٣/٥/٨، شەفیق قەزاز: ساڵی ١٩٣٤ لە سلێمانی لەدایك بووە، ساڵی ١٩٦٠ بەشی ئابووری کۆلیژی بازرگانی و ئابووری زانکۆی بەغدای تەواو کردووە، پاشان چۆتە وڵاتە یەگرتووەکانی ئەمریکا و لە بەشی دیراساتی نێودەوڵەتی لە زانکۆی ئەمریکی لە واشنتۆن، ماستەرو دکتۆرای تەواو کردووە، ساڵی ١٩٦٥-١٩٧٣ نوێنەری شۆڕشی کوردستان بووە لە وڵاتە یەکگرتووەکان، ساڵی ١٩٧٣-١٩٧٤ بەرپرسی راگەیاندنی پارتی دیموکراتی کوردستان

بۆ ئەو شێوە پێوەندییەی نێوان سەرکردایەتی بزووتنەوەی سیاسیی کوردو ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا، حوکمەتی ئێران ڕۆڵێکی گرنگی گێڕاو بووە پردی پێوەندیی هەردوولایان. ئەو پێوەندییە ناراستەوخۆیەش لەگەڵ ولاتە یەکگرتووەکان ئەلقەیەکی لاواز بوو. تەنانەت هەندێ جار کاربەدەستە ئەمەریکییەکان بە سیاسییەکانی کوردیان دەگوت، پێوەندیی ئێمەو کورد لەسەر داوای شای ئێرانە، هەر کاتێ شا ئەو پێوەندییەی نەوێت، ئێمەش نامانەوێت(٣٦٦). ئەو یارمەتییەی ولاتە یەکگرتووەکانیش هەروەکو ڕاپۆرتی پایك(*) جەختی لەسەر کردووە بەرانبەر ئەو زانیاریانە بوو کە ئێران پێشکەش بە دەزگای هەواڵگری ئەمەریکی (C.I.A) کردبوو(٣٦٧).

---

بووە، ساڵی ١٩٧٤–١٩٧٥ بەرپرسی نوسینگەی شۆرشی کوردستان بووە لە تاران، ساڵی ١٩٧٥–١٩٧٦ لەگەڵ نوێنەری نەتەوە یەکگرتووەکان کاری کردووە بۆ ناردنە دەرەوەی ئەو کوردە ئاوارانەی لە ئێران بوون، لە ساڵی ١٩٩٦یشەوە وەزیری یارمەتی مرۆڤایەتی و هاوکارییە لە حکومەتی هەرێمی کوردستان. دیدار لەگەڵ دکتۆر شەفیق قەزاز، هەولێر، ٢٠٠٣/٥/٨.

(٣٦٦) دیدار لەگەڵ دکتۆر شەفیق قەزاز، هەولێر، ٢٠٠٣/٥/٨.

(*) پایك: ئەو لیژنەی لێکۆلینەوەیە بوو کە کۆنگریسی ئەمەریکی، بە سەرۆکایەتی سیناتۆری دیموکراتی ویلایەتی نیۆرك (ئۆتیس ج.پایك)، بۆ لێکۆلینەوە لە چالاکیەکانی دەزگا هەواڵگریەکانی سەردەمی هەردوو سەرۆك نیکسۆن و فۆرد، دوای دەست لەکار کێشانەوەی سەرۆك نیکسۆن لە کارەکەی لە ئابی ١٩٧٤، پێکی هێنا، بە مەبەستی زانینی کردارە نهێنیەکانی (C.I.A) لە ناوچە جیا جیاکانی جیهان لەوانەش کوردستانی ژێر دەستی عێراق، کە بۆ یەکەم جار قەبارەی ئەو یارمەتییە بە ژمارەی تەواو زانرا کە کارگێریی ئەمەریکیی پێش نسکۆی شۆرشی ئەیلول پێشکەشی شۆرشی کوردی کردبوو. بڕوانە: صلاح خرسان، التيارات السياسية في كردستان العراق، ص٢٧٩.

(٣٦٧) The Pike Report

بـۆ گرێـدانی ئـەو پێوەندییـەو بەدەسـتهێنانی کۆمـەك و پـشگیری ولاتـە یەکگرتووەکان، لە تشرینی دووەمی ١٩٧١و مارتی ١٩٧٢ شـای ئێـران هـاواری بـۆ (نیکسۆن)ی سەرۆکی ولاتـە یـەکگرتووەکانی ئەمـەریکا بـرد، کـە بـۆ یارمەتیـدانی شۆڕشی کورد هاوکاری بکات[٣٦٨] بێگومان مەبەستی رژێمی ئێرانیش لەو هەولانـە ئەوەبوو کە لەلایەکـەوە ئـەو جوولانەوەیـە دەسـتەمۆ بکـات و نـەهێڵێت تەشـەنە بکات و کاریگەریی بخاتە سەر پارچەکانی دیکەی کوردستان کـە کەوتوونەتـە ژێـر دەسەلاتی ئێران و تورکیاو سوریا، لەلایەکی دیکەشەوە سنوورێك بـۆ بـەهێزبوونی رژێمی عێراق دابنێت، نەوەك ببێتە هەڕەشـەیەك بـۆ سـەر ئێـران کـە کێشەیەکی سنووری مێژوویی لەنێوانیاندا هەیە.

(حسێن کوڕی طەلال)ی شای ئوردنیش بەهۆی ئـەو پێوەندییـە بەتینـەی کـە هەر لە ساڵی (١٩٦٦)ەوە لەگەڵ مستەفا بـارزانی هـەیبوو، سـاڵی ١٩٧٢ رۆڵێکـی گرنگی گێڕا لە رازیکردنی سەرۆکی ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا، بـۆ پێـشکەش کردنی یارمەتی بـۆ جوولانـەوەی رزگـاریخوازی کوردسـتان[٣٦٩] تەنانـەت لـە ٢٨ی مارتی ئەو ساڵەدا مـستەفا بـارزانی بـەهۆی شـای ئوردنـەوە داوای خـۆی گەیانـدە نیکسۆن بۆ پێشکەشکردنی هاریکاریی[٣٧٠]

مـۆرکردنی پەیماننامـەی دۆسـتایەتیی و هاوکـاریی نێـوان عێـراق و یـەکێتی سۆڤیەت و بـەهێزبوونی سـوپای عێـراق بـەهۆی وەرگرتنـی بـڕە چـەکێکی زۆر لـە یەکێتی سۆڤیەت، بووە هۆی ئەوەی کە هێزەکانی عێراق خۆیان بۆ هێـرش کردنـە

---

(٣٦٨) Henry Kissinger, Years of Renewal, The Concluding Volume of his memoirs, New York , 1999, P 581.

(٣٦٩) بروانە، مسعود البارزاني، البارزاني والحركة التحررية الكردية، ج٣، ص٢٧٤–٢٧٥.

(٣٧٠) Henry Kissinger, Op.Cit. P581

سەر کوردستان ئامادە بکەن. بەمەش ئەو هاوسەنگییە لەنێوان هێزەکانی کوردو ڕژێمی بەعس نەما کە بەهۆی هاوکاری ئێران ئیسرائیل بۆ کورد دروست ببوو. لەلایەکی دیکەشەوە پێکهەڵپڕژانی نێوان هێزەکانی عێراق و ئێران بە درێژایی سنوورەکانی نێوانیان سەریهەڵدا. هەموو ئەوانە وای لە نیکسۆن کرد لە ٣٠-٣١ی ئایاری ١٩٧٢ بچێتە سەردانی شای ئێران لە تاران، کە پرسی لاوازکردنی ڕژێمی عێراق و هاوکاریکردنی دارایی جووڵانەوەی کورد بۆ ئەو مەبەستە، بابەتێکی گرنگی گفتوگۆی نێوانیان بوو[٣٧١]. شایانی باسە نیکسۆن لەو سەردانەیدا پرسی کوردی هێنابووە گۆڕێ و بابەخ و گرنگی کانگا نەوتەکانی ناوچەکەو ئەگەری هەڕەشەکردنی بەرژەوەندییەکانی ولاتە یەکگرتووەکانی خستبووە بەر باس، بەڵام کیسنجەر کە ڕاوێژکاری ئاسایشی نەتەوەیی ولاتە یەکگرتووەکان و یاوەری سەرۆکەکەی بوو لەو سەردانەدا، هەموو هزرو بیری بۆ چۆنیەتی لاوازکردنی هەژموونی سۆڤیەتی لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست، تەرخان کردبوو[٣٧٢].

لەو ڕۆژگارەدا ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا دەیویست جووڵانەوەی کورد وەکو کارتێك بۆ لاوازکردنی ڕژێمی عێراق بەکاربهێنێ، بۆیە لەگەڵ ئێران ڕێککەوت، تاکو لەڕێگەی ئەوانەوە مامەڵەو هاوکاری لەگەڵ کورددا بکات[٣٧٣]

دوابەدوای گەڕانەوەی نیکسۆن و کیسنجەر لە سەردانی تارانەوە بۆ واشنتۆن، ڕژێمی بەغدا (کۆمپانیای نەوتی عێراق–I.P.C)ی خۆماڵیکرد کە ماوەیەکی زۆر بوو لەلایەن کۆمپانیا نەوتییەکانی بەریتانیاو هۆڵەنداو ولاتە یەکگرتووەکان و فەرەنساوە خاوەنداریێتی دەکرا، ئەوەش پاڵنەرێکی دیکەبوو بۆ ولاتە

---

(٣٧١) بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: Henry Kissinger, Op.Cit. P.581-583

(٣٧٢) گوینتەر دێشنەر، س پ، ل٢٣٥-٢٣٦.

(٣٧٣) دیدار لەگەڵ دکتۆر شەفیق قەزاز، هەولێر، ٢٠٠٣/٥/٨.

یەکگرتووەکان کە بۆ بەرگرتن لە هاتنە ناوەوەی یەکێتی سۆڤیەت بۆ ناو یەکێك لە گەورەترین وڵاتی بەرهەمهێنی نەوت لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاست، دەست لە کێشە ناوخۆییەکانی عێراق وەربداتو لەو چوارچێوەیەشدا دەستی یارمەتی بۆ بزووتنەوەی رزگاریخوازی کوردستان درێژ بکات[٣٧٤] مستەفا بارزانییش "پیاوێ بوو، یارمەتی لە راست و چەپ وەردەگرت. پیاوی کار بوو. لە هەموو دەوڵەتەکان یارمەتی وەردەگرت"[٣٧٥] هەوڵیشیدەدا سوود لە بارودۆخی شەڕی ساردی نێوان رۆژهەڵات و رۆژئاوا وەربگرێت و پشتگیری هەردوولا بەدەست بهێنێت هەروەکو چۆن لەسەردەمی شۆڕشی ئەیلول لەیەك کاتدا یارمەتی دارایی لە یەکێتی سۆڤیەت و یارمەتی دارایی و سەربازیشی لە ئێران وەردەگرت، هەر بەو شێوەیەش لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا نزیك بۆوە[٣٧٦] لەو کاتەشدا بەهۆی تێکچوونی پێوەندیی نێوان جووڵانەوەی کوردو رژێمی بەعس بەتایبەتی دوای هەوڵی تیرۆرکردنی مستەفا بارزانی و گرتنەبەری سیاسەتی راگوێزانی کوردو بەعەرەبکردن لەناوچەکانی کوردستان و بێئومێد بوون لە جێبەجێکردنی خاڵەکانی بەیاننامەی ١١ی مارت هیچ رێگەیەکی دیکە لەبەردەم سەرکردایەتی کورد نەمایەوە تەنها نزیك بوونەوە نەبێت لەوڵاتێکی زلهێز، لەو کاتەش یەکێتی سۆڤیەت بەهۆی مۆرکردنی پەیماننامەی دۆستایەتییو هاوکاریی لەگەڵ عێراق ببووە هاوپەیمانی بەعس، بۆیە جگە لەچوون بەرەو وڵاتە رۆژئاواییەکان هیچ رێگەیەکی دیکە نەبوو بۆ بەدەستهێنانی یارمەتی، ئەو سەردەمەش وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا بەهێزترین وڵاتی سەر بە بەرەی رۆژئاوا بوو.

---

(٣٧٤) جوناثان راندل، س پ، ل٢٠١–٢٠٢.

(٣٧٥) حوسێن محەمەد عەزیز، خولانەوە لە بازنەیەکی بۆشدا، چ١، چاپخانەی APEC، سوید، ستوکهولم، ١٩٩٧، ل٦٦

(٣٧٦) الاتحاد الديمقراطي الكردستاني اللجنة التأسيسية، س پ، ل٤٩.

هەرچۆنێك بێت بەرژەوەندی کوردو ئەمەریکاییەکان یەکانگیر بوو بۆ بەستنی پێوەندیی نێوانیان. ئەوەبوو لە ١٦ی حوزەیرانی ١٩٧٢ لەدوای کۆبوونەوەیەکی تایبەتی نێوان نیکسۆن و هێنری کیسنجەر، ولاتە یەکگرتووەکان بڕیاری لەسەر یارمەتیدانی کورداو نوێنەری خۆیشیان نارده تاران بۆئەوەی ئەو بڕیارە بە شا رابگەیەنن. شای ئێرانیش لەرێگەی نامەیەکەوە لە ٢٢ی حوزەیران هەواڵی ئەو بڕیارەی گەیاندە مستەفا بارزانی[٢٧٧]

مستەفا بارزانییش بۆ پەرەپێدانی پێوەندییەکانی لەگەڵ ولاتە یەکگرتووەکان، هەوڵیدا سەردانی واشنتۆن بکات و لەگەڵ لێپرسراوە سەرەکییەکانی بەڕێوەبەرایەتی ئەو ولاتە کۆببێتەوە، بەلام کاربەدەستە ئەمەریکییەکان بەوە رازی نەبوون، بەو بیانووەی نەوەك سەفەرەکەی ئاشکرا بێت[٢٧٨] جێی باسە ولاتە یەکگرتووەکان دەیویست پێوەندییەکانی لەگەڵ جوولانەوەی رزگاریخوازی کوردستان بەشێوەیەکی نهێنی بێت نەك ئاشکرا، هەر بۆیەش دەزگا هەواڵگرییەکانیان بە کارەکانی ئەو پێوەندییە هەڵدەستا، هەرچەندە نوێنەرایەتی شۆڕشی کوردستان لەوەو پێشترو ئەوکاتەش زۆر هەوڵیدا پێوەندییەکان لەگەڵ وەزارەتی دەرەوەی ولاتە یەکگرتووەکان بێت، بەلام کاربەدەستانی ئەو ولاتە بەوە رازی نەبوون، دەیانویست پێوەندییەکانیان هەر بەنهێنی بمێنێتەوە. ئەوەش گرفتێك بوو لە پێوەندییە دەرەکییەکانی بزووتنەوی رزگاریخوازی کوردستان لەگەڵ ولاتە یەکگرتووەکان و ولاتانی دیکەش هەم بەهۆی

---

(٢٧٧) بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: مسعود البارزاني، البارزاني والحركة التحررية الكردية، ج٣، ص٣٧٨؛ امين هويدي، كيسنجر وادارة الصراع الدولي، ط١، دار الطليعة للطباعة والنشر، بيروت، ١٩٧٩، ص٧٦.

(٢٧٨) بڕوانە: جوناثان راندل، س پ، ل٢٠٣

نهێنی بوونی ئەو پێوەندییانەو هەم بەهۆی لاسەنگ بوونیان[٣٧٩] بێگومان ئەو هەڵوێستەی وڵاتە یەکگرتووەکانیش بۆئەوە دەگەڕایەوە کە ئەوان ئامانجی پێوەندیی کردنیان بە جووڵانەوەی کورد لەپێناو بەرژەوەندییە تایبەتییەکانی خۆیان بووە نەك بۆ بەرژەوەندی گەلی کوردستان هەروەها بۆ ماوەیەکی کاتی بوون نەك بەردەوام هەروەکو چۆن دواتر لەساڵی ١٩٧٥ پشتیان لە کورد کردو بەشێوەیەك لە شێوەکان بەشداربوون لە شکست پێهێنانی شۆڕشی رزگاریخوازی کوردستان، ئەمانە لەلایەك، لەلایەکی دیکەشەوە دەتوانین بڵێین مەبەستی وڵاتە یەکگرتووەکان لەنهێنی هێشتنەوەی ئەو پێوەندییانە بۆئەوە بووە، تاکو لەرێی پێوەندیی ئاشکراوە بەڵێن بەکورد نەدات و پاشان لەسەری بکەوێت.

لە ئەنجامدانی یەکەم پێوەندیی و دیداری فەرمیدا، شاندێکی کورد کە پێکهاتبوو لە دکتۆر مەحمود عوسمان و ئیدریس بارزانی لە تەموزی ١٩٧٢، بەسەردانێکی زۆر نهێنی چووە واشنتۆن[٣٨٠] لەوێدا لەگەڵ ریچارد هیلمزی بەڕێوەبەری دەزگای هەواڵگری ئەمەریکی (CIA) کۆبوونەوەو ناوبراو ئەوەی پێگوتن کە لەبەرخاتری شای ئێران لەگەڵ شاندی کورد کۆدەبنەوە. هەروەها بەڵێنی هاوکاری دارایی و تەقەمەنیشی پێدان[٣٨١]

بۆ جێبەجێکردنی بڕیارو بەرنامەکانیشیان سەبارەت بە کۆمەك کردنی جووڵانەوەی رزگاریخوازی کوردستان، لە ١ی ئابی ١٩٧٢ نیکسۆن فەرمانی راستەوخۆی پرۆگرامە نهێنییەکەی مۆرکرد کە بەم پێیە وڵاتە یەکگرتووەکان

(٣٧٩) دیدار لەگەڵ دکتۆر شەفیق قەزاز، هەولێر، ٢٠٠٣/٥/٨.

(٣٨٠) دیدار لەگەڵ دکتۆر مەحمود عوسمان، هەولێر، ٢٠٠٣/٩/٢٦.

(٣٨١) بڕوانە: مسعود البارزاني، البارزاني والحركة التحررية الكردية، ج٣، ص٢٧٨؛ نەوشیروان مستەفا ئەمین، پەنجەکان یەکتری ئەشکێنن، ل١١٠.

مانگانە بڕی ٢٥٠هەزار دۆلاری بۆ ساڵی دارایی ١٩٧٢ بۆ کورد تەرخانکرد لەگەڵ دوومليۆن دۆلاریش بۆ چەك و تەقەمەنی[٣٨٢].

جێی باسە شای ئێران و پاشای ئوردن لە ٣١ی تەموز–٢ی ئابی ١٩٧٢ لەسەر زەریای قەزوین کۆبوونەوەو خۆشحاڵی خۆیان بەو یارمەتییەی وڵاتە یەکگرتووەکان دەربڕی و لە هەمان کاتیشدا هەردووکیان مستەفا بارزانییان ئاگادارکردەوە کە لە هەر کارێکی دراماتیکی وەك راگەیاندنی دەوڵەتی کوردی خۆی بەدوور بگرێت ئەوەك رژێمی عێراق هێرشێکی بەرفراوان دەسپێبکات[٣٨٣] دیارە ئەو هۆشداریەی ئێران و ئوردنیش لەوەوە هاتبوو کە مستەفا بارزانی لەو ساڵەدا گوتبووی: "سەربەخۆیی رادەگەیەنین، ئەگەر وڵاتە یەکگرتووەکان پشتگیریمان بکاو ئەو کارەیان پێ باش بێت، ئەوا دەتوانین جورئەتی بیرکردنەوەمان لەو مەسەلەیە هەبێت، تەنانەت پێشی هەڵسین"[٣٨٤].

هەرچەندە بڕی ئەو یارمەتییەی کە وڵاتە یەکگرتووەکان لە مارتی ١٩٧٣ بۆ بزووتنەوەی رزگاریخوازی کوردستانی تەرخان کرد، بەهۆی داخوازی کوردان بوو لە ئەنجامی تەشەنەکردنی گیروگرفتەکانیان لەگەڵ رژێمی بەعس[٣٨٥]، بەڵام لەگەڵ ئەوەش سەرجەمی ئەو یارمەتییانە بەدرێژایی نێوان ساڵانی ١٩٧٢–١٩٧٥ لە ١٦ ملیۆن دۆلار تێپەڕی نەکرد، زۆربەشی بۆ کڕینی ئەو چەکە سۆڤیەتییانە بوو کە ئیسرائیل لە شەڕی شەش رۆژەی ١٩٦٧ دا لە بەرانبەر سوپای عەرەبی

---

(٣٨٢) بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: Henry Kissinger, Op.Cit. P581-58.

(٣٨٣) Henry Kissinger, Op.Cit. P 585

(٣٨٤) حنا یوسف فریح، مەسەلەی نەتەوەی کورد لە عێراقداو دەست خستنە ناوەوەی بیانی لە ناوچەکەدا، و: نووسینگەی دیمەشقی ی.ن.ك، چ١ ، شام، ١٩٩٩، ل٦.

(٣٨٥) بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: Henry Kissinger, Op.Cit. P581-585

دەستیکەوتبوو. بڕی ئەو یارمەتییەش راستەوخۆ نەدەگەیشتە دەستی کورد، بەڵکو لەڕێگەی ئێرانەوە دەهات، هەر لەبەرئەوەش بەشێوەی پێویست نەدەگەیشت، چونکە بەشێکی لەلایەن دەزگای هەواڵگری ئێرانەوە لووش دەدرا[٣٨٦] هەندێ جاریش چەکی قورس بۆ پێشمەرگەکانی کوردستان هاتووە کە لە شەڕەکاندا کاریگەریی هەبووە بەڵام هێندەی تەقەمەنی لەگەڵدا نەبووە کە پێشمەرگە لە بەکارهێنانیاندا بێخەم بێت[٣٨٧] ئەوەش بۆ ئەوە گەڕاوەتەوە کە کاربەدەستانی وڵاتە یەکگرتووەکان مەبەستیان نەبووە بزووتنەوەی کورد بچێتە ئاستی سەرووی بەرگرییەوە[٣٨٨] لەبەرئەوەی کاربەدەستانی وڵاتە یەکگرتووەکان و ئێران پێیان باش بوو بە مەبەستی لەبار بردنی ژێرخانی ئابووری عێراق شەڕ بەردەوام بێت، تەنانەت بۆ تەنها جارێکیش نەیانهێشت، هێزەکانی پێشمەرگەی کورد هێرشێکی بەرفراوان بۆ سەر پێگەسەربازییەکانی بەعس ئەنجام بدەن، کە ئەگەری سەرکەوتنیشی زۆر بوو[٣٨٩]. کەواتە ئەوان لەپێناوی لاوازکردنی رژێمی عێراق کۆمەکی کوردیان دەکرد، نەك لەپێناوی بەدیهێنانی مافە سیاسییەکانی گەلی کوردستان، چونکە ئەگەر جووڵانەوەی کورد سەرکەوتنی یەکجارەکی بەدەست بهێنابا، ئەوا هیچ دەرفەتێکیان نەدەما، کورد وەك کارتێکی فشار بەکاربهێنن.

وەك لە هەندێ سەرچاوەشدا باسی لێوەکراوە، وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا وێڕای پێوەندییان بە جووڵانەوەی سیاسیی کورد، بەدرێژایی ساڵی

(٣٨٦) جوناثان راندل، س پ، ل٢٠١.

(٣٨٧) دیدار لەگەڵ دکتۆر شەفیق قەزاز، هەولێر، ٢٠٠٣/٥/٨.

(٣٨٨) بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: Henry Kissinger, Op.Cit. P581-585

(٣٨٩) بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: The Pike Report

١٩٧٤ پێوەندیی و گفتوگۆیان لەگەڵ رژێمی بەعسیش هەبووەو تەنانەت دواتر رۆڵیشیان لە رێککەوتننامەی جەزائیردا هەبووە کە ساڵی ١٩٧٥ لەنێوان شای ئێران و سەدام حوسێن مۆرکرا[٣٩٠]

لەگەڵ هەموو ئەوانەشدا دەبێ ئەوە بگوترێ، کە هەرچەندە سەرکردایەتی کورد لەسەرەتاوە بڕوای بە ئێران نەبوو، بەڵام بەرانبەر وڵاتە یەکگرتووەکان هێندە خۆش باوەڕ بوو کە بەهۆی بەڵێنەکانی کاربەدەستانی ئەو وڵاتەوە گەیشتبووە ئەو باوەڕەی پشتی کورد بەرنادەن و رێگا بەئێرانیش نادەن لە پێوەندییەکانییدا "ناپاکیی" لە جووڵانەوەی رزگاریخوازی کوردستان بکات[٣٩١] تەنانەت مستەفا بارزانی لەساڵی ١٩٧٣ لە چاوپێکەوتنێکیدا لەگەڵ (جیم هۆگلاند)ی پەیامنێری (واشنتۆن پۆست)ی ئەمەریکی گوتبووی: "ئێمە بڕوا بە شا ناکەین، بەڵام بڕوا بە ئەمەریکا دەکەین. وڵاتە یەکگرتووەکانیش وڵاتێکی لەوە گەورەترە کە ناپاکیی لەگەڵ گەلێکی بچووکی وەك کورد بکات"[٣٩٢]. تەنانەت بە هۆی ئەو متمانە زۆرەشی بە وڵاتە یەکگرتووەکان، مستەفا بارزانی جەختی دەکردەوە کە لە حالەتی بردنەوەی کێشەی کورد، کوردستان دەکاتە پەنجا و یەکەمین ویلایەتی ئەمریکا. بە هۆی سەرسامبوونیشی بە کیسنجەر، مستەفا بارزانی لە دوو بۆنەی جیاوازدا دوو دیاری بۆ نارد[٣٩٣]. بێگومان ئەو جۆرە بڕوا بوون و تێڕوانینەش بەرانبەر هەر وڵاتێك بێت تەواو هەڵەبووە، لەبەرئەوەی لە

(٣٩٠) بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: پارتی دیموکراتی کوردستان (سەرکردایەتی کاتی)، س پ، ل ٥٧–٥٨.

(٣٩١) دیدار لەگەڵ مەسعود بارزانی، هاوینەهەواری سەری رەش، ٢٢/٦/٢٠٠٣.

(٣٩٢) بڕوانە: جوناثان راندل، س پ، ل٢٠٨.

(٣٩٣) بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: The Pike Report

پێوەنـــدیی سیاســـیدا بەتایبـــەتی لەســـەر ئاســـتی نێودەوڵەتیـــدا هەرلایـــەنێك بەرژەوەندییە تایبەتییـەکانی خـۆی لەبەرچـاو دەگرێـت نـەك هـی بەرانبـەر، بۆیـە دەبوایە هەموو ئەگەرەکان لەبەرچاوبگیرابان. دواتـریش مـستەفا بـارزانی لـەدوای نسکۆی شۆڕشی کوردستان لە مارتی ١٩٧٥ لە بەرانبەر هەمان پـەیامنێردا دانینـا بە هەڵەکەی‌و گوتی: "حوکمەتی ئەمەریکی بەفەرمیی هیچ گەرەنتییـەکی نـەداینێ، کەچـی ئێمـە لـەو بڕوایـەدا بـووین هـەرگیز دەسـتمان لێ بـەرنادا، بـەڵام ئێـستا هەستدەکەین چەند هەڵەبووین"[٣٩٤]

(٣٩٤) بڕوانە: جوناثان راندل، س پ، ل٢٠٨.

## ٥- ئیسرائیل

کاتێك لە ١١ی ئەیلولی ١٩٦١ لە کوردستاندا شۆڕش هەڵگیرسا، ئیسرائیل بایەخی ستراتیژی شۆڕشەکەی بۆ خۆی زانیو لەپێناو خەریك کردنی رژێمی عێراق بە شەڕی کوردەوە تاکو نەپرژێتەسەر ناردنی سوپاکەی بۆ هێڵەکانی رووبەڕووبوونەوە لە شەڕی عەرەب- ئیسرائیل، دەسپێشخەریی کرد بۆ پێوەندیکردن بە سەرکردایەتی شۆڕشی کوردستان و هاوکارییەکی دیاریکراوی خۆیان نیشاندا[٣٩٥].

ئەگەرچی جوولەکە لەدێر زمانەوە لەکوردستاندا هەن[٣٩٦]، لەسالانی چلەکانیشەوە ژمارەیەکیان بەوپەڕی ئاسوودەییەوە لە کوردستانی ژێر چنگی عێراقدا ژیاون بەتایبەتی لە ناوچەکانی ئاکرێ و بادینان و بارزان کە هیچ کاتێك لەلایەن کوردە موسڵمانەکانەوە دەستدرێژییان نەکراوەتە سەر، بەڵکو بەپێچەوانەوە هەمیشە رێزییان لێگیراوەو لەژێر چاودێری مستەفا بارزانیدا بوون و پارێزگاریی لێدەکردن و پێوەندییەکی باشیشی لەگەڵیاندا هەبوو[٣٩٧]، بۆیە

(٣٩٥) بڕوانە: مسعود البارزاني، البارزاني والحركة التحررية الكردية، ج٣، ص٢٧٩-٢٨٠؛ د.سعد ناجي جواد، س پ، ل١٨٥؛ صلاح الخرسان، التيارات السياسي في كردستان العراق، ص١٥٨؛ خيري غرة، كتاب خطير يكشف عن حلف الاقليات (الورقة الكردية)، "الدستور" (مجلة اسبوعية.سياسية ثقافية)، ع(لندن٦٢٥)، ١٩٩٠/٢/١٩، ص١٩.

(٣٩٦) بڕوانە: اريك براور، يهود كردستان، أكمله وأصدره رافائيل پاتای، ت: شاخوان كركوكي و عبدالرزاق بوتاني، مط وزارة التربية، أربيل، ٢٠٠٢، ص ٦٠.

(٣٩٧) گفتوگۆ لەگەڵ دکتۆر مەحمود عوسمان، رۆژنامەی "ئەمڕۆ"، بەشی دووەم، ژ(٢٩)، ٢٠ی ئابی ٢٠٠٣.

دەتوانین ئەو خاڵەش بە فاکتەرێك دابنێین لە بڕوا پێکردنی ئیسرائیل بە کوردو مستەفا بارزانی.

مستەفا بارزانییش لەپێناو بەدەسهێنانی پشگیری و یارمەتی بۆ بەڕێوەبردنی شۆڕشەکەی، هەروەها لەڕوانگەی هەستکردن بە گەورەیی دەسەڵاتی سیاسیی و ئابووری ئیسرائیل و کاریگەریی بەسەر سیاسەتی جیهان بەگشتیو وڵاتە یەککرتووەکان بەتایبەتی، بە دەسپێشخەرییەکەی ئیسرائیل رازی بوو بۆ بەستنی پێوەندیی. ئەوە لەلایەك، لەلایەکی دیکەشەوە هەروەك دکتۆر مەحمود عوسمان دەیگێڕێتەوە: مستەفا بارزانی گوتویەتی: "کێشەی هیچ میللەتێك لە دونیادا ناتوانێ سەربکەوێ ئەگەر یەکێك لە ئەمەریکا یاخود سۆڤیەت پشتگیری نەکەن" هەروەها گوتویەتی: "من ١٢ ساڵ لە سۆڤیەت بووم، بۆم دەرکەوتووە کە لەسەر ئەجیندای سۆڤیەت شتێك نیە ناوی کێشەی کورد بێ، هیچ حیسابی تایبەتی بۆ ناکەن لەبەرئەوە من هەوڵ دەدەم تا ژیانم مابێ لەگەڵ ئەمەریکا بم"[٣٩٨] لە ساڵانی پەنجاکان و شەستەکانیشدا وڵاتە یەککرتووەکان بەهۆی دۆستایەتییان لەگەڵ وڵاتانی عەرەبی و تورکیا، ئامادە نەبوو پێوەندیی لەگەڵ شۆڕشی کوردستان ببەستێت، بەڵام مستەفا بارزانی دەیویست لەڕێگەی ئیسرائیلەوە پێوەندیی لەگەڵ وڵاتە یەککرتووەکانی ئەمەریکا ببەستێت، لەبەرئەوەی سیاسەتی ئیسرائیل لە ناوچەکە لەناو چوارچێوەی ستراتیژییەتی وڵاتە یەککرتووەکاندا بوو. لەسەر ئەو بنەمایە پێوەندیی نێوان سەرکردایەتی کوردو ئیسرائیل لەساڵی ١٩٦٣ دروست بوو، شای ئێرانیش کلیلی پێوەندییەکە بوو بەهۆی ئەوەی رژێمەکەی شارەزایانی ئیسرائیلی دەهێنایە کوردستان تاکو مەشق

(٣٩٨) گفتوگۆ لەگەڵ دکتۆر مەحمود عوسمان، رۆژنامەی ئەمڕۆ، بەشی یەکەم، ژ(٢٨)، سەرەتای ئابی ٢٠٠٣.

و راهێنانی سەربازی بە شۆڕشگێڕانی کورد بکەن. دروستبوونی پێوەندییەکەش لەکاتێکدا بوو کە وڵاتانی عەرەبی پشگیری حوکمەتی عێراقیان دەکردو تەنانەت زۆربەی بزووتنەوە رزگاریخوازە عەرەبییەکانیش پشگیری شۆڕشی کوردستانیان نەدەکرد(٣٩٩). هەڵبەتە ئێران دەیزانی ئیسرائیل دوژمنی گەورەی رژێمە عەرەبییەکانە، بۆیە ئەوەی قۆستەوەو رۆڵی گێڕا لە هێنانی بۆ ناو هاوکێشەی پێوەندییە دەرەکییەکانی شۆڕشی کوردستان.

جگە لە ئێران چەند کەسایەتییەکی کوردیش رۆڵێکی گرنگیان گێڕا لە پێکهێنان و پتەوکردنی ئەو پێوەندییە وەك کامەران بەدرخان و(٤٠٠) عیسمەت شەریف وانلی(*) کە نوێنەری شۆڕشی کوردستان بوو لە ئەورووپا(٤٠١)

بۆ سازدانی یەکەم کۆبوونەوەش، ساڵی ١٩٦٢ برایم ئەحمەدو نوری شاوەیس سەردانی فەرەنسایان کردو لەوێدا لەگەڵ کاربەدەستە ئیسرائیلییەکان گفتوگۆیان کرد(٤٠٢). لە کۆبوونەوەکەدا برایم ئەحمەد داوای یارمەتی دارایی و سەربازی و هی

---

(٣٩٩) گفتوگۆ لەگەڵ دکتۆر مەحمود عوسمان، رۆژنامەی ئەمرۆ، بەشی یەکەم، ژ(٢٨)، سەرەتای ئابی ٢٠٠٣.

(٤٠٠) بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: هـ س، شلومونکدیمون، الموساد في العراق ودول الجوار، انهيار الآمال الاسرائيلية الكردية، ت، بدر عقيلي، ط١، دار الجيل للنشر، عمان، ١٩٩٧، ص٤٣ و ٩٣؛ جوناثان راندل، س پ، ل٢٤٩؛ صلاح الخرسان، التيارات السياسية في كردستان العراق، ص١٥٣.

(*) عیسمەت شەریف وانلی: تێکۆشەرو سیاسەتمەدارو رووناکبیرێکی ناوداری کوردەو لە دایکبووی کوردستانی ژێر دەسەڵاتی سوریایە. ماوەیەکی درێژ نوێنەری شۆڕشی ئەیلول بووە لە ئەورووپا.

(٤٠١) دیدار لەگەڵ حەبیب محەمەد کەریم، هاوینەهەواری شەقڵاوە، ٢٠٠٤/٧/٢٧

(٤٠٢) هـ س.

دیکەشی لێکردن، بەڵام لێپرسراوانی ئیسرائیل گوتیان پارەمان نیە کە پێتان بدەین، لەبەرئەوەی ئیسرائیل وڵاتێکی هەژارە لەگەڵ ئەوەشدا بەڵێنیاندا، یارمەتییە سەربازییەکانیان زیاد بکەن(٤٠٣) ئەوەش ئەوە ناگەیەنێت کە ئیسرائیل یارمەتی دارایی بە شۆڕشی کوردستان نەبەخشیوە، بەڵکو هاوکارییە سەربازییەکانیان زیاتر بووە لە داراییەکانیان، لەو رووەشەوە زۆرجار ئەفسەرو پسپۆری سەربازییان دەنارده کوردستان بۆ مەشق پێکردنی پێشمەرگە (٤٠٤) تەنانەت ئەفسەرێکی ئیسرائیلی خۆی باس لەوە دەکات کە بەشداریکردووە لە دانانی پلانی سەربازی و رێکخستنی هێزی پێشمەرگە (٤٠٥)، لەگەڵ ئەوەشدا ئیسرائیلییەکان بەهیچ شێوەیەك لە کوردستاندا سەرکردایەتی شەڕەکانیان نەکردووە دژی حوکمەتی عێراق(٤٠٦).

لەساڵی ١٩٦٦یشدا ئیسرائیل رۆڵێکی گەورەی گێڕا لە دامەزراندنی دەزگایەکی هەواڵگریی کوردیی بەناوی (دەزگای پاراستن)(٤٠٧) کە بۆ ئەو سەردەمەی کورد دەزگایەکی گرنگ بووە بۆ کۆکردنەوەی زانیاریی هەواڵگریی.

هەروەها جگە لە یارمەتی دارایی و سەربازی، ئیسرائیل یارمەتی تەندروستیو داوو دەرمانیشیان پێشکەشی شۆڕشی کوردستان کرد، لەو رووەشەوە ساڵی ١٩٦٦ نەخۆشخانەیەکی مەیدانییان لە حاجی ئۆمەران دامەزراند کە پزیشکی

(٤٠٣) شلومونکدیمون، س پ. ل١٠٢.

(٤٠٤) دیدار لەگەڵ حەبیب محەمەد کەریم، هاوینەهەواری شەقڵاوە، ٢٠٠٤/٧/٢٧.

(٤٠٥) بڕوانە: Susan Meiselas, Kurdistan in the Shadow of History, Random House, New York, 1997. P263

(٤٠٦) بڕوانە: گفتوگۆ لەگەڵ دکتۆر مەحمود عوسمان، رۆژنامەی ئەمڕۆ، ژ(٢٨)، سەرەتای ئابی ٢٠٠٣.

(٤٠٧) دیدار لەگەڵ حەبیب محەمەد کەریم، هاوینەهەواری شەقڵاوە، ٢٠٠٤/٧/٢٧؛ جوناثان راندل، س پ، ل٢٥٣.

خۆيان و كەل و پەليشيان بۆ دابينكردو هەرخۆيشيان بەڕێوەيان دەبرد، بەمەش كێشەيەكى گەورەى شۆڕشى كوردستانيان كەم كردەوە، چونكە پێش ئەوە لەڕووى تەندروستييەوە تەواو پشت بە ئێران بەسترابوو[٤٠٨]، كەچى ئەوانيش سەرەڕاى خراپى بارى تەندروستى ناوچەكانى ژێر دەسەلاتى شۆڕشى كوردستان، زۆرجار بەتەنگ دابينكردنى ئەو پێداويستييانە نەدەهاتن.

دەبێ ئەوەش بگوترێ كە ئيسرائيل زۆر هەولّى ئەوەيشى داوە بەهۆى ئەو يارمەتييانەو لەرێگەى پێوەندييەكانيدا، سەركردايەتى شۆڕشى كورد بۆ بەرژەوەندييە سياسييەكانى خۆى بەكار بهێنىو شۆڕشەكە بكاتە هێزێكى دژە عەرەب، بەلاّم بەهۆى مامەلّەكردنى وريايانەى كورد لە پێوەندييەكانيدا، هەرگيز ئەوەى بۆ نەدەچووەسەر[٤٠٩] لە كاتێكدا رژێمى عێراقيش هەولّيدا بزووتنەوەى سياسيى كورد لە شەڕى عەرەب– ئيسرائيل تێوەگلێنێت، وەك لەميانى سەردانى شاندێكى حوكمەتى عێراق لە سەرەتاى حوزەيرانى ١٩٦٧ دا بۆ كوردستان، داوا لە مستەفا بارزانى كرا كە هێزى پێشمەرگە بنێرێ بۆ شەڕكردنى ئيسرائيل، بەلاّم رابەرى شۆڕشى كورد داواكەى ئەوانيشى رەتكردەوەو لە هەمان كاتيشدا دلّنياى كردنەوە كە هێزەكانيان هيچ كارێك دژى سوپاى عێراق ئەنجام نادەن[٤١٠]،

(٤٠٨) بۆ زانيارىى زياتر بڕوانە: شلومونكديمون، س پ، ل١٨٣ و ١٨٦–١٨٧، احمد عبدالمجيد، صاعق البارود ((الدعم الاسرائيلي للتمرد في شمال العراق))، دار الحرية للطباعة، بغداد، ١٩٩٠، ص٤١–٤٢.

(٤٠٩) گفتوگۆ لەگەلّ دكتۆر مەحمود عوسمان، رۆژنامەى "ئەمڕۆ"، ژ(٢٨)، سەرەتاى ئابى ٢٠٠٣.

(٤١٠) بۆ زانياريى زياتر بڕوانە: مسعود البارزاني، البارزاني والحركة التحررية الكردية، ج٣، ص١٩٤؛ گفتوگۆ لەگەلّ دكتۆر مەحمود عوسمان، رۆژنامەى "ئەمڕۆ"، ژ(٢٩)، ٢٠ى ئابى ٢٠٠٣؛ شلومونكديمون، س پ، ل١٩٢–١٩٣؛ احمد عبدالمجيد، صاعق البارود،ص٤٤.

هەروەها ئامۆژگاری دەسەڵاتدارانی عەرەبیشی کرد کە لە شەڕی ئیسرائیل خۆیان بپارێزن، لەبەرئەوەی دەیزانی سەرناکەون[٤١١].

هەرچەندە ئەو سەردەمە سەرکردایەتی کورد کەوتبووە نێو هەڵوێستێکی دژوار لەو پێوەندییانەدا، لەبەرئەوەی هەریەکە لەلایەنی عەرەبی و ئیسرائیلی دەیانویست وەکو داردەستێك بەکاریان بهێنن لە دژی ئەویدیکەیان، بەڵام نەکەوتە ژێر کاریگەریی هیچ لایەکیان بۆ چوونە نێو ململانێی نێوانیان.

لە نیسانی ١٩٦٨یشدا مستەفا بارزانی لەسەر داوای حوکمەتی تەلئەبیب گەیشتە ئیسرائیل و زۆر بە گەرمی لەلایەن سەرۆکی وڵات و سەرۆکی حوکمەت و وەزیری بەرگری و وەزیری دەرەوەو سەرۆکی دەزگای هەواڵگریی (مۆساد)و بەرپرسانی دیکەوە پێشوازی کراو بەڵێنی هاوکاریی زیاتری پێدرا[٤١٢]. ئەوەش ئەوە دەردەخات کە هەردوو لایەن تا رادەیەکی زۆر گرنگییان بە پێوەندییەکانیان داوە لەگەڵ یەکترو هەردوولاشیان پێویستی زۆریان بە یەکتر بووە، ئەگینا لەسەر ئەو ئاستە باڵایە کۆنەدەبوونەوە. لەکاتی گفتوگۆکانی ساڵی ١٩٧٠ی نێوان رژێمی بەعس و سەرکردایەتی شۆڕشی کوردستانیشدا، مستەفا بارزانی نامەیەکی بۆ کاربەدەستانی ئیسرائیل ناردو تیایدا وای پێشبینی کردبوو کە رێککەوتنێکی گەورە نایەتەدی و بەرانبەر گفتوگۆکان دڵخۆش نەبوو[٤١٣] ئەوەش دووربینیی و دیپلۆماسییەتی مستەفا بارزانی دەردەخات کە بەهۆی

---

(٤١١) بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: مسعود البارزاني، البارزاني والحركة التحررية الكردية، ج٣، ص١٩٤؛ جەمال نەبەز، کوردستان و شۆڕشەکەی، ل٣٢١–٣٢٢.

(٤١٢) بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: گفتوگۆ لەگەڵ دکتۆر مەحمود عوسمان، رۆژنامەی "ئەمڕۆ"، ژ(٢٩) ٢٠ی ئابی ٢٠٠٣؛ شلومونکدیمون، س پ، ل٤٣ و ٢٠١–٢٠٣؛ Susan Meiselas .Op.Cit. P262

(٤١٣) شلومونکدیمون، س پ، ل٢٤٥.

بێمتمانەيى بەرانبەر حوكمەتى عێراق لەكاتى ئاگربەست و گفتوگۆشدا نەيويستووە دەستبەردارى دۆستانى دەرەوەى بێت كە لەكاتى شەڕدا هاوكاربيان كردووە.

دواى راگەياندنى بەياننامەى ١١ى مارتيش پێوەنديى نێوان جوولانەوەى رزگاريخوازى كوردستان و حوكمەتى ئيسرائيل مايەوە[٤١٤] لەگەڵ ئەوەش لە لێدوانێكدا دەربارەى هەڵوێستى كورد بەرانبەر خەباتى چەكدارانەى فەلەستين، مستەفا بارزانى پشگيرى خۆى راگەياندو دەربارەى چوونە ناوەوەى عێراقيش بۆ نێو هەر يەكێتييەكى عەرەبى روونيكردەوە كەوا گەلى كورد پاڵپشتى هەر يەكێتييەكى عەرەبى دەكات، ئەگەر بەرژەوەندى نەتەوەى كوردى تێدا پارێزراوبێت[٤١٥] بێگومان مستەفا بارزانى دەيزانى هيچ يەكێتييەكى عەرەبى بەرژەوەندى كوردى تێدا نەبووەو نابێت بۆيە بەو شێوەيە هەڵوێستى دەربڕيوەو ويستوويەتى هاوسەنگى رابگرێت لە پێوەندييەكانيدا لەگەڵ ولاتانى عەرەبىو حوكمەتى ئيسرائيل. بەهۆى ئەو هەوڵە پيلانگێڕييەى كە لە ٢٩ى ئەيلولى ١٩٧١ لەلايەن رژێمى عێراقەوە دژى مستەفا بارزانى ئەنجامدرا، پێوەنديى نێوان جولانەوەى سياسيى كوردو كاربەدەستانى ئيسرائيل تەكان و بەرەو پێشچوونى زياترى بەخۆيەوە بينى. ئێوارەى هەمان رۆژيش شاندێكى ئيسرائيل سەردانى مستەفا بارزانييان كرد. لەو روانگەيەشەوە كە رووداوەكە گرژى لەنێوان رژێمى عێراق و سەركردايەتى بزووتنەوەى رزگاريخوازى كوردستان دروست كردبوو، بۆيە حوكمەتى ئيسرائيل رووداوەكەيان پێخۆشبوو[٤١٦]

---

(٤١٤) ديدار لەگەڵ حەبيب محەمەد كەريم، هاوينەهەوارى شەقلاوە، ٢٠٠٤/٧/٢٧.

(٤١٥) بڕوانە: وزارة الاعلام، اعياد السلام، ص ٣٣.

(٤١٦) گفتوگۆ لەگەڵ دكتۆر مەحمود عوسمان، رۆژنامەى "ئەمڕۆ"، ژ(٢٩)، ٢٠ى ئابى ٢٠٠٣.

کۆمەکییەکانی ئیسرائیل بەردەوامبوون، بەپێی ئەو زانیارییە هەواڵگرییانەش کە ئەیلولی ١٩٧٢ لە رۆژنامەی (واشنتۆن پۆست)ی ئەمەریکی بڵاوکرایەوە، مانگانە نێردراوێکی تەلئەبیب لە رێگەی ئێرانەوە دەهاتە کوردستان و بڕێك پارەی وەك یارمەتی بە جووڵانەوەی کورد دەبەخشی[(٤١٧)]

سەرەڕای بەخشینی کۆمەك لەلایەن ئیسرائیلەوە، سەردان و هاتووچۆی نێوان هەردوولاش درێژەی هەبوو و لەو میانەیەدا لە ئەیلولی ١٩٧٣[(*)] مستەفا بارزانی بۆ جاری دووەم سەردانی ئیسرائیلی کردو پێشوازییەکی گەرمی لێکراو لەگەڵ سەرۆکی حوکمەت و وەزیری دەرەوەو وەزیری بەرگری کۆبۆوەو هەر لەوێشدا مستەفا بارزانی جەختی کردەوەو داوای لێکردن کە رۆژێك لە رۆژان وازی لێنەهێنن، لە هەمان کاتیشدا کاربەدەستانی ئەو وڵاتە بڕوایان وابوو کە هەر کاتێك ئەوان پێویستییان بە یارمەتی کورد هەبێت رەتی ناکەنەوە[(٤١٨)]

وەك پێشتر باسمانکرد بەر لە راگەیاندنی بەیاننامەی ١١ی مارتی ١٩٧٠ مستەفا بارزانی بێمتمانە بووە بەرانبەر رژێمی بەعس. دوای راگەیاندنی بەیاننامەکەش بەهۆی ئەنجامدانی چەندین هەوڵی پیلانگێڕیی و شەڕانگێزی لەلایەن بەعس بۆ تێکدانی بارودۆخی ئاشتی، وەك تەقەکردن لە بارەگای پارتی دیموکراتی کوردستان لە پارێزگای موسڵ لە نیسانی ١٩٧٠ و تەقەکردن لە

---

(٤١٧) شلومەنکدیمون، س پ. ل١١٢-١١٣؛ احمد عبدالمجید، الدور السري الاسرائيلي في دعم المتمردين الاكراد ماقبل اتفاقية ١٩٧٥ ومابعدها، الحلقة الاخيرة، "التضامن" (مجلة العرب من المحيط الى الخليج)، ع(٣١٠)، ١٩٨٩/٣/٢٠.

(*) دکتۆر مەحمود عوسمان لە گفتوگۆیدا لەگەڵ رۆژنامەی "ئەمرۆ"، ژ(٢٩)، ٢٠ی ئابی ٢٠٠٣ ئاماژە بەوە دەکات کە سەردانی دووەم جاری مستەفا بارزانی بۆ ئیسرائیل لە ساڵی ١٩٧٢ دابوو.

(٤١٨) شلومونکدیمون، س پ، ل٢٧٤.

ئۆتۆمبیلی ئیدریس بارزانی لە بەغدا لە ڕێکەوتی ١ی کانونی یەکەمی ١٩٧٠ و دووجار هەوڵدان بۆ لەناوبردنی مستەفا بارزانی لە ٢٩ی ئەیلولی ١٩٧١ و ٥ی تەموزی ١٩٧٢ و هەروەها کوشتن و دەسگیرکردن و ڕاگواستنی کوردانو هێرش کردنە سەر چەند ناوچەیەکی کوردستان.. هتد[*]، هیچ ڕێگەیەك لەبەردەم مستەفا بارزانیدا نەمایەوە تەنها ڕووکردنە دەرەوە نەبێت بۆ بەدەستهێنانی پشگیریی و یارمەتی لەپێناوی خۆقایمو ئامادەکردن بۆ بەرگری لە بەرانبەر ئەگەری دەسپێکردنەوەی شەڕ لەگەڵ حوکمەتی عێراقدا، هەرچەندە سەرکردایەتی جووڵانەوەی کورد هەمیشە لەگەڵ ئاشتیدا بوونەو هەرگیز دەسپێشخەریی شەڕیان نەکردووە، چ لەکاتی ئاشتیدا بووبێت یا ئاڵۆزی بارودۆخ، ئەگەر هەلێکی لەباریش هەڵکەوتبێ هەوڵیان نەداوە بیقۆزنەوە بۆ هێرش بردنە سەر دوژمنەکانیان. بۆ نموونە کە ٦ی تشرینی یەکەمی ١٩٧٣ شەڕ لە نێوان عەرەبو ئیسرائیل هەڵگیرساو ڕژێمی عێراقیش بڕیاریدا هێزەکانی بنێرێت بۆ هاوبەشی کردن لە شەڕەکە[٤١٩]، ئەوکاتە هەلێکی لەبار بۆ بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی کوردستان ڕەخسا کە هێرش بکاتە سەر سوپای عێراق لەکاتێکدا نێوانیان زۆر گرژببوو، بەڵام نەك هەر ئەوەی نەکرد، بەڵکو مستەفا بارزانی بڕیاریدا هەموو چالاکییەکانی جوڵانەوەی کورد دژی حوکمەتی بەعس ڕابگرێت[٤٢٠] لەهەمان کاتیشدا ئامادەیی خۆی نیشاندا کە شاندێك بۆ گفتوگۆ بنێرێتە بەغدا، بەڵام ڕژێمی عێراق وەڵامی نەدایەوە[٤٢١].

---

(*) لە تەوەری یەکەم و دووەمی بەشی سێیەمی باسەکەمان بەفراوانی لەو بابەتە دواوین.

(٤١٩) المركز العربي للدراسات الاستراتيجية، دور الجيش العراقي في حرب تشرين ١٩٧٣، ص٤٣.

(٤٢٠) دیدار لەگەل دکتۆر شەفیق قەزاز، هەولێر، ٢٠٠٣/٥/٨.

(٤٢١) کریس کۆچێرا، س پ، ل٤٤٣.

شایانی باسە لەوکاتەدا ئیسرائیل داوای لە سەرکردایەتی کورد کردبوو کە لەرێگەی ئەنجامدانی هەر جۆرە چالاکییەکەوە بێت هەوڵبدەن سوپای عێراق خەریك بکەن، بەڵام سەرکردایەتی کورد هیچ هەنگاوێکی لەو بارەیەوە نەهاویشت[٤٢٢]. ئەو هەڵوێستەش نەبووە هۆی ئەوەی کە پێوەندیی نێوان جووڵانەوەی رزگاریخوازی کوردستان و حوکمەتی ئیسرائیل تێك بچێت، بەڵکو بەپێچەوانەوە پێوەندییەکە تا نسکۆی شۆڕش لە مارتی ١٩٧٥ هەر مایەوە[٤٢٣]، بەڵام هەروەك دکتۆر مەحمود عوسمان دەڵێت: لە مانگی مارتی ١٩٧٥ "ئەگەر بە (مایکرۆسکۆب)یش بەدوای ئێرانی و ئیسرائیلیو ئەمەریکی دا گەڕابای لە کوردستاندا هیچ یەکێکت نەدەدۆزییەوەو دیارنەمان و وونبوون!"[٤٢٤]، بۆیە دەتوانین بڵێین ئیسرائیلیش بەشێوەیەك لە شێوەکان لایەنێکی بەشداربووی ئەو پیلانە بوو کە بە پێی رێککەوتننامەی جەزائیری ساڵی ١٩٧٥ دژی کورد ئەنجامدرا.

---

(٤٢٢) شلومونکدیمون، س پ، ل٢٧٦. دەبێ ئەوەش بگوترێ، راپۆرتی پایك ئاماژەی بەوە داوە، لە تشرینی یەکەمی ١٩٧٣دا مستەفا بارزانی ویستویەتی هێرش بکاتە سەر سوپای عێراق، بەڵام ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا لە رێگەی نامەیەك بەو شێوەیە ئاگاداری کردۆتەوە: ئێمە دووبارەی ناکەینەوەو ئیعتباریش ناکەین ئەو هێرشەی بەنیازن لەسەر داوای حکومەتێکی دیکە ئەنجامی بدەن، بەخێر بۆتان بگەڕێتەوە، لەو رووەشەوە لەگەڵ هاوپەیمانەکەمان (ئێران) هاوڕاین.

(٤٢٣) دیدار لەگەڵ حەبیب محەمەد کەریم، هاوینەهەواری شەقلاوە، ٢٠٠٤/٧/٢٧.

(٤٢٤) گفتوگۆ لەگەڵ دکتۆر مەحمود عوسمان، رۆژنامەی "ئەمرۆ"، ژ(٢٩)، ٢٠ی ئابی ٢٠٠٢.

## تەوەرى يەكەم

# سياسەتى رژێمى بەعس بەرانبەر كوردو ناوچەكانى كوردستان

دەسەڵاتدارانى عێراق لە سەرەتاى دامەزراندنى دەوڵەتى تازە دروستكراوى عێراقەوە، بەپشتبەستن بە پەيڕەوكردنى سياسەتى (پەرتكەو زاڵبە)، لە هەموو سەردەمێكدا هەوڵياندداوە گەلى كوردو جووڵانەوە ئازاديخوازەكەى لە يەكتر دابڕن‌و بەشێوازى جياواز هەريەكەيان لاواز بكەن‌و لەناويان بەرن.

لە قەڵەمدانى كوردو خاكى كوردستانيش وەك بەشێك لە نەتەوەى عەرەب‌و خاكى عەرەبى، هەميشە ئامانجى نەتەوە پەرستانى عەرەب بووە لەعێراقدا. بۆ پێكهێنانى ئەو ئامانجەش لە گرتنەبەرى جۆرەها سياسەتى وەكو بەعەرەبكردن‌و راگواستنى كوردو دواتر جينۆسايدو بە بەعسيكردنيش (لەسەردەمى فەرمانڕەوايى بەعسييەكان)، سڵيان نەكردۆتەوە.

هاتنى عەرەب بۆ كوردستان ئەگەرچى رەگو ريشەيەكى قووڵى مێژوويى هەيەو سەرەتاكەى دەگەڕێتەوە بۆ هاتنى ئيسلام بۆ ناوچەكە[٤٢٥]، بەلام لەگەڵ لكاندنى ويلايەتى موسڵ بە عێراقەوە، دەسەلاتدارانى عێراق لەپێناوى گۆڕينى پێكهاتەى نەتەوەيى دانيشتوانى كوردستان بۆ بەرژەوەندى توێژى فەرمانڕەواى

(٤٢٥) بۆ زانياريى زياتر بڕوانە: شوان عوسمان مستەفا، كوردستان‌و پرۆسەى بەئيسلام كردنى كورد (لێكۆڵينەوەيەكى مێژوويى سياسييە)، چ١، سەنتەرى چاپو پەخشى تەما، سلێمانى، ٢٠٠٢، ل١٤٤–١٤٨؛ غەفور مەخمورى، بەعەرەبكردنى كوردستان، بەعەرەبكردن– مەترسييەكانى– بەرەنگاربوونەوەى، چ١، چاپخانەى دارا، هەولێر، ٢٠٠٢، ل١١–١٣.

عـەرەب، بەشـێوازێکی دیکـە بـە عـەرەبکردنیان دەسـتپێکرد. هـەر لەسـاڵی (١٩٢٥)ەوە، مستەفا عومەری وەزیری ناوخۆی ئەو سەردەمە ژمارەیەکی زۆری لە خێزانە کۆچەرەکانی (سمبس)(*)ی عەرەبی هێنایە دەشتی قەراج(**)و ژمارەیەکی زۆریشی لە خێزانە کۆچەرەکانی (تەی‌و جبور)ی هێنایە مووسڵ‌و دەوروبەری(٤٢٦)

دوای ئەوەش بۆ زەمینە خۆشکردنی هێنانی ژمارەیـەکی دیکـەی عـەرەب لـە هۆزەکانی (عوبێدو جبورو تـەی‌و شـەمەرو لهێـب‌و کـورەوی‌و...هتـد)، بـۆ ناوچـە بەپیتەکانی هەولێرو کەرکووك، لە سەردەمە جیاوازەکانی رژێمی پاشایەتیدا چەند پرۆژەیـەکی ئـاودێری وەکـو پرۆژەکـانی (جـەزیرەو حەویجـەو قەرەتەپـەو کەشکەویل)، بۆ نیشتەجێکردنی ئەو عەرەبانە دامەزرا(٤٢٧)

ئاشـکرایە دەوڵـەتی نـوێی عێـراق قەوارەیەکـە لەسـەر بنـچینەی سـتەم دامەزرێنـدراوە، کـە تیایـدا چـەند گروپێکـی جۆراوجـۆری ئـەتنیکی‌و مەزهـەبی‌و ئـایینی، بێئـەوەی هـیچ رابردوویـەکی پێکـەوەژیانی ئاسـوودەیان بووبێـت، لـەناو

---

(*) سمبس لقێکە لە عەشیرەتی تەی.

(**) دەشتی قەراج: دەشتێکی بەپیت‌و بەرەکەت‌و لەبارە بۆ چاندنی دانەوێڵە، کە دەکەوێتـە خوارووی رۆژئاوای پارێزگای هەولێر.

(٤٢٦) غەفور مەخموری، س پ، ل٢٣.

(٤٢٧) بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: جزا توفيق طالب، اقليم كوردستان العراق "دراسة في الجغرافيـة السياسية"، اطروحة مقدمة الى مجلس كلية العلوم الانسانية كجزء من متطلبات نيل درجـة دكتوراه فلسفة في الجغرافية، جامعة السليمانية، ٢٠٠٤، ص٢٥٠-٢٥٢؛ د.نـوري طالبـاني، منطقة كركوك ومحاولات تغيير واقعها القومي، مط وزارة الثقافـة، اربيـل، (د.ت)، ص٤٠-٤٣، د.مكرم الطالباني، نحو حل صحيح للمسألة القوميـة الكرديـة في العـراق، ص٢٢٦-٢٢٧؛ د.خليل اسماعيل محمـد، مؤشـرات سياسـة التعريـب والـتهجير في اقلـيم كردسـتان العراق، ط٢، مط جامعـة صـلاح الـدين، اربيـل، ٢٠٠٢، ص١٤؛ د.خليـل اسماعيـل محمـد، اتجاهـات الاسـتيطان العربـي في محافظـة نينـوى واثـره علـى التكـوين القـومي للـسكان، "مەتین"، ع(١٢٥)، ٢٠٠٢، ص٩٤.

چوارچێوەیەکی دەستکرددا کۆکراونەتەوەو بەپێی میکانیزمێکی نایەکسانو نابەرانبەر، پێکەوەژیانێکی هاوبەشیان بەسەردا سەپێندراوە. ئەم قەوارەیەش تەنها لەرێگەی بەکارهێنانی زەبری ستەمو داپلۆسینو دیکتاتۆرییەتەوە دەتوانرێت پارێزگاری بکرێت و رابگیرێت[٤٢٨] بۆیە رووخانی رژێمی پاشایەتی عێراقو هاتنە سەرکاری رژێمی کۆماری نەك هەر نەبووە هۆی نەمانو کەمبوونەوەی هەوڵەکانی تواندنەوەو بەکارهێنانی توندوتیژی، لەلایەن دەسەڵاتدارانی بەغداوە دژ بە گەلی کورد، بەڵکو لەسایەی سیستەمی نوێی فەرمانڕەواییدا ئەو هەوڵانە زیاتر بوون.

دەبێ ئەوەش بگوترێت کە قورسایی پەیڕەوکردنی ئەو سیاسەتانەش لەسەرەتاوە خرابووە سەر ناوچە نەوتاوییەکانی کوردستان، بەتایبەتی ناوچەکانی کەرکووك، هۆیەکەشی بوونی بڕێکی زۆری نەوتە لەوێدا. بەپێی ئامارەی ئامارەکانیش دەرکەوتووە کە: "یەدەگی چەسپاوی چاڵە نەوتییەکانی کەرکووك (٧٨–٩٨٪)ی یەدەگی نەوتی هەرێمی کوردستان پێکدەهێنێت، لێکۆڵینەوە نوێیەکانیش ئەوەیان دەرخستووە کە پتر لە نیوەی یەدەگی نەوتی عێراقیش لە کوردستانی عێراقدایە"[٤٢٩]

(عەبدولکەریم قاسم)یش وەك یەکەم سەرۆك کۆماری عێراق لە ماوەی فەرمانڕەوایەتییەکەیدا (١٩٥٨–١٩٦٣) بۆ پەیڕەوکردنی سیاسەتە چەوتەکەی بەرانبەر نەتەوەی کورد، سەرەتا شاری کەرکووکی بە ئامانج گرت. ئەوەبوو لە ١٥ی تەمموزی ١٩٥٩دا چەند یەکەیەکی سەربازی لە بەغداوە هێنایە ئەو شارەو

(٤٢٨) رەفیق سابیر، ئیمپریاتۆریای لم (دەربارەی ئیسلام، خێڵ و ناسیۆنالیزم)، چ١، سوێد، ١٩٨٨، ل٢٠٥.

(٤٢٩) محەمەد سەعید سۆفی، پارێزگای کەرکوك لەناو پاکتاوکردنی رەگەزییدا، چاپخانەی بەرهەم، سلێمانی، ٢٠٠٢، ل١٧.

کۆمەڵێك کاری نارەوایان ئەنجامدا کە تا ئێستاش شوێنەواری نێگەتیڤانەی بەسەر کەرکووك‌و ناوچەکەدا ماوەتەوە[٤٣٠] پاشان دەستیکرد بەڕاگواستنی خەڵکی گوندەکانی دەوروبەری کەرکووك‌و دەشتی قەراج، هێنانی عەرەب بۆ شوێنی ئەوان[٤٣١]. ئەوەش پێچەوانەی بەندی (٩)ی جاڕی گەردوونی مافی مرۆڤە کە ڕێگە دەگرێت لە دەستگیرکردن‌و دەستبەسەرکردن‌و دوورخستنەوەی مرۆڤ بەشێوەیەکی ڕەمەکی[٤٣٢].

هەر لەو سەردەمەدا ئەو ناوچانەی دەکەوێتە نێوان زمار–شەنگال‌و سنووری عێراق– سوریا، بە عەرەبکران‌و خێڵی عەرەبیان بۆ هێنرا[٤٣٣] ئەمانە جگە لە وێرانکردنی دەیان گوندی کوردستان‌و کوشتنی ژمارەیەکی زۆر لە خەڵکی سیڤیل[٤٣٤].

لە ٨ی شوباتی ١٩٦٣شدا، حیزبی بەعس بەهاوکاریی ئەفسەرە ڕنەتەوەییەکانی عەرەب، کودەتایەکیان بەسەر عەبدولکەریم قاسم‌و دارودەستەکەیدا کردو خۆیان دەسەڵاتیان گرتە دەست. لەمێژووی دەوڵەتی

(٤٣٠) بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: د.نوري طالباني، منطقة كركوك ومحاولات تغيير واقعها القومي، ص٥١–٥٥. د.نوري طالباني، خطورة سياسة النظام العراقي في منطقة كركوك على مستقبل كيان العراقي، ( www.9neesan.com/docs/doc74.htm ) ، ٢٠٠٤/٨/٢٥.

(٤٣١) بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: غەفور مەخموری، س پ، ل٢٧.

(٤٣٢) بڕوانە: ئەنستیتۆی کورد لە پاریس، جاڕی گەردوونی مافی مرۆڤ ، فەرەنسا، ١٩٩٢، ل٥٢.

(٤٣٣) ئەمین قادر مینە، ئەمنی ستراتیجیی عێراق و سێکوچکەی بەعسییان: تەرحیل تەعریب تەبعیس، چ٢، لە بڵاوکراوەکانی سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیجیی کوردستان، سلێمانی، ١٩٩٩، ل٢٣٧.

(٤٣٤) بڕوانە: د.مارف عومەر گوڵ، جینۆسایدی گەلی کورد لەبەر ڕۆشنایی یاسای تازەی نێودەوڵەتاندا، چ٢، لەبڵاوکراوەکانی سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیجیی کوردستان، سلێمانی، ٢٠٠٣، ل٢١.

عێراقیشدا هیچ رژێمێك هێندەی بەعس لەناو هاوكێشە سیاسییەكاندا، (كورد)ی بەمەترسی بۆ سەر دەسەڵاتو پاشەڕۆژی عێراق نەزانیوە كە لەسۆنگەی ئاسایشی ناوخۆوە كوردستانی بە یەكەمین و گەورەترین مەترسی زانیوە، بۆیە لەپێناوی بە گژداچوونەوەی ئەو مەترسییە، لە سەردەمی یەكەم و دووەمی دەسەڵاتیدا جەنگێكی بێبڕانەوەی بۆ تەفروتووناكردنی هێزی مرۆیی كورد پیادەكردو بەشێوەیەكی سیستماتیكیش كەوتە دەستنیشانكردن و سنووردارکردنی ژمارەی كورد ئەویش بەسێ ڕێگای جیاواز، یەكەمیان بە عەرەبكردن و دووەمیان راگواستن و سێیەمیشیان قڕكردن بوو[٤٣٥]

گرتنەبەری ئەو سیاسەتەش، هەڵقوڵاوی هزری رەگەزپەرستانەی (ساطع الحصري)و دامەزرێنەرو بیرۆكە دارێژی حیزبی بەعس (میشێل عەفلەق) بوو. عەفلەق بە پێویستی دەزانی بۆ تواندنەوەی ئەو كەمەنەتەوەییانەی لەنێو قەوارەی عەرەبدا دەژین، دوو ڕێگا بگرنەبەر، یەكەمیان بەهێمنی پەیڕەو بكرێت، بەڵام درێژەی پێبدرێت، دووەمیشیان ئەگەر لە بەرانبەر تواندنەوە بەرگرییان لەخۆیان كرد، زەبرو زەنگ بەكاربهێنرێت[٤٣٦]

بەعس لە سەردەمی یەكەمی دەسەڵاتیدا (ساڵی١٩٦٣)، تەنها ٩مانگ لە فەرمانڕەوایەتی عێراقدا مایەوە. لەو ماوەیەشدا بەهۆی بێئەزموونیی و بێتوانایی دارایی و سوپاییەكەی، نەیتوانی درێژە بە سیاسەتی دژە مرۆیی خۆی بداو شۆڕشی رزگاریخوازی كوردستان دامركێنێتەوە. لەگەڵ ئەوەشدا توانی لەو ماوە كەمەدا دانیشتوانی گەلێك ناوچەی كوردستان راگوێزێتو ناوچەكانیان بەعەرەب

(٤٣٥) خەبات عەبدوڵڵا، بنەما تیۆرییەكانی جوگرافیای عەسكەریی كوردستانی باشور، چ١، چاپخانەی تیشك، سلێمانی، ٢٠٠١، ل١٩٣

(٤٣٦) وەرگیراوە لە: عەبدوڵڵا كەریم، رەشە بای ژەهرو ئەنفال، ب٢، ل٨.

بکات، گرنگترینیشیان کەرکووك بوو[٤٣٧]، کە تیایدا هەندێ خێڵی عەرەبی نیشتەجێکران و کرێکارانی کوردیش لە ناوچەکانی کەرکووك بۆ سەر ئیش و کاری دیکە گوێزرانەوە دەرەوەی شار، ناوچەکەش بووە شێوە سەربازگەیەك کە بە سەنگەرو پایگای سەربازی تەنرابوو و ناوی گوندو گەڕەکەکان کرانە عەرەبی و خێڵە عەرەبە کۆچەرەکانیش بە بیانووی بەرەنگاربوونەوەی پێشمەرگەی کورد، پڕچەك کران[٤٣٨].

هەر لەو ماوەیەشدا گوندەکانی قەزای دوبزو ناحیەی سەرگەڕان و قەزای مەخمور (ناحیەی کەندێناوە)، دووچاری هێرش و پەلامارو سیاسەتی بەعەرەبکردنی حوکمەتی بەعس هاتن[٤٣٩]. سەرەڕای ئەنجامدانی چەندین تاوانی جینۆساید لە ناوچەکانی دیکەی کوردستاندا، هەروەك لە ٩ی حوزەیرانی ١٩٦٣ لە سلێمانی ئەنجامیاندا، کە بەدەیان کەسیان لەپشت حامیەی ئەو شارە گوللەبارانکرد[٤٤٠].

---

(٤٣٧) ئەمین قادر مینە، س پ، ل٢٣٨.

(٤٣٨) د.منذر الفضل، حقوق الانسان والتنوع الاثني لسكان كركوك، (www.kurdtimes.com/kt-arab/pages/page.dr03.htm)، ٢٠٠٤/٨/٢٥.

(٤٣٩) بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: ئەمین قادر مینە، س پ، ل٢٣٨–٢٣٩؛ د.مارف عومەر گوڵ، جینۆسایدی گەلی کورد...، ل٢٢؛ محەمەد سەعید سۆفی، پارێزگای کەرکوك لەناو پاکتاوکردنی رەگەزییدا، ل١٠٢و١١٦و١١٨و٢٠٩؛ محەمەد سەعید سۆفی، ناحیەی کەندێناوە چۆن سەرەتا بەشێکی لێکرایە (القدس) و دواتر هەمووی تەعریب کرا؟، "ئەنفال" (گۆڤارێکی لێکۆڵینەوەو دۆکیۆمێنتی یە وەزارەتی مافی مرۆڤ و ئاوارەو ئەنفال دەریدەکات)، ژ(٣)، ساڵی سێیەم، ٢٠٠٢، ل٣٨–٤٠؛ غەفور مەخموری، س پ، ل٢٨–٣٠.

(٤٤٠) بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: د.مارف عومەر گوڵ، جینۆسایدی گەلی کورد...، ل٢١–٢٢، عەبدوڵلا کەریم مەحمود، رەشەبای ژەهرو ئەنفال، ب١، چ١، وەزارەتی رۆشنبیری، سلێمانی، ٢٠٠٢، ل٢٢٨؛ ب٢، ل٦٤٥–٦٤٧، محمود عثمان: الاكراد في العراق، "دراسات

هەر لە ساڵی ١٩٦٣دا دەسەڵاتدارانی بەعس، چەندین تاوانیان دژی کوردە فەیلییەکان ئەنجامدا، بەتایبەتی ئەوەی بەتاوانی گەڕەکی کوردەکان (حي الاكراد) ناسراوە لە بەغدا کە فەیلییەکانی تێدا نیشتەجێبوون، هۆیەکەشی ئەوەبوو لەو سەردەمەدا ئەو گەڕەکە پێگەی چالاکییە نیشتمانییەکانی پارتی دیموکراتی کوردستانو حیزبی شیوعی عێراق بووو ژمارەیەکی زۆری بازرگانی کوردیشی تیادا نیشتەجێ ببوو، کە لەلایەن رژێمی بەعسەوە وەك سەرچاوەیەکی هەڕەشە بۆ سەر دەسەڵاتەکەی سەیر دەکرا[٤٤١].

لە دووەمین سەردەمی دەسەڵاتیشیدا کە لە ١٧و ٣٠تەموزی ١٩٦٨ دەستیپێکرد، حیزبی بەعس بە سوود وەرگرتن لە ئەزموونی سەردەمی یەکەمی، بە گوڕوتینێکی زیاترو بەشێوازێکی دیکەوە هاتەوە ناو گۆڕەپانی ململانێی

کوردیة" (مجلة سنوية تصدر في خمس لغات عن المعهد الكردي–باريس)، ع٤(٨)، السنة (٩)، ١٩٩٣،ص٥٩.

(٤٤١) د. منذر الفضل، الكورد الفيليون وحقوقهم في مستقبل العراق، (www.faylee.info/articles/pages1.htm) ، ٢٠٠٤/٨/٢٥. جێی ئاماژە پێدانیشە، کێشەی فەیلییەکان لە عێراقدا کێشەیەکی کۆنەو سەرەتای نیشتەجێبوونیشیان لە بەغداو دەوروبەری دەگەڕێتەوە بۆ نزیکەی دووسەدە پێش پێکهێنانی دەوڵەتی عێراقی نوێ، بەڵام لەلایەن رژێمە یەك لەدوایەکەکانەوە هەمیشە لەپێبەخشینی رەگەزنامەی عێراقی بێبەشکراون. لە ساڵانی چلەکانیشدا، لە سەردەمی دەسەڵاتی رەشید عالی گەیلانی، بۆ یەکەمین جار فەیلییەکان سووچاری فراوانترین شاڵاوی راگواستن هاتوون، بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: د.خليل اسماعيل محمد، منطقة التخصر الحدودية بين العراق وايران، دراسات في اثر الموقع على التركيب القومي للسكان (د.مط)، اربيل، ١٩٩٧، ص٩٠–٩٩؛ عبدالجليل فيلي، اللور (الكورد) الفيليون في الماضي والحاضر، ط١، مط وزارة التربية، اربيل، ١٩٩٩، ص١٤٤–١٥٣، فابيكان ميسيكا– فرانسواز بريیە، کوردە فەیلییەکان بەشێکی زۆری کوردەکانی عێراق پێکدەهێنن، و: تەلا عەبدوڵڵا رەشید، "کوردستانی نوێ" (رۆژنامەیەکی رۆژانەی یەکێتی نیشتمانی کوردستانە)، ژ(٣٠٤٥)، ٢٠٠٣/٤/٢١.

سیاسیی و چەکداری لە عێراقدا، کە بە ئامانجی گۆڕینێکی قووڵ و بنچینەیی باری نەتەوایەتی ناوچەکانی کوردستان، بەتایبەتی کەرکووک، پلانێکی نوێی داڕشتبوو.

لەسەردەمی دەسەڵاتی عوسمانی و رژێمی پاشایەتی عێراقدا، پۆستی سەرۆکایەتی شارەوانی کەرکووک وەك پۆستێکی گرنگو هەستیار، بەکەسێك دەسپێردرا کە نوێنەرایەتی بەشی هەرەزۆری دانیشتوانەکەی بکات، بۆیە بە پلەی یەکەم بە کوردو هەندێ جاریش بە تورکمان دەسپێردرا، تا ساڵی ١٩٦٨یش هیچ عەرەبێك ئەو پۆستەی پێنەسپێردرا بوو، بەڵام لەو ساڵەدا (مەزهەر تکریتی) وەك یەکەم عەرەب بووە سەرۆکی شارەوانی کەرکووك، لەو کاتەشەوە بەدرێژایی ماوەی دەسەڵاتی بەعسییەکان لە عێراقدا، ئەو پۆستە بۆ عەرەبە بەعسییەکان قۆرخکرابوو[٤٤٢]. ئەمەش بۆ ئەوەبوو هیچ کۆسپێك لەبەردەمیاندا نەبێت بۆ جێبەجێکردنی پرۆسەی بە عەرەبکردن.

لە مانگی حوزەیرانی ١٩٦٩دا، میشێل عەفلەق لە وتەیەکیدا ئەوەی دەربڕی کە "برازی کوردی لە وڵاتانی عەرەبی و عێراقدا لەلایەن کۆلۆنیالیزمەوە بەکاردەهێنرێت... بەدرێژایی چەندین سەدە کوردەکان هاووڵاتی عەرەبی موسڵمان بوون کە هیچ جیاوازییەکیان لەگەڵ عەرەبە موسڵمانەکاندا نەبوو، لەکاتێکدا نیشتمانی عەرەبی بریتی بوو لە دەوڵەتێك یان چەند دەوڵەتێکی عەرەبی ئیسلامی"[٤٤٣]. ئەوەش تێڕوانینێکی رەگەزپەرستانە بوو بەمەبەستی تواندنەوەی کوردو بنکۆڵکردنی جووڵانەوەی رزگاریخوازی کوردستان.

---

(٤٤٢) د. نوري طالباني، منطقة كركوك ومحاولات تغيير واقعها القومي، ص٣٠، محەمەد سەعید سۆفی، پارێزگای کەرکوك لەنێو پاکتاوکردنی رەگەزییدا، ل١٧.

(٤٤٣) بڕوانە: میشیل عفلق، نقطة البداية، ط٣، مط المتوسط، بيروت، ١٩٧٣، ص١٠٦-١٠٧.

له مانگی ئابو ئەیلولیشدا، رژێمی بەعس لە تۆڵەی ئەو شکستانەی کە لەبەرانبەر شۆڕشی کوردستاندا تێیکەوتبوو، تاوانێکی گەورەی جینۆسایدی دەرهەق بە خەڵکی سیڤلیی دەکانو صوریا ئەنجامدا[٤٤٤].

هەر لە مانگی ئەیلولدا، نزیکەی (٢٠٠) خانەوادەی فەیلی بەرەو ئێران راگوێزران[٤٤٥]، بەبیانووی ئەوەی ئەوانە بۆ نانەوەی ئاژاوەو یارمەتیدانی دەزگا هەوالگرییەکانی ئێرانو ئیسرائیلو وڵاتانی رۆژئاوا، رۆڵی(تابووری پێنجەم!) لەناو کۆمەڵگای عێراقدا دەگێڕن[٤٤٦].

له ساڵی ١٩٧٠شدا، دوای راگەیاندنی بەیاننامەی ١١ی مارت، رژێمی بەعس لە پەنای بارودۆخی ئاشتییەوە، سیاسەتەکانی خۆی بەرانبەر گەلی کورد پیادەکرد. گفتوگۆو ئاشتەوایشیان لەگەڵ سەرکردایەتی شۆڕشی کوردستان تەنیا تاکتیک بوو، تا بە ئاسانی ستراتیژییەتی خۆیان بە ئامانج بگەیەنن، کە ئەویش لە ئەنجامدانی پیلانگێڕیی دژی سەرکردایەتی کوردو راگواستنو بە بەعسیکردنی گەلو بە عەرەبکردنی خاکی کوردستان، خۆی دەنواند.

له کاتی ئاهەنگ گێڕانی راگەیاندنی بەیاننامەی ١١ی مارت، رۆژنامەنووسێکی میسریی لە پارێزگاری کەرکووکی پرسی بوو: ئایا سەرژمێریی(*) ئەنجامدەدەن؟ ئەویش لە وەڵامدا گوتبووی: هەتا کاتی ئەو سەرژمێرییە دێت، پێکهاتەی

---

(٤٤٤) بگەڕێوە بۆ بەرایی باسەکەمان.

(٤٤٥) عەبدوڵلا کەریم مەحمود، رەشەبای ژەهرو ئەنفال، ب٢، ل١٣٥.

(٤٤٦) بڕوانە: حیزبی بەعسی عەرەبی سۆسیالیست، راپۆرتی ناوەندیی نۆیەم کۆنگرەی هەرێمانە، ل٦١

(*) بەپێی خاڵی (١٤)ی بەیاننامەی ١١ی مارت، دەبوایە سەرژمێرییەکی گشتی ئەنجام بدرێت بۆ دەستنیشانکردنی سنووری ناوچەی ئۆتۆنۆمی. بڕوانە: پاشکۆی ژ(١).

دیمۆگرافی کوردستان، دەگۆڕێت[٤٤٧] بەو شێوە وەڵامەش مەبەستی روونو ئاشکرای بەعسی دەرخستبوو، کە ئەویش بە ئەنجامگەیاندنی پرۆسەی راگواستنی کورد بوو لەسەرکاروبارو خاکی خۆیانو هێنانی عەرەب بۆ شوێنی ئەوان.

کوردە فەیلییەکانیش، کە کێشەکەیان لە بەیاننامەی ١١ی مارتدا بە هەڵواسراوی مابۆوە[٤٤٨]، لە پێناوی ئاشکراکردنی رازەکانیانو بەرچاوخستنو چارەسەرکردنی کێشەکەیان، رۆژنامەی (التآخي)یان کردبووە مینبەرێك بۆ بڵاوکردنەوەی سکاڵانامەکانیان[٤٤٩] ئەو رۆژنامەیەش لە لاپەڕەکانیدا پارێزگاری لە مافی هاووڵاتیانی فەیلی دەکردو داوای پێدانی رەگەزنامەی بۆ دەکردن. تەنانەت لەڕووی یاساییشەوە، باسی رۆڵی رەگەزنامەی لە نێوان دەوڵەتو تاکەکەسدا دەکرد، بۆ رەوایی داواکارییەکانیشیان، بەڵگەنامەی جاڕی گەردوونیی مافەکانی مرۆڤی، بە نموونە دەهێنایەوە[٤٥٠]

لە ١٦ی تەمموزی ١٩٧٠شدا، (ئەنجوومەنی سەرکردایەتی شۆڕش)ی عێراق، دەستووری کاتیی نوێی دەرکردو جارێکی دیکە عێراقی بە بەشێك لە نەتەوەی عەرەب لە قەڵەمدا[٤٥١] ئەو ماددە دەستوورییەش، هەر لە سەرەتای هاتنە سەر کاری رژێمی کۆماری لە عێراقدا، پرسی ناکۆکی نێوان سەرکردایەتی سیاسیی کوردستانو حوکمەتە یەك لەدوایەکەکان بووە[٤٥٢]

---

(٤٤٧) پارتی دیموکراتی کوردستان (سەرکردایەتی کاتی)، س پ، ل٦٢

(٤٤٨) بگەڕێوە بۆ تەوەری چوارەمی بەشی یەکەمی باسەکەمان.

(٤٤٩) بڕوانە: "التآخي"، ع(٤٥٦)، ١٩٧٠/٦/٧.

(٤٥٠) بڕوانە: "حقوقي"، هل استعصت مشكلة الاكراد الفيليين على الحل، "التآخي"، ع(٤٧٠)، ١٩٧٠/٦/٢٤.

(٤٥١) بڕوانە: "الوقائع العراقية"، ع(١٩٠٠)، ١٩تموز ١٩٧٠.

(٤٥٢) بگەڕێوە بۆ بەرایی باسەکەمان.

چەند مانگێکیش دوای راگەیاندنی بەیاننامەی ١١ی مارت، رژێمی بەعس بەبیانووی جۆراوجۆر، چەندین کرێکاری کوردی کارگە حوکومییەکانی لەسەر کار لابرد. بۆ نموونە بەڕێوەبەری کۆمپانیای رۆنە رووەکییەکان، بەبیانووی نەبوونی رەگەزنامەی عێراقی، بە فەرمانێکی کارگێڕی (٤٠) کرێکاری کوردی لەسەر کار لابرد[٤٥٣]، هەرچەندە بۆ پشتگیرییان، یەکێتی گشتی سەندیکاکانی کرێکاران، یاداشتی ئاراستەی دەزگا پێوەندیدارەکان کرد[٤٥٤]، بەڵام هیچ کاریگەرییەکی بۆ سەر ئەو سیاسەتەی بەعس نەبوو. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە ئەو رژێمە نەك هەر دژی مافە نەتەوایەتییەکانی کورد بوو، بەڵکو تەنانەت دژی ئەوەش بوو کە کرێکارانی ئەو نەتەوەیە لە شاری خۆیاندا کار بۆ پەیداکردنی بژێوی ژیانیان بکەن، بە پێچەوانەی خاڵی (٢)ی بەندی (٢١)ی جاڕی گەردوونیی مافی مرۆڤ ، کە جەخت لەسەر مافی ئازادی کارکردنی تاکەکەس لە وڵاتەکەیدا دەکات[٤٥٥].

بەعس، دەیویست هەرچۆنێك بێت دوای راگەیاندنی بەیاننامەی ١١ی مارت، شاری کەرکوك لە ناوچەی ئۆتۆنۆمی دابڕێت، بۆ ئەوەش دوو رێگای لە بەردەمدا بوو، کە یان دەبوو دەسکاری ئامارە کۆنەکان بکات، یانیش پەلە بکات لە گۆڕینی پێکهاتەی توخمی مرۆیی لەو ناوچەیەدا. لە هیچ کامیشیان سڵی نەدەکردەوە.

بۆ ئەو مەبەستەش، دوای تێپەڕبوونی ماوەیەکی کەم بەسەر راگەیاندنی بەیاننامەی ١١ی مارت، بەعس کەوتەخۆ بۆ بەعەرەبکردنی ئەو شارەو هێنانی عەشایەری عەرەبی خوارووی عێراق. لەسەرەتاشدا نەخشەی گەڕەکێکی نوێیان بۆ کێشان کەهەر زوو جێبەجێیان کردو بەجارێك (٦٠٠) خانوویان لە جێگایەکی

---

(٤٥٣) "التآخي"، ع(٤٩٣)، ١٩٧٠/٧/٢٣.

(٤٥٤) "التآخي"، ع(٤٩٥)، ١٩٧٠/٧/٢٦.

(٤٥٥) بڕوانە: ئەنستیتۆی کورد لە پاریس، س پ، ل٧٧.

ستراتیژی و گرنگدا دروستکردو ناوی (حي الكرامة)یان لێنا، که دهکهوێته باکووری رۆژههڵاتی شاری کهرکووك، سهر رێگهی کهرکووك– سلێمانی. بۆ پاراستنیشی، بهدووری (٣٠٠)مهتر لهو گهڕهکه، ئۆردوگایهکی سهربازییان، بنیاتنا[٤٥٦] ئهوهش وهك ههڕهشهیهك بوو بۆ چاوترساندنی کورد لهو شاره. ههروهها تۆماری ئاماری (١٩٥٧)ی ناسنامهی خهڵکی کهرکووکیان برده بهغداو بهو چهشنهی خۆیان دهیانویست، دهسکارییان کردو گۆڕییان[٤٥٧]. ئهوهش لهلایهکهوه بۆ ئهوهبوو تاوانهکانی خۆیانی پێپهردهپۆش بکهن، لهلایهکی دیکهشهوه لایهنی سیاسیی کورد نهتوانێ بۆ ئهو ئاماره کۆنه بگهڕێتهوهو پشتی پێبهستێت.

ههر لهدرێژهی سیاسهتی راگواستنو دهرکردنی کوردان، لهلایهن رژێمی بهعسهوه، له ماوهی نێوان ساڵانی ١٩٧٠–١٩٧١دا، بههۆی گرژتربوونی پێوهندییهکانی حوکمهتی عێراقو شای ئێرانهوه، نزیکهی (٧٠)ههزار فهیلی ئاوارهی ئێران کران[٤٥٨] بهوپێودانگهی فهیلییهکان لهبهرچهند هۆکارێکی سیاسییو ئایینی و ئابووری، خرابوونه خانهی (ههڕهشهی ئاسایشی ناوخۆ!)[٤٥٩]

ههر لهساڵی ١٩٧١دا له شاری کهرکووك، نهخشهی (حي المثنى)شیان کێشا، که له (٥٠٠)خانوو پێکهاتبوو له کۆتایی ساڵی ١٩٧٢و سهرهتای ١٩٧٣دا

(٤٥٦) ئهمین قادر مینه، س پ. ل٢٤١و ٢٤٥–٢٤٦؛ د.نوري طالباني، منطقة كركوك ومحاولات تغيير واقعها القومي، ص٦٢–٦٣.

(٤٥٧) ئهحمهد بانیخێلانی، س پ، ل٣١.

(٤٥٨) محهمهد سهعید سۆفی، پارێزگای کهرکوك لهناو پاکتاوکردنی رهگهزییدا، ل٩٧.

(٤٥٩) بۆ زانیاریی زیاتر بروانه: نهوشیروان مستهفا ئهمین، پهنجهکان یهکتری ئهشکێنن، ل١١٨؛ د.منذر الفضل، الكورد الفيليون وحقوقهم في مستقبل العراق.

جێبەجێکرا. بارووخانە بەناوبانگەکەی کەرکووکیش تەنها (٣)کیلۆمەتر لەو نشینگەیە دوور بوو[٤٦٠].

هەروەها لە شارۆچکەی خانەقین، کە ساڵی ١٩٧١ خوێندنگای کوردی کرایەوە، رژێمی بەعس کەوتە ئازاردانی قوتابیانی کوردو فشارێکی زۆری خستە سەر کەسوکاریان. لە ئەنجامی ئەو سیاسەتەشدا، زیاتر لە (٤٠٠) قوتابی ناچاربوون خوێندنگا کوردییەکانیان جێبهێڵن‌و خۆیان لە خوێندنگا عەرەبییەکان ناونووس بکەن. هەر لەبواری خوێندندا، بەشێوەیەکی گشتی جیاوازییەکی زۆریان لە نێوان قوتابیانی کوردو عەرەبدا دەکرد، بۆ نموونە لەنێو ئەوانەی بۆ خوێندن رەوانەی دەرەوەی عێراق دەکران، تەنیا ٣-٤٪یان بە رەگەز کوردبوون[٤٦١].

لەساڵی ١٩٧٢شدا، رژێمی بەعس دیسان چەند گەڕەکێکی دیکەی بە عەرەبکراوی لەناو شاری کەرکووک دروستکرد. پاشان کەوتە هاندان‌و پارمەتیدانی چەند دەرەبەگێکی عەرەب، بۆ کڕینی زەوی و زاری جووتیارو موڵکدارانی کورد لە دەوروبەری ئەو شارە. لەهەمان کاتیشدا هانی دەرەبەگەکانی کوردی دەدا کە زەوی و زارەکانیان بفرۆشنە عەرەبەکان. لە ئەنجامی ئەو سیاسەتەشدا، سەدان خێزانی کورد لە ناوچەی داودەو کاکەیی دەربەدەرکران‌و عەرەبیان لەشوێندا نیشتەجێکرد. لەوانەش گوندەکانی (حەشیشە، دڵسی گەورە، دڵسی بچووك، رەبعاوا، کۆمبز، گرد رابیعە، سێکانی، کەراکرە، کەریمیە، سەی محەمەد، عەتشانە، تەل مەغار، ئەرغوون، پەنجا عەلی‌و حەفت تەغار)[٤٦٢].

---

(٤٦٠) ئەمین قادر مینە، س پ، ل٢٤٦.

(٤٦١) ژیرارد چالیاند، س پ، ل٢٩٧.

(٤٦٢) ئەمین قادر مینە، س پ، ل٢٤١.

پەیڕەوکردنی ئەو سیاسەتەی بەعس لە هاندانی عەرەب بۆ زەوی کڕینو هاندانی کورد بۆ زەوی فرۆشتن، لە کاتێکدا بوو کە لە ناوچەکانی کەرکوکو خانەقینو شەنگال، کورد زەوی کڕینی لێقەدەغەکرا بوو تەنانەت ڕێگای ئەوەشی لێگیرابوو کە زەوییەکی نوێی بەناوبێت[٤٦٣]

دەسەڵاتدارانی بەغدا هەر بەوە نەوەستان لە ڕێگەی عەرەبەکانی عێراقەوە، پرۆسەی بە عەرەبکردن لە کوردستاندا ئەنجامبدەن، بەڵکو کەوتنە هاندانی عەرەبی وڵاتانی دیکەی عەرەبی، بۆ ئەوەی بێنە عێراقو بەشێکیان ڕەوانەی کوردستان بکات. بۆ ئەو مەبەستەش لە ٢٠ی شوباتی ١٩٧٢دا، بڕیاری ژمارە(٧٦)یان دەرکرد، کە بەپێی ئەو بڕیارە ڤیزە بۆ هەموو ئەو عەرەبانەی دەهاتنە عێراق، هەڵگیراو بەبێ هیچ مەرجێکیش مافی مانەوەیان پێدەدرا[٤٦٤]

لەپاڵ ئەو سیاسەتە پاکتاوە ڕەگەزییەش، کە دوای ڕاگەیاندنی بەیاننامەی ١١ی مارت، لەلایەن بەعسەوە دەرهەق بە کورد پەیڕەو دەکرا، لەزۆر ناوچەی کوردستاندا، کۆمەڵانی خەڵکیان خستبووە نێو زۆر گرفتی ئابووری ئاڵۆزەوە. بۆ نموونە ساڵی ١٩٧٢ەوە کێشەی بێ نەوتی لە شاری سلێمانیو گەلێك شوێنی دیکەی کوردستاندا، هێندە خەڵکی بێزار کردبوو، وای لە ڕۆژنامەی "برایەتی" کرد کە لە سەروتارێکیدا ئەو کێشەیە بخاتە بەرچاو[٤٦٥] لەکاتێکدا خاکی کوردستان لەڕووی سامانی سروشتییەوە بەتایبەتی نەوت، زۆر

---

(٤٦٣) Nader Entessar, Op.Cit.P75

(٤٦٤) بڕوانە: الجمهورية العراقية، القرارات العامة لمجلس قيادة الثورة (١٩٦٨–١٩٧٧)، المجلد الثاني، ص٦٢١.

(٤٦٥) بڕوانە: ڕۆژنامەی "برایەتی"، ژ(١٣)، ١٩٧٢/١/١٨.

دەوڵەمەنـدە، بـەڵام تـەواوى ئـەو سـامانانە لەلايـەن دەسـەڵاتدارانى بەغـداوە بەكاردەبردرا بێئەوەى پێداويستييەكانى دانيشتوانى پێدابين بكەن.

لەو ياداشتەشدا كە پارتى ديموكراتى كوردسـتان لـە ٢٨ى تـشرينى يەكـەمى ١٩٧٢ بۆ سـەركردايەتى هەرێمايـەتى حيزبـى بەعـسى نـاردبوو، دەردەكـەوێت كـە بەگوێرەى پلانى ساڵانەى ئابوورى دەوڵەت، پشكى پارێزگاكـانى هـەولێرو دهـۆكو سـلێمانى و كـەركووكو موسـڵ، ١٧٪ى كـۆى گـشتى پلانەكـەبووەو لـە باشـترين باريشدا ٢٪ زيادى كردووە. ئەو پشكەش بـە بـەراورد لەگـەڵ پـشكى پارێزگاكـانى ديكەى عێراق، زۆر كەمتر بوو، لەبەرئەوەى رێژەى دانيشتوانى ئەو پێنج پارێزگايە ٢٥٪ى تێكڕاى دانيشتوانى عێراقى پێكدەهێنا[٤٦٦].

بەعس هەر بـەوە نەوەسـتا لـەژێر دەمـامكى ئاشـتى و لـە رێگـەى سياسـەتى راگواستنو بە عەرەبكردنەوە، سـتراتيژييەتى خـۆى بەرانبـەر كـورد پيـادە بكـات، بەڵكو لە كۆتاييەكانى ساڵى ١٩٧٢ و سەرەتاى ١٩٧٣ بە تـەواوى ئـەو دەمامكـەى لەڕووى خۆى هـەڵماڵى و لەڕێگـەى تۆپبـاران كـردنو شـاڵاوى سـەربازييەوە قينـى رەگەزپەرسـتانەى خـۆى بەرانبـەر خـەڵكى سـيڤيلى هەنـدێ ناوچـەى كوردسـتان هەڵڕشت بەتايبەتى لـە ناوچـەى شـەنگال، لـە ئاكاميـشدا وێـڕاى ئـەوەى زيـانێكى گيـانى ومـاڵى زۆر بـەر دانيـشتوانى ئـەم ناوچـانە كـەوت، بـە هـەزاران كـەس بـۆ ناوچەكانى ديكەى كوردسـتان ئـاوارەو دەربـەدەر بـوون[٤٦٧] جێـى ئاماژەپێدانـە هەروەك لە بروسكەيەكى مەكتەبى سياسيى (پ.د.ك) كە ٢٦ى نيسانى ١٩٧٣ بـۆ لايەن و دەزگا پێوەنديدارەكانى ناردووە، دەردەكەوێت كە رژێمى بـەعس لـە دواى

---

(٤٦٦) منشورات دار التآخي، في سبيل السلم والوحدة الوطنية...، ص١٦٤.

(٤٦٧) ژيرارد چاليان‌د، س پ، ل٢٩١–٢٩٢؛ "دەنگوباسى كوردستان"، ژ(٧)، ئاب ١٩٧٣.

ڕاگەیاندنی ١١ی مارتەوە ژمارەیەکی زۆری لە گوندەکانی شەنگال تۆپبارانکردو سووتاند[٤٦٨]

لە ساڵی ١٩٧٣ شدا بە هەزاران کەس لە خەڵکی ناوچەکانی کەرکوکو خانەقینو شێخانو ئاکرێ، لە ئەنجامی سیاسەتی بەعەرەبکردن، ئاوارەی ناوچەکانی دیکەی کوردستان بوون[٤٦٩]

پرۆسەی بە عەرەبکردن لە کۆمپانیاو کارگە دەوڵەتییەکانیشدا بەردەوام بوو، بۆ نموونە لەو ماوەیەدا ژمارەیەکی زۆری کرێکارانی کۆمپانیای نەوتی کەرکووك لە کارەکانیان دەرکرانو بەسەدان کەسی عەرەبی بەعسی لەدەرەوەی کەرکووك هێنرانو لەو کۆمپانیایە دامەزرێندران[٤٧٠] هەر لە کەرکووکدا، لە کارگەی کۆکا کۆلا (پیشەسازی باکوور) (٢٤) عەرەبی بەعسی دامەزرێندرانو لە مەسڵەحەی پاسەکانی گواستنەوەشدا (٢٢) عەرەب دامەزرێندران[٤٧١] کارگەی جگەرەی هەولێریش، کە ساڵی ١٩٧٣ تازە خەریك بوو بکەوێتە کار، ڕژێمی بەعس مووچەخۆرو کرێکاری عەرەبی تێدا دامەزراند، لەکاتێکدا بە هەزاران کەس لە خەڵکی ناوچەی هەولێر بێکاربوونو لە بارودۆخێکی ئابووری ناڵەباردا، دەژیان[٤٧٢]

---

(٤٦٨) بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: پاشکۆی ژ(٣).

(٤٦٩) بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: ژێرارد چالیاند، س پ، ل٢٩٢.

(٤٧٠) بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: ئەمین قادر مینە، س پ، ل٢٤٢؛ "دەنگوباسی کوردستان"، ژ(١٧)، ئاب ١٩٧٣.

(٤٧١) بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: "دەنگوباسی کوردستان"، ژ(١٥)، حوزەیران ١٩٧٣.

(٤٧٢) بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: "دەنگوباسی کوردستان"، ژ(١٧)، ئاب ١٩٧٣.

کاتێکیش سەبارەت بەڕاستیی دەرکردنی کرێکارە کوردەکانی کۆمپانیای نەوتی کەرکووک، لە شوباتی ١٩٧٤ لە بولگاریادا، پرسیارێکیان ئاڕاستەی بەرپرسێکی بالای بەعس کرد، بەرپرسەکە زۆر بەڕاشکاوانە وەلامی دایەوەو گوتی: "ئێمە لەبەر نەوتی کەرکووک ئامادەین نەك تەنیا کرێکارە کوردەکانی کۆمپانیای نەوتی کەرکووك، بەڵکو هەموو کوردی کەرکووك دەرکەین" (٤٧٣)

لەوانەی باسکران، ئەوەمان بۆ روون دەبێتەوە، کە سیاسەتی رژێمی بەعس بەرانبەر کوردو ناوچەکانی کوردستان سیاسەتێکی رەگەزپەرستانەی دوور لە هەموو بەهایەکی مرۆیی بووە. هەوڵی گۆڕینی مۆرکی ناوچەو شارەکانی کوردستان ناوەرۆکی راستەقینەی هەموو نەخشەو پلانەکانیان بووە.

(٤٧٣) بڕوانە: د.ئازاد نەقشبەندی، کاریگەری نەوتی کەرکووك لەسەر راگوێزانی کورد، "سەنتەری برایەتی" (گۆڤارێکی زانستی وەرزییە)، ژ(٢٠)، هاوینی ٢٠٠١، ل٢٩.

## تەوەری دووەم:

# سیاسەتی رژێمی بەعس بەرانبەر پارتی دیموکراتی کوردستان

بەعسییەکان لە بەرانبەر نەیارانیان سیاسەتێکیان پەیڕەو دەکرد، کە هەرکاتێك نەیانتوانیبا ئەو هێزە نەیارە لە رێگەی زەبرو زەنگەوە لەناوبەرن، ئەوا هەوڵیان دەدا بە بەکارهێنانی شێوازی دیکە کۆنترۆڵی بکەن. لە بەرانبەر شۆڕشی کوردستانیشدا هەروایان کرد دوای ئەوەی هەموو توانای سەربازی خۆیان تەرخانکرد بۆ سەرکوتکردنی، بەلام بەهۆی شکستەکانیان بێئومێد بوونو هەوڵیاندا لەرێگەی خوولقاندنی بارودۆخی ئاگربەستو ئاشتییەوە، شۆڕشەکە لەناوبەرنو مەرامەکانیان بهێننەدی.

مستەفا بارزانییش ئەو راستییەی دەزانی کە بەعس دەیەوێ لەژێر پەردەی ئاشتییەوە شەڕی کورد بکات، هەر بۆیە شەوی ١٠/١١ی مارتی ١٩٧٠ کە گفتوگۆکانیان لەگەڵ رژێمی بەعس بە ئەنجام گەیشت، لە کۆبوونەوەیەکی تایبەتیدا لەگەڵ سەرکردایەتی پارتی دیموکراتی کوردستان گوتبووی: "تائێستا ئێمە شەڕێکی ئاشکرامان دەکرد لەگەڵ رژێم، فڕۆکەیان، تۆپخانەیان، تانکەکانیان هەمووی دیاربوو لەبەرچاو بوو، لەمەودوا شەڕێکی سەختترمان لەپێشە، بەلام نایبینینو گوێشمان لێی نابێ، نەفڕۆکەیان دەبینین، نەتانکەکانیان، نەتۆپخانەیان، بەلام شەڕی ئێستایان زۆر کاریگەرترو خراپتر دەبێت، لەبەرئەوە دەبێ زۆر ووریابینو هەرگیز ئەوانە جێگەی بڕوانین"[(٤٧٤)].

---

(٤٧٤) دیدار لەگەڵ مەسعود بارزانی، هاوینەهەواری سەری رەش، ٢٠٠٣/٦/٢٢.

سەرەڕای بڕوانەبوونی بە بەعسییەکان، مستەفا بارزانی هەستی بەوەش کردبوو کە مامەڵە کردن لەگەڵ بارودۆخی نوێی ئەوکاتە، کارێکی ئاسان نیە، بۆیە پێی وابوو: "زۆر ئاسانترە بۆ سەرکردەیەك بتوانێ سەرکردایەتی میللەتێك بکات لەکاتی شەڕدا تاوەکو لەکاتی ئاشتیدا. هەروەها زۆر ئاسانترە سەرکەوتن لە شەڕێکدا بەدەست بێ تاوەکو لە پەرەسەندنێکدا"[٤٧٥] ئەو قسانەی مستەفا بارزانییش ئەوە دەگەیەنێ، کە هیچ کاتێك بڕوای بەداگیرکەرانی نەتەوەکەی نەبووە، لەبەرئەوەی دەیزانی کە پرسی ئاشتی لای ئەوان تاکتیکەو ستراتیژەکەیان شتێکی دیکەیە.

هەر بەهۆی ئەو دووربینیو بێبڕواییەشی بوو بەرانبەر بەعسییەکان، مستەفا بارزانی بۆ تاکە جارێکیش ناوچەکەی خۆی جێنەهێشتو نەڕۆیشتە بەغداو شارەکانی دیکەی عێراق بۆ گفتوگۆکردن لەگەڵ فەرمانڕەوایانی بەعس چ لە ماوەی گفتوگۆکاندا یاخود دوای راگەیاندنی بەیاننامەی ١١ی مارت، بەڵکو هەر نوێنەرانی ئەوان دەهاتن بۆ لای ئەوو بارەگای سەرکردایەتی شۆڕشی کوردستان[٤٧٦] ئەوەش لەپاڵ بێبڕواییەکەی ئەوە دەگەیەنێ کە مستەفا بارزانی هەرگیز خۆیو بزووتنەوەی رزگاریخوازی کوردی بە کەمتر نەزانیوە لە دوژمنانیو بەسەریدا سەپاندوون کە بە چاوێکی گەورە سەیری بکەن.

زۆری نەبرد ئەوەی مستەفا بارزانی پێشبینی دەکرد روویدا، راستەوخۆ دوای راگەیاندنی بەیاننامەی ١١ی مارت، چەندین کاری تێکدەرانە ئەنجامدرا. لەوانەش هاویشتنی نارنجۆکێك بوو بۆ قوتابخانەیەکی کچان لە سلێمانی رۆژی ١٤ی مارتی ١٩٧٠، کە مەسعود بارزانی پێی وایە ئەو کارە لەلایەن چەند کەسێکی سەر بە

---

(٤٧٥) د. بورهان یاسین، س پ، ل١١٤–١١٥.

(٤٧٦) ئەحمەد بانیخێلانی، س پ، ل٣٠٩.

(نەوشیروان مستەفا ئەمین)ەوە ئەنجامدراوە، هەربۆیەش ئەوکاتە رایکرد بۆ نەمسا[٤٧٧]. کەچی نەوشیروان مستەفا ئەمین دەڵێت: ئەو کارە بەعسییەکان بۆ لەکەدارکردنی ئێمە (واتە باڵی برایم ئەحمەد– جەلال تاڵەبانی/ "م.س") ئەنجامیاندا. دەربارەی رۆیشتنیشی بۆ دەرەوەی وڵات، نەوشیروان دەڵێت: هەرچەندە دوای ئەو رووداوە ماوەیەك لە کوردستان ماومەتەوەو ماوەیەکیش لەو ناوچانەی بارەگای سەرکردایەتی مستەفا بارزانی لێبوو ژیانم بردۆتە سەر، جارێکیش لەگەڵ هەڤاڵانم بەسەردان چوومەتە لای ئیدریس بارزانی، بەڵام دواجار بڕیارمدا بۆ تەواوکردنی خوێندن بچمە دەرەوەی وڵات[٤٧٨]. تا ئێستاش لەلایەن هیچ سەرچاوەیەکی بێلایەنەوە زانیاریی دەربارەی ئەنجامدەرانی ئەو تاوانە بڵاونەکراوەتەوە.

لە ١٢ی نیسانی ١٩٧٠شدا چەند کرێگرتەیەکی کورد بە هاندانی ئەفسەرە هەواڵگرییەکانی بەعس، دەستدرێژییان کردە سەر بارەگای لقی ١ی پارتی دیموکراتی کوردستان لە موسڵ کە بووە هۆی کوژرانی پێشمەرگەیەك و برینداربوونی دووانی دیکە[٤٧٩] هەرچەندە (ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش)ی عێراق لەدانیشتنی ٢٩ی نیساندا، بڕیاری لەسەر پێکهێنانی لیژنەیەکی دادگاییکردن دا، بۆ لێکۆڵینەوە لەو رووداوە[٤٨٠]، بەڵام لەراستییدا دژی دەستدرێژکاران هیچ کارێکیان نەکرد.[٤٨١]

---

(٤٧٧) دیدار لەگەڵ مەسعود بارزانی، هاوینەهەواری سەری رەش، ٢٠٠٣/٦/٢٢.

(٤٧٨) دیدار لە گەڵ نەوشیروان مستەفا ئەمین، سلێمانی، ٢٠٠٢/١١/٥. بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: نەوشیروان مستەفا ئەمین، پەنجەکان یەکتری ئەشکێنن، ل١٠٤–١٢٦.

(٤٧٩) مسعود البارزاني، البارزاني والحركة التحررية الكردية،ج٣، ص٢٤٩.

(٤٨٠) بڕوانە: "الوقائع العراقية"، ع(١٨٧٤)، ١٩٧٠/٥/٢.

(٤٨١) مسعود البارزاني، البارزاني والحركة التحررية الكردية، ج٣، ص٢٤٩.

ئەو کردەوانەش دەسپێکی هەوڵە پیلانگێڕییەکانی فەرمانڕەوایانی بەغدا بوو دژی بزووتنەوەی رزگاریخوازی کوردستان کە لەژێر پەردەی ئاشتییەوە ئەنجامیان دەدا. لەوەش زیاتر نەیانتوانی چیدیکە درێژە بە دیپلۆماسییەتی خۆیان بدەن بۆ شاردنەوەی نیازە خراپەکانیان بەرانبەر بە سەرکردایەتی جووڵانەوەی کورد. ئەوەبوو هەر لە مانگی نیسانی ١٩٧٠دا لەزاری ئەندامێکی سەرکردایەتی هەرێمی بەعسەوە ئاشکرایان کرد کە دەیانەوێ بەهۆی بەیاننامەی ١١ی مارتەوە مستەفا بارزانی بێهێزبکەن[٤٨٢].

جێی ئاماژە پێدانە، رژێمی عێراق هەر بە مەبەستی لاوازکردنی جووڵانەوەی رزگاریخوازی کورد دەیویست درزو کەلێن لەنێوان سەرکردایەتی ئەو جووڵانەوەیەو جەماوەر دروست بکات. ئاشکرابوونی ئەو نیازەش هەمووی دوو هەفتە بەسەر راگەیاندنی بەیاننامەی ١١ی مارت تێنەپەڕیبوو، کە لەزاری گەورە بەرپرسێکیانەوە رایانگەیاند، رەوشی ئاشتی توانای کەنارگیرکردنی مستەفا بارزانی لە جەماوەر بەرجەستە دەکات[٤٨٣] ئەو هەڵوێستەی بەعسیش لەوەوە سەرچاوەی گرتبوو، کە ترسێکی گەورەی لەو پشتگیرییە جەماوەرییەی شۆڕشی کورد هەیبوو، پەیداکردبوو. تەنانەت جەماوەری عەرەبییش لە عێراقدا چاویان بڕیبووە رابەرایەتی بزووتنەوەی ئازادیخوازی کوردستان بۆ سووککردنو لابردنی دەسەڵاتی رەهای بەعس لەسەریان. هەر ئەو ترسەش بوو وایکرد فەرمانڕەوایانی بەغدا لە ئاهەنگەکانی یەکی ئایاری ١٩٧٠دا، بە بۆنەی جەژنی کرێکارانی جیهانەوە، رێگە بە نوێنەری پارتی دیموکراتی کوردستان نەدەن وتار بخوێنێتەوە

---

(٤٨٢) پارتی دیموکراتی کوردستان (سەرکردایەتی کاتی)، س پ، ل٦١.

(٤٨٣) بڕوانە: منشورات دار التآخي، في سبيل السلم والوحدة الوطنية في سبيل تطبيق اتفاقية آذار، ط٢، مط التآخي، بغداد، ١٩٧٣، ص٧٣.

كه ئەوەش دەستپێكى هەوڵەكانيان بوو بۆ سنووردانانى پشتگيرى جەماوەرى لە (پ.د.ك)[٤٨٤].

لەميانى ئەو سەردانانەشدا كە سەركردايەتى (پ.د.ك) دواى بەياننامەى ١١ى مارت بۆ شارەكانى كوردستان بڕيارى لەسەردابوون[*]، لە ٢ى حوزەيراندا مەسعود بارزانى لەناو جەماوەرێكى بەرفراواندا لە شارى كەركووك، جەختى لەسەر كوردستانيبوونى ئەو شارە كردەوە[٤٨٥]، دواى ئەوە لە ٨ى هەمان مانگدا شاندێكى دەسەڵاتدارانى عێراق كە پێكهاتبوو لە (سەدام حسێن)ى جێگرى سەرۆكى (ئەنجومەنى سەركردايەتى شۆڕش) عێراق و چەند وەزيرێك بە ياوەرى هەندێ لە ئەندامانى لێژنەى ئاشتى[**] و سەركردايەتى (پ.د.ك)، بە مەبەستى

---

(٤٨٤) پارتى ديموكراتى كوردستان (سەركردايەتى كاتى)، س پ، ل٦٢

(*) ئەو سەردانانە بۆ شارەكانى كوردستان، لەسەر پێشنيارى محەمەد عەزيز بوو، تاكو لەنزيكەوە لە بارودۆخى گشتى جەماوەر بگەن‌و سياسەتى گشتى پارتەكەشيان بۆ جەماوەرى كوردستان روون‌و ئاشكرا بكەن. ديدار لەگەڵ محەمەد عەزيز، هەولێر، ٢٠٠٤/٩/٣. محەمەد عەزيز: ساڵى ١٩٣٢ لە شارى سلێمانى لەدايك بووە، لە سەرەتاى شۆڕشى ئەيلولەوە پێشمەرگەبووەو ماوەيەك بەرپرسى كارگێرى ناوچەى پشدەر بووە، پاشان بۆتە بەرپرسى كارگێرى لە مەكتەبى تەنفيزى‌و مەكتەبى سياسيى لەپاڵ هەندێ ئيش‌و كارى ديكەى حيزبيى، وەك لێپرسراوى لێژنەى تايبەتى پاراستن. لە ساڵى ١٩٧٣يش تا نسكۆى شۆڕش بەرپرسى نووسينگەى بارەگاى مستەفا بارزانى بووە. ديدار لەگەڵ محەمەد عەزيز، هەولێر، ٢٠٠٤/٩/٣.

(٤٨٥) بۆ زانياريى زياتر بڕوانە: مسعود البارزاني، البارزاني والحركة التحررية الكردية، ج٣، ص٢٥٠–٢٥١.

(**) لێژنەى ئاشتى: لێژنەيەكى هاوبەشى نێوان رژێمى بەعس‌و بزووتنەوەى رزگاريخوازى كوردستان بوو، كە دواى راگەياندنى بەياننامەى ١١ى مارت بە مەبەستى جێبەجێكردنى خاڵەكانى بەياننامەكە لەنێوانياندا پێكهێندرابوو. ئەندامانى بەعس پێكهاتبوو لە: مورتەزا ئەلحەديسى (سەرۆكى لێژنە)، سەعدون غێدان، خاليد عەبدولحەليم، شوكرى

ئاڵوگۆڕی بیروبۆچوونیان لەپێناو وەرگرتنـی ڕێکاری پێویـست بـۆ جێبـەجێکردنی بەیاننامـەی ١١ی مـارت، ڕوویـان کردبـووە حـاجی ئۆمـەران بـۆ دیـدەنی مـستەفا بارزانی[٤٨٦]، لەوێدا سەدام حسێن لۆمەی ئەو هەڵوێستەی مەسعود بارزانی کردبوو لەمەڕ شاری کەرکوكو داواشی کردبوو کە لەوجۆرە بۆنانـەدا بەرژەوەنـدی بـاڵای عێراق! لەبەرچاو بگیرێ[٤٨٧].

پـارتی دیمـوکراتی کوردسـتانیش بـەهۆی ئـەو هەلومەرجـە نوێیـەی دوای بەیاننامەی ١١ی مارت هاتبووە کایەوە، پاش تێپەڕبوونی نزیکـەی ٤ سـاڵ بەسـەر کۆنگرەی حەوتەمیو تێپەڕبوونی نزیکەی ٤مـانگ بەسـەر ڕاگەیانـدنی بەیاننامـەی ١١ی مـارت، لـە ١ی تـەمموزی سـاڵی ١٩٧٠دا هەشـتەمین کـۆنگرەی خـۆی بـە ئامـادەبوونی ٤٨٨ ئەنـدام گرێـدا، سـەرەڕای بەشـداربوونی هەنـدێ میـوان لـە دانیشتنی کردنەوەی کۆنگرەدا، لەوانە نوێنەرانی حیزبی بەعسو حیزبـی شـیوعی عێـراقو حیزبـی نیـشتمانی دیموکراسـیو بزووتنـەوەی سۆشیالیـستی عـەرەبیو بەرەی ڕزگاریخوازی نیـشتمانیی فەڵەسـتینو حیزبـە کوردسـتانییەکانی دۆسـتانی (پ.د.ك)و نوێنەرانی کورد لە لوبنانو کۆمەڵەی خوێنـدکارانی کـورد لـە ئـەورووپاو هەروەها کامەران بەدرخانو چەندین کەسـایەتی دیموکراسـیخوازو سـەربەخۆ[٤٨٨]

---

ئەلحەدیـسی، ئیـسماعیل تایـە ئەلنـەعێمی. ئەنـدامانی بزووتنـەوەی ڕزگـاریخوازی کوردستانیش بریتی بوون لە: محەمەد مەحمود عەبدولرەحمان (سامی)، ساڵح یوسـفی، نووری شاوەیس، نافیز جـەلال. بڕوانـە: مـسعود البـارزاني، البـارزاني والحركـة التحرريـة الكردية، ج٣، ص٢٤٨.

(٤٨٦) "التآخي"، ع(٤٥٧)، ١٩٧٠/٦/٨.

(٤٨٧) مسعود البارزاني، البارزاني والحركة التحررية الكردية، ج٣، ص٢٥١.

(٤٨٨) بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: حبيب محمد كريم، تـأريخ الحـزب الـديمقراطي الكوردسـتاني– العـراق. ص١١١و١١٦–١١٧؛ محەمـەد مـەلا قـادر، خەباتنامـە کورتـە مێـژووی پـارتی و

جێی ئاماژە پێدانە کامەران بەدرخان لە رێگای بەغداوە بۆ بەشدارییکردن لە رێوڕەسمی کردنەوەی کۆنگرەکە هاتبووە کوردستان، بەڵام لە بەغدا بەعس وەك سەرۆك وڵاتێك بە تەپڵ و مۆسیقای سوپاییەوە پێشوازی لێکرد، کە ئەوەشیان بۆ ئەوەبوو کامەران بەدرخان بکەنە رکابەرێکی مستەفا بارزانی، کە بەو ئومێدەشیان نەگەیشتن، ناوبراو بۆ ئەوەی بەعس نەیکوژێت، لەرێگای ئێرانەوە گەڕایەوە فەرەنسا[٤٨٩] لە رێوڕەسمی کردنەوەی کۆنگرەکەشدا، شاندەکەی حیزبی بەعس کە بەسەرۆکایەتی محەمەد سلێمان (ئەندامی سەرکردایەتی نەتەوەیی)و بە ئەندامێتی هەریەك لە (کەمال فاخوری و سەمیر ئەلنەجم و سەلاح سالّح) ئامادەببوو[٤٩٠]، لەوێدا سەرۆکی شاندەکە بەناوی حیزبەکەیەوە وتارێکی خوێندبۆوە[٤٩١]، بەڵام دواتر لەبەرئەوەی ناوەڕۆکی وتارەکەی شاندی حیزبی شیوعی عێراقیان بە سووکایەتی پێکردنی خۆیان زانیبوو، هەوڵیاندابوو هۆڵی کۆنگرەکە بەجێبهێڵن[*] لەبەرئەوەی هەرگیز نەیاندەویست هیچ لایەنێك پێچەوانەی سیاسەتی ئەوان بیروڕای خۆی دەربڕێت یاخود رەخنە لە سیاسەتەکانیان بگرێت.

سەرکردایەتی جووڵانەوەی رزگاریخوازی کوردستان هەر لەسەرەتاوە لەوە گەیشتبوون کە بەعس هەرکاتێك هەلی بۆ بڕەخسێتەوە، لە بەڵێنەکانی پاشگەز

---

کەلتوری بارزانی، چ٢، چاپخانەی خەبات – دهۆك، ٢٠٠٠،ل٧٠-٧٢؛ "برایەتی" (گۆڤارێکی سیاسیی گشتییە)، ژ(٣)، ساڵی ١، خ٣، سەرەتای ئابی ١٩٧٠، ل٤-٢٠.

(٤٨٩) بڕوانە: جەمال نەبەز، رۆژانی ئاوارەییم لە سویسرە، ل٧٤.

(٤٩٠) "التآخي"، ع(٤٧٦)، ١ تموز ١٩٧٠.

(٤٩١) دەربارەی وتارەکەی بەعس بڕوانە: "التآخي"، ع(٤٧٧)، ٢ تموز ١٩٧٠.

(*) بۆ زانیاریی زیاتر دەربارەی ئەو بابەتە بگەڕێوە بۆ تەوەری سێیەمی بەشی دووەمی باسەکەمان.

دەبێتەوەو شەڕ دژی گەلی كوردو جوولانـەوە رزگاریخوازەكـەی بـەرپا دەكاتـەوە، بۆیـە سـەرەڕای رێككەوتنیـشیان لەگـەڵ ئـەو حوكمەتـە، وەكـو ئامادەباشـییەك بەرانبـەر نیازەكانیـان، هێـزی پێـشمەرگەی كوردسـتانیان بـە تـەواوی هەڵنەوەشاندبۆوە[٤٩٢]، بـەڵكو بـەپێی یـەكێك لـە خاڵـەكانی پاشـكۆ نهێنییەكـەی بەیاننامـەی ١١ی مـارت بەشـێك لـەو هێزانـەیان لـەژێر نـاوی پاسـەوانی سـنوور هێـشتبۆوە[٤٩٣]. دواتـریش لـە ٣٠ی تـەمموزی ١٩٧٠دا وەزارەتـی نـاوخۆی عێـراق بڵاویكردەوە كە: (ئەنجومەنی سەركردایەتی شـۆڕش)ی عێـراق بڕیاریـداوە لەسـەر جێبەجێكردنی یاسـای پاسـەوانی سـنوور كـە مووچـەی كەسـانی سـەر بـەو هێـزە لەلایەن حوكمەتەوە دەدرێتو هەمان یاسای پۆلیسی ولاتیش ئەیانگرێتەوە[٤٩٤].

رفاندنو تیرۆركردنی نیشتمانپەروەرانو دۆسـتانی بزووتنـەوەی رزگـاریخوازی كوردستانیش، سیاسەتێكی بەعـسییەكان بـوو دوای راگەیانـدنی بەیاننامـەی ١١ی مارتیش دەستیان لێهەڵنەگرت، بەڵكو دوای ئـەوەش چـەندین كەسـیان شـوێنبزرو تیرۆر كرد، ئەو سیاسەتەش جگە لە كوردان، كەسانی سەر بە نەتەوە جیاجیاكانی كوردستانیشی گرتبۆوە كە دۆستایەتیو هاوكاری جوولانەوەی سیاسـیی كوردیـان دەكرد. لە بەردەوامی ئەو سیاسەتەشـدا شـەوی ٦/٧ی كـانوونی یەكـەمی ١٩٧٠دا لەبەردەم هوتێلی ئۆپێرا لە شاری بەغدا، بۆسەیەكیان دانایەوەو لە چەند لایەكەوە تەقـەیان لـە ئۆتـۆمبیلی ئیـدریس بـارزانی كـرد كـە هـەر ئـەو رۆژە خـۆی بـە ئۆتۆمبیلێكی تر گەڕابۆوە كوردستان، بەڵام جگە لـە شـوفێرەكە دووكەسـی دیكـە

---

(٤٩٢) دیدار لەگەڵ محەمەد عەزیز، هەولێر، ١٣/١٠/٢٠٠٢.

(٤٩٣) بڕوانە: مسعود البارزاني، البارزاني والحركة التحررية الكردية، ج٣، ص٦٢١–٦٢٢

(٤٩٤) بڕوانە: "هاوكاری"، ژ(٣٠)، ١ی ئابی ١٩٧٠.

لەناو ئۆتۆمبیلەکەدا بوون کە ئەوانیش محەمەد عەزیزو حەمید بەرواری(*) بوون کە ئەوەی یەکەمیان یاوەری ئیدریس بارزانی بوو لە سەردانەکەیدا بۆ بەغدا لە رووداوەکەش بێ زیان بوو، بەڵام ئەوەی دووەمیان بە رێککەوت لەناو ئۆتۆمبیلەکەدا بووو لە رووداوەکەش بە سەختی بریندار بوو(٤٩٥)

شایانی باسە ئەو رووداوە لەکاتێکدا بوو کە ئیدریس بارزانی لە کۆتاییەکانی تشرینی دووەمی ئەو ساڵەدا بۆ پیرۆزباییکردنی جەژنی رەمەزانو بەمەبەستی پتەوکردنی پێوەندیی نێوان بزووتنەوەی رزگاریخوازی کوردستانو رژێمی بەعسو نەهێشتنی کۆسپو تەگەرەکانی بەردەم جێبەجێکردنی بەیاننامەی ١١ی مارت و رەواندنەوەی کەشی بێبڕوایی، چووبووە بەغداو لەگەڵ لێپرسراوانی باڵای حوکمەت کۆببۆوە(٤٩٦) بەڵام لە ٦ی کانوونی یەکەم لەسەر داوای شێخ بابۆی مامی گەڕابۆوە کوردستان(٤٩٧)

(*) حەمید بەرواری: لەسەرەتای شۆڕشی ئەیلولەوە پێشمەرگە بووەو پلەی ئامر بەتالیۆنی پێسپێراوە. دوای بەیاننامەی ١١ی مارتیش بۆ ئامر فەوجی پاسەوانی سنوور، هەڵبژێردرابوو. کاتی کەوتنەوەی ئەو رووداوەش، بۆ کاروباری پاسەوانی سنوور چووبووە بەغدا تا لیستی ناوی ئەو پێشمەرگانەی کە بۆ پاسەوانی سنوور دەستنیشانکرابوون، بۆ حوکمەتی عێراق ببات، بەڵام بەهۆی رووداوەکە نەیتوانی ئەرکەکانی جێبەجێبکات، تەنانەت بەهۆی برینەکەشی دوای پێکهێنانی پاسەوانی سنووری نەیتوانی بچێتە سەر ئەو کارەی بۆی دەستنیشانکرابوو. دواتر وەك پاداشت دانەوەیەك لەریزی بزووتنەوەی رزگاریخوازی کوردستندا کرایە ئەندامی مەکتەبی عەسکەریی. تاکو ئێستا لە ژیاندایەو کاریگەری برینەکەی لەسەر ماوە. دیدار لەگەڵ محەمەد عەزیز، هەولێر، ١٣/١٠/٢٠٠٢.

(٤٩٥) دیدار لەگەڵ محەمەد عەزیز، هەولێر، ١٣/١٠/٢٠٠٢.

(٤٩٦) دیدار لەگەڵ محەمەد عەزیز، هەولێر، ٣/٩/٢٠٠٤.

(٤٩٧) مسعود البارزاني، البارزاني والحركة التحررية الكردية، ج٣، ص٢٥٧–٢٥٨.

بۆ پەردەپۆشکردنی ئەو تاوانەش، دوای رووداوەکە دەسەڵاتدارانی عێراق لە ٧ی هەمان مانگدا (فوئاد عارف و سەمیر عەزیز ئەلنەجم)یان بەیاوەری محەمەد عەزیز ناردە کوردستان[٤٩٨] و بەناوی سەرۆك کۆمارو سەدام حسێنەوە نارەزایی خۆیان نیشانداو بەڵێنێکی زۆریشیاندا بۆ گەران بەدوای تاوانباران‌و سزادانیان، هەروەها بەو بۆنەیەوە نامەیەکی (سەدام حسێن)یشیان پێشکەشی مستەفا بارزانی کرد. دواتریش هەرچەندە کەسانی ئەنجامدەری تاوانەکە لەلایەن حوکمەتی عێراقەوە دەسگیرکران‌و سزا دران، بەڵام هاندەری بنەرەتی تاوانەکە بەنادیاری مایەوە تا ساڵی ١٩٧٣ کە (نازم گزار)ی بەرێوەبەری ئەمنی عامەی عێراق لە هەوڵی کودەتا سەرنەکەوتووەکەی بۆ دەستگرتن بەسەر فەرمانرەوایی وڵات، دەسگیرکرا، ئەوکاتە رژێمی بەعس دانیپێدانا کە ناوبراو تەگبیری ئەو هەوڵەو هەوڵی کوشتنی مستەفا بارزانی کردووە[٤٩٩] جێی ئاماژەپێدانیشە، بەعس سەرەتا هەوڵیدا رژێمی ئێران تۆمەتبار بکات لە پیلانی لەناوبردنی ئیدریس بارزانی، بەڵام لەو بارەیەوە هیچ بەڵگەیەکی بەرچاوی بەدەستەوە نەبوو[٥٠٠].

کاربەدەستانی بەعس لەسەرێکەوە ئەو تاوانەیان دژی ئیدریس بارزانی ئەنجامدا، لەسەرێکی دیکەشەوە هەروەك لە سەرەتاش ئاماژەمان پێدا پێیان دادەگرت لەسەر ئەوەی کە سەرکردایەتی جووڵانەوەی کورد ئیدریس بارزانی دابنێت بۆ پۆستی جێگری سەرۆك کۆمار[*]، کەچی پارتی دیموکراتی کوردستان

---

(٤٩٨) دیدار لەگەڵ محەمەد عەزیز، هەولێر، ٢٠٠٤/٩/٣.

(٤٩٩) بۆ زانیاریی زیاتر بروانە: مسعود البارزاني، البارزاني والحركة التحررية الكردية، ج٣، ص٢٥٧–٢٥٩.

(٥٠٠) ئەحمەد بانیخێلانی، س پ، ل٣١٠.

(*) بگەرێوە بۆ تەوەری چوارەمی بەشی یەکەمی باسەکەمان.

(حەبیب محەمەد کەریم)ی بۆ ئەو پۆستە کاندید کردبوو، بەڵام بەعس بەبیانووی ئەوەی کە (حەبیب) فەیلییەو بەرەگەزنامە ئێرانییە، رازی نەبوو ئەو پۆستەی بدرێتیٚ[٥٠١] سەبارەت بەپێداگرتن و سووربوونی بەعسیش بۆ دانانی ئیدریس بارزانی لەو پۆستەدا چەند بۆچوونێك هەیە، لەوانە مەسعود بارزانی پێی وایە کە دەسەڵاتدارانی عێراق بروایان وابوو بەهۆی ئەو هەنگاوەوە راستگۆیی مستەفا بارزانی و بزووتنەوەی رزگاریخوازی کوردستان دەردەکەوێ لە رێککەوتنەکەیان لەگەڵ حوکمەتی عێراق[٥٠٢] هەرچی (حەبیب محەمەد کەریم)ە پێی وایە دەسەڵاتدارانی عێراق لەوەدا مەبەستیان ئەوەبوو کە ئیدریس بارزانی وەك یەکێك لە کورەکانی مستەفا بارزانی چەشنی بارمتەیەك لای خۆیان دابنێن[٥٠٣] ئێمەش زیاتر هەر ئەو بۆچوونە پەسەند دەکەین، لەبەرئەوەی فەرمانرەوایانی بەغدا باش لەوە گەیشتبوون‌و بێگومان بوون کە مستەفا بارزانی و سەرکردایەتی پارتی دیموکراتی کوردستان لە رێککەوتن‌و هەنگاوەکانیان راستگۆن‌و هیچ نیازێکی خراپیان نیە، بەڵام ئەوان ، هەر لەسەرەتاوە نیاز خراپ بوون‌و خەریکی ئەنجامدانی پیلانگێڕیی و خراپەکاریی بوون بۆ تێکدانی بارودۆخی ئارامی و ئاشتی لە کوردستاندا.

لە ٢٤ی کانوونی دووەمی ١٩٧١یشدا (ئەنجومەنی سەرکردایەتیی شۆڕش)ی عێراق بڕیاریدا، مووچەیەکی مانگانە بەبڕی (١٠)دینار بۆ ئەو کەسانە ببڕێتەوە کە پێشتر پێشمەرگەی شۆڕشی کوردستان بوون‌و سەرچاوەیەکی دیاریکراویان بۆ

---

(٥٠١) دیدار لەگەڵ حەبیب محەمەد کەریم، هاوینەهەواری شەقڵاوە، ٢٠٠٤/٧/٢٧.

(٥٠٢) دیدار لەگەڵ مەسعود بارزانی، هاوینەهەواری سەری رەش، ٢٠٠٣/٦/٢٢.

(٥٠٣) دیدار لەگەڵ حەبیب محەمەد کەریم، هاوینەهەواری شەقڵاوە، ٢٠٠٤/٧/٢٧.

بڕێوی ژیانیان نەبوو[٥٠٤]. هەر دوای ئەوەش حەبیب محەمەد کەریم و سالح یوسفی، ستایشی بڕیارەکەیان کردو بەگرنگیان لە قەڵەمدا[٥٠٥] ئەو بڕیارەش هەرچەندە لایەنی پۆزەتیڤی هەبووەو فاکتەرێك بوو بۆ کەمکردنەوەی کێشە ئابوورییەکانی ئەو کەسانەی بڕیارەکە گرتبوونیەوە، بەڵام لەراستیدا لەدەرکردنی ئەو بڕیارە بەعس مەبەستێکی دیکەی حەشاردابوو کە ئەویش ئامانجی راکێشانی سۆزی ئەو کەسانە بوو بۆ لای خۆی و دابڕینیان لە بزووتنەوەی رزگاریخوازی کوردستان. لەبەرئەوەی ئەگەر بەراستی خەمخۆری خەڵکی کورد بوایە، ئەوا لەدوای راگەیاندنی بەیاننامەی ١١ی مارت نەدەکەوتە پەیڕەوکردنی سیاسەتی تیرۆرکردنو پیلانگێڕیی. لە یادی یەکەم ساڵڕۆژی راگەیاندنی بەیاننامەی ١١ی مارتیشدا، لەشاری بەغدا خۆپیشاندانێکی گەورە سازکرا، لەوێدا سالح مەهدی عەماش لە خوێندنەوەی وتارێکدا بەو بۆنەیەوە، وەك نیمچە هەڕەشەیەك بۆ سەرکردایەتی جووڵانەوەی رزگاریخوازی کوردستان، رایگەیاند: بەعسییەکان لەگەڵ کورد رێککەوتوون نەك لەگەڵ پارتی دیموکراتی کوردستانو مستەفا بارزانی[٥٠٦] ئەوەش دووپاتکردنەوەی بەدنیازی دەسەڵاتدارانی بەعس بوو لەپێناو درزخستنە نێوان نەتەوەی کوردو سەرکردایەتییەکەی‌و دابڕینیان لە یەکتر.

لەسەرەتای تەمموزی ١٩٧١یشدا، رژێمی بەعس مانۆڕێکی گەورەی سەربازی لە ناوچەی بارزان سازداو بە تۆپو تانکەوە هێرشی بۆ سەر ناوچەکە

(٥٠٤) بڕوانە: الجمهورية العراقية، القرارات العامة لمجلس قيادة الثورة(١٩٦٨–١٩٧٧)، المجلد الاول، ص٦٠٣.

(٥٠٥) "هاوکاری"، ژ (٤)، ٣٠ی کانوونی دووەمی ١٩٧١.

(٥٠٦) بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: ئیبراهیم جەلال، س پ، ل٢٩٠–٢٩١.

دەسپێکرد[٥٠٧] لە ٤–٨ی ئەو مانگەشدا فڕۆکەکانی کەوتنە بۆردوومانکردنی ئەو ناوچەیە کە بەهۆیەوە زیانێکی زۆری ماڵی و دارایی بەر خەڵکەکەی کەوت[٥٠٨]. لە ١١ی هەمان مانگیشدا مستەفا بارزانی، کاربەدەستانی کوردی بانگرد بۆ خۆئامادەکردن‌و هەڵوێست وەرگرتن، بەڵام دواتر سەرۆك کۆمار هاتە ناو کێشەکەو بۆ ماوەیەك شەڕەکە راگیرا[٥٠٩].هۆکاری ئەو هێرشەش لەوەوە سەرچاوەی گرتبوو، کە لەوکاتەدا عوبەیدوڵلای[*] کوڕە گەورەی مستەفا بارزانی و شێخ عوسمانی[**] مامی بەهۆی هەندێ کێشەی ناوخۆی بنەماڵەکەیانەوە لەگەڵ هەندێ بارزانی دیکە، پەنایان بردبووە بەر رژێمی بەغدا، ئەوانیش بەبیانووی پارێزگاریکردنیان‌و بەمەبەستی دەستێوەردان لە کاروباری تایبەتی بارزانییەکان‌و قووڵکردنەوەی ناکۆکییەکانیان‌و پێکهێنانی پێگەیەك دژ بە مستەفا بارزانی، ئەو بارودۆخەیان قۆستەوەو هێرشیان بۆ سەر ناوچەی بارزان ئەنجامدا، بەڵام

---

(٥٠٧) کریس کۆچێرا، س پ، ل٤٣١.

(٥٠٨) مامخان شێروانی، بارزان‌و رەچەڵەکی بارزانیان، لێکۆڵینەوەیەکی مەیدانی‌و مێژوویی لەسەر بارزان تا بەهاری ١٩٧٤، لەندەن، ١٩٩٤، ل١٢٦.

(٥٠٩) کریس کۆچێرا، س پ، ل٤٣١.

(*) عوبەیدوڵڵا مستەفا بارزانی: ساڵی ١٩٢٧ لە بارزان لەدایك بووە، وەك سەرکردەیەك رۆڵێکی گرنگی لە شۆڕشی ئەیلول گێڕاوە، سەرەتای نیوەی یەکەمی حەفتاکان بەهۆی ناکۆکی بنەماڵەیی بەتایبەتی بەهۆی ململانێی لەگەڵ باوکی، رووی کردە ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی حوکمەتی عێراق، ئەوەش لەلایەن دەسەڵاتدارانی بەعسەوە قۆسترایەوەو دوای نسکۆی شۆڕشی کوردستان کردیان بەوەزیری دەوڵەت، بەڵام ساڵی ١٩٨١ دەسگیریان کردو ساڵی ١٩٨٣ لەگەڵ چەند بارزانییەکی‌دیکە بێسەرو شوێنکران.

(**) شێخ عوسمان: کوڕی شێخ ئەحمەدەو برای مستەفا بارزانییە، دوای مردنی باوکی لە کانوونی دووەمی ١٩٦٩ تا پاییزی ١٩٧١ هەموو کاروباری بارزان‌و بەشێك لە ناحیەی شێروان مەزنی گرتە دەست.

سەرەڕای بەرەنگاربوونەوەیان لەلایەن هێزەکانی پێشمەرگەو ناچارکردنیان بۆ گەڕانەوەیان، سەرکردایەتی بزووتنەوەی رزگاریخوازی کوردستانیش ئاگادارکردنەوەیەکی توندی ئاراستەی لێپرسراوانی بەغدا کرد[٥١٠]، لەکاتێکدا بەعس هەوڵیدەدا ناکۆکییە تایبەتییەکانی ناو بنەماڵەی شێخەکانی بارزان، بقۆزێتەوە[٥١١].

هەر لەچوارچێوەی ئاژاوەوپیلانگێڕییەکانی رژێمی بەعس، شەوی ٢٥/٢٦ی تەمموزی ١٩٧١دەستدرێژی کرایە سەر بارەگای پارتی دیموکراتی کوردستان لە خانەقین، پێشمەرگە ئێشکگرەکانی نێو بارەگاکەش کەوتنە بەرگریکردنو پێکدادانی چەکداری نێوانیان زیاتر لەنیو کاتژمێری خایاند، بەڵام ئەوکاتە هیچ کاربەدەستێکی رژێمی عێراق بەدەنگ رووداوەکەوە نەچووبوون، دواتر چوار ئۆتۆمبیلی پۆلیسو لێپرسراوی رێکخراوی حیزبی بەعس لە خانەقینو قایمقامو بەڕێوەبەری پۆلیس چووبوونە بارەگاکەی (پ.د.ك)[٥١٢] ئەو درەنگ چوونەی لێپرسراوە بەعسییەکانیش بۆ شوێنی رووداوەکە، نیشانەی ئەوەبوو کە خۆیان لەپشت ئەنجامدانیەوە بوون.

پیلانی لەناوبردنی مستەفا بارزانییش، کە هەر لەسەرەتاوە ئامانجێکی سەرەکی رژێمی بەعسو مەرامی شاراوەی بوو لە دەسپێکردنی گفتوگۆ لەگەڵ سەرکردایەتی شۆڕشی رزگاریخوازی کوردستان، لە ٢٩ی ئەیلولی ١٩٧١ بە

(٥١٠) بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: منشورات دار التآخي، في سبيل سلم والوحدة الوطنية، ص٦٨؛ د.جورج حجار، المسألة الكردية، نحو اخوة العربية، دار القدس، بيروت–لبنان، د ت، ص٣٢–٣٤؛ مامخان شێروانی، س پ، ل١٢٧–١٣٧.

(٥١١) بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: مامخان شێروانی، س پ، ل١١٨–١٤٠.

(٥١٢) پاشكۆی "برایەتی"، ژ(٩)، ٢/٨/١٩٧١.

هاوكـارى چـەند مەلايـەك جێبـەجێ كـرا، بـەڵام ئـەو پيلانـەش ئـاواتى بەعـسى بەدينەهێناو مستەفا بارزانى دەربازى بوو[٥١٣]

دواى ئەنجامدانى پيلانەكەش، فەرمانڕەواياني بەغدا وەك تاكتيكێك، نوێنەرى خۆيان نارده لاى مستەفا بارزانى بەمەبەستى پيرۆزبايى لێكردنى دەربـازبوونى لـە پيلانگێڕييەكـە، پاشـانيش بـۆ لێكۆڵينـەوەى رووداوەكـە لێژنەيـەكى هاوبەشـيان لەگەڵ بزووتنەوەى رزگاريخوازى كوردسـتان پێكهێنـا، بـەڵام لەبەرئـەوەى بـەعس خـۆى پيلانەكـەى ئەنجامـدابوو، كارەكـانى لێژنەكـە بێئاكـام بـوون[٥١٤] هـەر لـە سەرەتاشـەوە مـستەفا بـارزانى بەشـێوەيەكى زيرەكانـەو ناڕاسـتەوخۆ لـەميانى وەڵامـى ئـەو بروسـكەيەى كـە سـەركردايەتى بـەعس بەبۆنـەى دەربـازبوونى لـە پيلانگێڕييەكە بۆى ناردبوو، تاوانەكەى خستە ئەستۆى ئـەوان و تيايـدا گوتبـووى: "گومانى تيانى يە كە پيلانەكـە رێكخرابـوو بـۆ لـەناوبردنى بەياننامەكـەى مـارت و يەكێتى نيشتمانى گەلى عێراقمان وە لەبەرئەوەى تاوانبارەكان لە بەغداوە هـاتوون بەناو زياتر لە دە نوقتەى پشكنينى ميرى دا بەدوو ئۆتۆمبيلى پڕ لە ئامرازى تاوان بـەجێ هێنانـەوە، وە ئەمانـە لـە دانيـشتوانى ئـەم هەرێمـە نـين.... لەبەرئـەوە لێكۆڵينەوە لەمە ئەدەينە دەست دەستگاى تايبەتى ميرى"[٥١٥]

---

(٥١٣) بۆ زانياريى زياتر بڕوانە: كريس كۆچيرا، س پ، ل٤٣١-٤٣٢؛ جرجيس فتح الله، زيارة للماضـي القريـب. ص١٩٥-٢٠٣؛ رۆژنامـەى "برايـەتى"، ژ(٤)و (٥)، ١٩٧١/١٠/٧و ١٩٧١/١٠/١٤؛ "هاوكـارى"، ژ(٣٦)، ١٩٧١/١٠/٩؛ "رۆژى كوردسـتان" (گۆڤـارێكى رۆشنبيرى گشتى يە مـانگى جارێك بەكوردى و عەرەبى لەلايەن كۆمەڵەى رۆشـنبيرى كوردىيەوە لەبەغدا دەردەچێ)، ژ(٥و٦)، تشرينى يەكەم و دووەمى ١٩٧١، ل٧.

(٥١٤) "كادر"، ژ(١٧)، تشرينى يەكەم ١٩٧٢، ل٩-١١.

(٥١٥) رۆژنامەى "برايەتى"، ژ(٤)، ١٩٧١/١٠/٧.

ئەو پیلانەی بەعس بە شاراوەیی مایەوە تا لە تەممووزی ١٩٧٣ نازم گزار لە کاتی دادگاییکردنەکەیدا دانی بەوەدانا کەخۆی پلانی لەناوبردنی مستەفا بارزانی دارێژتووەو کەسی دیکە ئاگادار نەبووە[٥١٦]. ئەو شێوە دانپێنانەش لەژێر پاڵەپەستۆی کاربەدەستانی بەغدا بوو، بۆ ئەوەی کێشەکە بخەنە ناو چوارچێوەی پرسی شەخسییەوە.

جێی ئاماژەپێدانە لەگەڵ بڵاوبوونەوەی هەواڵی پیلانگێڕییەکە، جەماوەر لە شارەکانی کوردستان بە پەرۆشەوە بۆ زانینی هەواڵی تەندروستی مستەفا بارزانیو دەربڕینی نارەزاییان دژی ئەو تاوانە، هاتنە سەر شەقامەکان[٥١٧] ئەو هەڵوێستەی جەماوەریش لەلایەکەوە نیشاندانی هەستو سۆزو پشتگیری بوو بۆ مستەفا بارزانی، لەلایەکی دیکەشەوە هەڵوێست وەرگرتنو دەنگدان بوو دژی دەستدرێژییەکانی حوکمەتی بەعسو نیشانەی ئامادەییان بوو بۆ وەڵامدانەوەی ئەو تاوانە.

سەرکردایەتی پارتی دیموکراتی کوردستان و لەشکری کوردستانیش ئامادەیی خۆیان نیشانداو داوایان کرد شەڕ لە بەرانبەر فەرمانڕەوایانی بەعس رابگەیەنن، بەڵام مستەفا بارزانی ئەگەرچی خۆی کە ئامانجی پیلانەکە بووو بەسووکیش بریندار ببوو، گوتبووی: هەرگیز رازی نیم لەسەر من شەڕ رابگەیەنرێت، بەڵکو ئەگەر شەڕ رابگەیەنن دەبێ لەپێناوی کەرکووکو سنووری کوردستانو کێشەی فەیلییەکان بێت[٥١٨]. رژێمی بەعسیش لەو دان بەخۆداگرتنەی مستەفا بارزانی، زیاتر کەڵکی وەرگرتو بەردەوام بوو لە بەهێزکردنو پتەوکردنی دەسەڵاتەکەیو

(٥١٦) ئیبراهیم جەلال، س پ، ل٢٩٣.

(٥١٧) رۆژنامەی "برایەتی"، ژ(٤)، ٧/١٠/١٩٧١.

(٥١٨) دیدار لەگەڵ مەسعود بارزانی، هاوینەهەواری سەری رەش، ٢٢/٦/٢٠٠٣.

درێژەپێدانی سیاسەتی تیرۆرو تۆقاندن دەرهەق بە جووڵانەوەی رزگاریخوازی کوردستان‌و راگواستنی خەڵکی کورد لەشوێنی خۆیان‌و بەعەرەبکردنی ناوچە کوردستانییەکان. لەبەرئەوە دەبوایە سەرکردایەتی کورد هیچی دیکە دەرفەتی خۆبەهێزکردنەوەی بە بەعس نەداباو کاتێکیش هەوڵی لەناوبردنی مستەفا بارزانی درا، دەبوایە هەڵوێستێکی یەکلاکەرەوەیان وەربگرتایە، لەبەرئەوەی رژێمی عێراق وایدەبینی کە نەمانی ئەو سەرکردەیەی کورد، نەمانی نەتەوەی کوردو جووڵانەوە رزگاریخوازەکەیەتی، چونکە هەموو هێزو توانای سیاسیی کوردی، لە مستەفا بارزانییدا دەبینی.

لەپێناو یەکێتی ریزەکانی پارت و هێزە سیاسییەکانی عێراق و کوردستانیش، پارتی دیموکراتی کوردستان هەر لەسەرەتای دامەزراندنییەوە دروشمی بەرەی نیشتمانیی هەڵگرتووەو بەهەموو توانایەکییەوە لەپێناو پێکهێنانیدا خەباتی کردووە[٥١٩]، تەنانەت دوای راگەیاندنی بەیاننامەی ١١ی مارتیش (پ.د.ك) لەسەر ئەو پرەنسیپە سووربووو لە راپۆرتی سیاسیی کۆنگرەی هەشتەمیشیدا کە لە تەمموزی ١٩٧٠ بەسترا، زۆر گرنگی بەو پرسەدا کە پێی وابوو: "بەرەی نیشتمانی پێویستییەکی دوانەخراوی نیشتمانییە"[٥٢٠] هەروەها پارتی دیموکراتی کوردستان‌و حیزبی بەعس دوای راگەیاندنی بەیاننامەی ١١ی مارت لەمیانی کۆبوونەوەکانیاندا، چەند جارێك لەسەر ئەوە رێککەوتن کە بەهاوبەشی پرۆژەی کاری نیشتمانیی بڵاوبکەنەوە، بەڵام بەعس گوێی بەو رێککەوتنانە نەداو لە ١٥ی تشرینی دووەمی ١٩٧١دا یەکلایەنە پرۆژەکەی بڵاوکردەوە[٥٢١]. لە بەرانبەردا، مەکتەبی سیاسیی (پ.د.ك) ١٢ی کانوونی دووەمی ١٩٧٢، لە بیرخەرەوەیەکدا بۆ

(٥١٩) "کادر"، ژ(١٣)، حوزەیرانی ١٩٧٢، ل٥٨–٥٩.

(٥٢٠) بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: گۆڤاری "برایەتی"، ژ(٣)، سەرەتای ئابی ١٩٧٠، ل٤–١٧.

(٥٢١) "دەنگوباسی کوردستان"، ژ(١٧)، ئابی ١٩٧٣.

سەرکردایەتی هەرێمایەتی حیزبی بەعس، دوای رەخنەگرتن سەبارەت بە بڵاوکردنەوەی پرۆژەکە یەکلایەنە، سەرنجەکانی خۆی دەربارەی پرۆژەی ناوبراو خستەڕوو[٥٢٢]، بەڵام بەعس بەهیچ شێوەیەك وەڵامی ئەو بیرخەرەوەی (پ.د.ك)ی نەدایەوە[٥٢٣]. شایانی باسە، لەلایەن چەند کەسایەتییەکی سیاسیی کوردیشەوە لەوانە (هادی چاوشلی)[*]، سەرنجو بیروڕا لەمەڕ پرۆژەی پەیمانی کاری نیشتمانیی نووسراوەتەوە[٥٢٤].

بەشێوەیەکی گشتییش، بەعس دەسەڵاتی فەرمانڕەوایی‌و کارگێڕی عێراقی بۆ خۆی پاوانکردبووو هەموو دەزگایەکی ئەو وڵاتەی بە موڵکی خۆی دەزانی‌و کۆنترۆڵی شوێنە گرنگەکانی دامودەزگاکانی دەوڵەتی کردبوو، هەموو ئامانجو مەبەستێکیشی پتەوکردنی دەسەڵاتی تاکڕەوانەی خۆی بوو.

پوختەی سیاسەتی فەرمانڕەوایی بەغدا لەلایەن (ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش)ی عێراقەوە دادەڕێژاو ئاراستە دەکرا، کە ئەویش تەنها لە نوێنەرانی سەرکردایەتی حیزبی بەعس پێکهاتبوو. حوکمەتیش کە دەسەڵاتی جێبەجێکردن‌و

(٥٢٢) بۆ زانیاریی زیاتر سەبارەت بەو بیرخەرەوەیە بڕوانە: "کادر"، ژ(١٣)، حوزەیرانی ١٩٧٢، ل٥٨–٦٥.

(٥٢٣) ڕۆژنامەی "برایەتی"، ژ(٦٩)، ١٩٧٣/٩/٢١

(*) هادی ڕەشید چاوشلی: ساڵی ١٩٢٠ لە هەولێر لە دایك بووە. ساڵی ١٩٤٣ کۆلێجی ماف‌و ساڵی ١٩٤٤یش کۆلێجی سەربازیی تەواو کردووە. لەماوەی ژیانیدا وێڕای کاری پارێزەری‌و ڕۆژنامەگەریی، چەندین پۆستی کارگێڕی پێسپێردراوە، وەك: (سەرۆکی شارەوانی هەولێر، موتەسەریفیی سلێمانی بەوەکالەت، بەڕێوەبەری گشتیی ناوخۆ، بریکاری وەزارەتی ناوخۆی عێراق)، ساڵی ١٩٩٦ لە هەولێر کۆچی دوایی کردووە.

(٥٢٤) بڕوانە: پاشکۆی ژ(٤).

كارگێڕیی لە ئەستۆدابوو، هەرچەندە پێنج وەزیری کوردی[*] تێدابوو، بەڵام فەرمانگە سەرەکییەکانی وەك (وەزارەتی ناوخۆ، دەرەوە، نەوت، ئابووری، پەروەردە، چاککردنی کشتوکاڵ، کاروباری کۆمەڵایەتی، گواستنەوەو گەیاندن)و زۆربەی وەزارەتەکانی دیکە هیچ کوردێکیان تێدا نەبوو[٥٢٥] تەنانەت دەزگاکانی سوپاش کە پێویست بوو تەواوی گەلانی عێراق بگرێتەخۆ، دەسەڵاتدارانی بەعس دەستیان بەسەردا گرتبووو هەوڵیاندەدا بیکەنە هێزێکی کارای تایبەت بەخۆیان، بۆیە کەوتنە گرتن‌و لێدان‌و کوشتن‌و ئەشکەنجەدانی ئەو ئەفسەرو سەربازانەی کە بەعسی نەبوون. هەروەها دوای ڕاگەیاندنی بەیاننامەی ١١ی مارت، جگە لە بەعس تەنها پارتی دیموکراتی کوردستان کەمێك دەرفەتی چالاکی هەبوو لەنێو سوپادا، بەڵام دوای دەرچوونی پڕۆژەی پەیمانی کاری نیشتمانیی ئەو دەرفەتە لە (پ.د.ك)یش قەدەغەکراو زۆر لە ئەندامانیشی لەنێو سوپادا دەسگیرکران‌و هەندێکیشیان لەژێر ئەشکەنجەی بەعس کوژران، بەهۆی ئەو سیاسەتەشەوە زۆر لە ئەندامانی (پ.د.ك) ڕیزەکانی سوپای عێراقیان جێهێشت‌و گەڕانەوە ڕیزی بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی کوردستان[٥٢٦]

---

(*) بەپێی بەیاننامەی ١١ی مارت پێنج کورد کە لەلایەن پارتی دیموکراتی کوردستانەوە دەستنیشانکران، پۆستی وەزارەتیان لە حوکمەتی عێراق وەرگرت، کە ئەمانە بوون: (نووری شاوەیس–وەزیری نیشتەجێکردن، ئیحسان شێرزاد–وەزیری شارەوانی، محەمەد مەحمود عەبدولڕەحمان (سامی)–وەزیری کاروباری باکوور، نافیز جەلال–وەزیری کشتوکاڵ، ساڵح یوسفی–وەزیری دەوڵەت). بڕوانە: حبيب محمد كريم، تاريخ الحزب الديمقراطي الكردستاني –العراق، ص١٢٤.

(٥٢٥) "کادر"، ژ(١٢)، ئایاری ١٩٧٢، ل٤٣–٤٤.

(٥٢٦) "کادر"، ژ(١٧)، تشرینی یەکەمی ١٩٧٢،ل٢٦.

شایانی باسه، (ئه‌نجومه‌نی سه‌ركردایه‌تی شۆڕش)ی عێراق له‌ ١٠ی تشرینی دووه‌می ١٩٧١، به‌پێی بڕیارێك چالاكی و ڕێكخستنی سیاسیی له‌نێو هێزه‌ چه‌كداره‌كانی ده‌وڵه‌ت قه‌ده‌غه‌ كرد، كه‌ ته‌نها بۆ حیزبی به‌عس ڕێگه‌پێدراو بوو. كۆمه‌ڵێك سزای توندیشی دژی سه‌رپێچیكاران بڕیاردا بوو[٥٢٧]

جێی ئاماژه‌پێدانه‌، هه‌رچه‌نده‌ به‌مه‌به‌ستی په‌له‌كردن له‌ جێبه‌جێكردنی بڕگه‌ی (ج) له‌ ماده‌ی (٣)ی به‌یاننامه‌ی ١١ی مارت[*]، (ئه‌نجومه‌نی سه‌ركردایه‌تی شۆڕش)ی عێراق له‌ ٢٨ی ئابی ١٩٧٠ بڕیارێكی ده‌ركردبوو[٥٢٨]، به‌ڵام له‌گه‌ڵ ئه‌وه‌شدا له‌ هه‌ردوو كۆلیجی سه‌ربازی و ئه‌ركانی به‌غدا كه‌ (٣٢٠) كورسی خوێندنیان هه‌بوو، ژماره‌یه‌كی زۆر كه‌می قوتابی كورد وه‌رگیرابوون كه‌ ئه‌گه‌ر به‌پێی ڕێژه‌ی كورد له‌چاو نه‌ته‌وه‌كانی دیكه‌ی عێراق وه‌ربگیرانایه‌، ده‌بووایه‌ نزیكه‌ی (١١٠) قوتابی كورد وه‌ربگیرانایه‌، كه‌چی ساڵی ١٩٧١ له‌ هه‌ردوو كۆلێجی ناوبراو ته‌نها (٨) قوتابی كورد وه‌رگیرابوون[٥٢٩] ئه‌وه‌ش بۆ ئه‌وه‌ ده‌گه‌ڕایه‌وه‌ كه‌ ڕژێمی به‌عس به‌هۆی بڕوای تاكڕه‌وانه‌ی، ته‌نها باوه‌ڕی به‌ عه‌ره‌به‌ به‌عسییه‌كان هه‌بوو، بۆیه‌ ده‌رگای ئه‌و شوێنه‌ هه‌ستیارانه‌ی ته‌نها بۆ به‌عسییه‌كان واڵاكردبووو له‌سه‌ر كوردو خه‌ڵكی نابه‌عسیشی داخستبوو، له‌ ترسی ئه‌وه‌ی نه‌بادا ئه‌و كه‌سانه‌

---

(٥٢٧) بڕوانه‌: الجمهورية العراقية، القرارات العامة لمجلس قيادة الثورة (١٩٦٨–١٩٧٧)، المجلد الاول، ص٥٣٥.

(*) سه‌باره‌ت به‌م بڕگه‌یه‌ بڕوانه‌: پاشكۆی ژ(١).

(٥٢٨) بڕوانه‌: الجمهورية العراقية، القرارات العامة لمجلس قيادة الثورة (١٩٦٨–١٩٧٧)، المجلد الاول، ص٦٠٢.

(٥٢٩) د.گوینته‌ر دێشنه‌ر، س پ، ل٢٢٨.

پۆستی بەرز لە دەزگا سەربازییەکانی دەوڵەت بەدەست بهێنن‌و لە پاشەڕۆژیشدا ترسی هەڵگەڕانەوەیان لێبکرێت.

ڕژێمی عێراق نەك هەر ڕێگەی لەوە گرتبوو کوردو نابەعسییەکان بگەنە پۆستە بەرزو هەستیارەکان، بەڵکو ئەو پۆستانەشی کە بەپێی بەیاننامەی ١١ی مارت بە کەسانی سەر بە جووڵانەوەی ڕزگاریخوازی کوردستان سپێردرابوون دەسەڵاتێکی ئەوتۆیان پێنەدرابوو. بۆ نموونە لەهەر سێ پارێزگای هەولێرو دهۆك‌و سلێمانی، کورد لە پۆستی پارێزگارەکان دانرابوون[*]، بەڵام دەسەڵاتی ڕاستەقینە هەر بەدەستی بەڕێوەبەرانی ئەمنی پارێزگاکانەوە بوو کە ڕاستەوخۆ پەیوەست بوون بە کاربەدەستە بەعسییەکانی ڕژێمی بەغداوەو پێوەندییان بە پارێزگارەوە نەبوو. تەنانەت کارگێڕی خۆیی کە لە بەیاننامەی ١١ی مارت باسی لێوەکرابوو تا کۆتایی ساڵی ١٩٧٠ هەر پشتگوێ دەخراو دواتریش کە جێبەجێکرا بەپێی خواستی کورد نەبوو[٥٣٠].

لەپاڵ هەموو ئەوانەشدا، کوشتن‌و دەست وەشاندن لە ئەندام‌و دۆست‌و لایەنگرانی بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی کوردستان، ببووە نەریتێکی ئاسایی بەعس‌و هەمیشە بچووکترین هەل‌و دەرفەتی بۆ ئەو مەبەستە دەقۆستەوە. هەر لەو چوارچێوەیەشدا لە کۆتاییەکانی کانوونی یەکەمی ١٩٧١ چەندین کاری

(*) ئەوانەی لە پۆستی پارێزگاری ئەو سێ پارێزگایە دانرابوون بریتیبوون لە: (عەلی عەبدوڵڵا- پارێزگاری سلێمانی، عەبدولوەهاب ئەتروشی-پارێزگاری هەولێر، هاشم ئاکرەیی- پارێزگاری دهۆك)، کە هەر سێکیان ئەندامی کۆمیتەی ناوەندیی پارتی دیموکراتی کوردستان بوون‌و هەر لەلایەن (پ.د.ك)یشەوە بۆ ئەو پۆستانە هەڵبژێردرا بوون. بڕوانە: حبيب محمد كريم، تاريخ الحزب الديمقراطي الكوردستاني-العراق، ص١٢٤.

(٥٣٠) بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: د.گوینتەر دێشنەر، س پ، ل٢٢٨.

توندوتیژیی‌و تەقاندنەوەی لە شوێنە گشتییەکانی شارەکانی کوردستان ئەنجامدا کە بووە هۆی کوژران‌و برینداربوونی چەندین کەس[٥٣١]

بۆ پەردەپۆشکردنی ئەو سیاسەتەشیان، حوکمەتی بەعس لە بڵاوکراوەکانی خۆیدا پارتی دیموکراتی کوردستانی بە چەندین تاوانی جۆراوجۆری وەك کوشتن‌و رفاندن‌و دەسگیرکردن...هتد، دەرهەق بەو خەڵکانەی لە دەرەوەی جووڵانەوەی کوردی بوون، تۆمەتبار دەکرد[٥٣٢]، لەکاتێکدا هەر لەو ماوەیە بەدەیان ئەندامی (پ.د.ك)یان بە تۆمەتی جۆراوجۆر خستبووە زیندانی (کۆشکی کۆتایی/ قصر النهاية)[*]، بەڵام (پ.د.ك)یش لە بڵاوکراوەکانی خۆیدا هەموو ئەو تۆمەتانەی کە لەلایەن بەعسەوە خرابووە پاڵی، رەتکردەوەو بەبێ بنەمای دانا[٥٣٣] بۆ بەرگرتن لە زیاتر تەشەنەکردنی بارگرژی نێوان (پ.د.ك)و رژێمی بەعس، مەکتەبی سیاسیی حیزبی شیوعی عێراق لە کانونی دووەمی ١٩٧٢دا یاداشتێکی ئاراستەی

---

(٥٣١) بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: منشورات دار التاخي، في سبيل السلم والوحدة الوطنية، ص٨٤-٨٥.

(٥٣٢) بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: منشورات الثورة، لكي يصان السلام وتتعزز الوحدة الوطنية، ص٨٨-٩١.

(*) ئەوە کۆشکی عامر(قصر العامر) بوو، کە موڵکی وەسی عێراق (میر عەبدولئیلا) بووو لەبەرەبەیانی کودەتای چواردەی تەمموزی ١٩٥٨ لەناو ئەو کۆشکەدا کوژرا، هەر بۆیەش بەکۆشکی کۆتایی (قصر النهاية) ناسرا کە تیایدا کۆتایی بەبنەماڵەی پاشایەتی هات، دواتریش بەعسییەکان لەماوەی یەکەم‌و دووەمی دەسەڵاتیاندا ئەو کۆشکەیان کردە زیندانێك بۆ ئەشکەنجەدان‌و کوشتنی بەرهەڵستکارانیان. د.مكرم الطالباني، نحو حل صحيح للمسألة القومية الكردية في العراق، ص٢٥٧.

(٥٣٣) بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: منشوات دار التاخي، في سبيل السلم والوحدة الوطنية، ص٧٧ء ٨٨-٩١.

هەردوولاکردو لە روانگەی هەستکردن بە بەرپرسیارێتی نیشتمانیی سەرشانی، چەند خاڵێکی بۆ هەریەکەیان دەستنیشانکرد، تا لە پێناو ئاساییکردنەوەی پێوەندیی نێوانیان جێبەجێی بکەن[٥٢٤].

ئەو سیاسەتەی فەرمانڕەوایانی بەعس پەیڕەویان دەکرد، ببووە فاکتەری، دروستبوونی ساردی پێوەندییان لەگەڵ سەرکردایەتی جووڵانەوەی رزگاریخوازی کوردستان کە ببووە بەڵگەو هۆکارێ بەرچاو لەنێو کۆمەڵانی خەڵك‌و پارتە سیاسییەکان بۆ دەربرینی سەرنج‌و بیروڕای جیاواز، دەربارەی رەوتی جێبەجێکردنی بەیاننامەی ١١ی مارت. پارتی دیموکراتی کوردستانیش لە روانگەی پەرۆشی بۆ دەرخستنی راستیی ئەو پرسە گرنگە، لە ئایاری ١٩٧٢ وتارێکی بەناونیشانی (رێکەوتننامەی ١١ی ئادار چی لێ جێ بەجێ کراوەو نەکراوە) بڵاوکردەوە، تیایدا بە روونیی تیشکی خستە سەر بەندەکانی بەیاننامەکەو خاڵە جێبەجێ کراوو نەکراوەکانی[٥٢٥]. مەبەست لە بڵاوکردنەوەی ئەو وتارەش زیاتر بۆ ئەوەبوو کە بەرانبەر گەلی کوردستان‌و عێراق بەرپرسیارێتی جێبەجێنەکردنی بەیاننامەی ١١ی مارت، کە لەئەستۆی بەعسدا بوو، لەئەستۆی خۆی لاببات.

رژێمی بەغدا کە لە هاوینی ساڵی (١٩٧٠)ەوە بیری لە خۆماڵیکردنی نەوت کردبۆوەو کەوتبووە گفتوگۆ لەگەڵ کۆمپانیا نەوتییەکانی بیانیی، بەڵام دوای سەرنەگرتنی گفتوگۆکان، لە ١ی حوزەیرانی ١٩٧٢ سکرتێری سەرکردایەتی هەرێمایەتی حیزبی بەعس، بڕیاری خۆماڵیکردنەکەی بڵاوکردەوە[٥٢٦] و هەر هەمان

---

(٥٢٤) بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: پاشکۆی ژ(٥).

(٥٢٥) بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: "کادر"، ژ(١٢)، ئایاری ١٩٧٢، ل٤٢–٥٣.

(٥٢٦) بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: حیزبی بەعسی عەرەبی ئیشتراکی–عێراق، راپۆرتی سیاسیی سەر بەهەشتەمین کۆنگرەی هەرێمایەتی، ل٨٦–٨٨.

رۆژیش (ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش)ی عێراق بڕیاری یاسای پرۆسەی خۆماڵیکردنی نەوتی عێراقی دەرکرد[٥٣٧] پارتی دیموکراتی کوردستانیش کە بەر لە دەرچوونی بڕیارەکە پشتگیری خۆی دەربڕیبوو، ئەو هەنگاوەی پەسەند کرد[٥٣٨]، هاوکات هەڵوێستی یەکێتی سۆڤیەتو وڵاتانی دیکەی سۆشیالیستی لە پاڵپشتیکردنی خۆماڵیکردنەکە گرنگییەکی سیاسیی ئابوورییانەی هەبوو[٥٣٩]

نەوت بووە سەرمایەکی گرانبەها بۆ رژێمی بەعس کە دەیتوانی گەلێك وڵاتی پێبترسێنێت، سەرەڕای ئەوەی بەهۆیەوە پارەیەکی یەکجار زۆری کۆکردەوە بۆ خەزێنەی خۆیو کڕینی باشترینو زۆرترین چەکی نوێ. هەروەها بەهۆی ناردنە دەرەوەی بەردەوامی نەوت بۆ وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا، پردێکی گەورەی پێوەندیی لەگەڵ کاربەدەستانی ئەو وڵاتە دروستکرد. بەوشێوەیە لە عێراقدا نەوت هێندە گرنگی پەیدا کرد کە بووە یەکێك لەو هۆیە سەرەکییانەی وای لە فەرمانڕەوایانی بەعس کرد، خۆیان بۆ شەڕ دژی بزووتنەوەی رزگاریخوازی کوردستان سازو ئامادە بکەن[٥٤٠]

خۆماڵیکردنی کۆمپانیا نەوتییەکان، کاری لە بارودۆخی ناوچە نەوتییەکانی کەرکووکیش کردو، مستەفا بارزانی، بۆ ناچارکردنی بەدابەشکردنی داهاتی نەوت بەپێی رێژەی دانیشتوان، فشاری خستەسەر رژێمی عێراق. بەعسیش کە لەنیازی کورد بۆ داواکردنی کەرکووك بەئاگا بوو، بەبیانووی ئەوەی کە تەنیا حوکمەتی

---

(٥٣٧) بڕوانە: "الوقائع العراقية"، ع(٢١٤٦)، ١٩٧٢/٦/١.

(٥٣٨) رۆژنامەی "برایەتی"، ژ(٢)، ١٩٧٢/٦/٢؛ "کادر"، ژ(١٦)، ئەیلول ١٩٧٢، ل١٩.

(٥٣٩) حیزبی بەعسی عەرەبی ئیشتراکی–عێراق، راپۆرتی سیاسیی سەر بەهەشتەمین کۆنگرەی هەرێمایەتی، ل٩٢.

(٥٤٠) پارتی دیموکراتی کوردستان (سەرکردایەتی کاتی)، س پ، ل٦٣

نیشتمانیی دەتوانێت بڕیار لەسەر دابەشکردنی سامانێکی نیشتمانیی وەکو داهاتی نەوت بدات، ملی بۆ ئەو داخوازییە نەدا[٥٤١]

لەلایەکی دیکەشەوە دوای خۆماڵیکردنی نەوتی کەرکوک، بەعس دروشمی (نەوتی عەرەب بۆ عەرەب)ی زۆر دووبارە دەکردەوە. ئەوەش نیازێکی پلانڕێژی بەعس بووو بەشێك بوو لە سیاسەتی بە عەرەبکردن کە لە هەندێ ناوچەی کوردستاندا گرتبوویە بەر، گرێدانی ئەو دروشمەش بە نەوتی کەرکووکەوە بەلای جوولانەوەی رزگاریخوازی کوردستان، دوورکەوتنەوە بوو لە راستی[٥٤٢]

لە ٣ی تەموزی ١٩٧٢دا قایمقامی شەنگال کە بەعسی بوو کوژرا، لەکاتێکدا فەرمانڕەوایانی بەغدا لە هەلێك دەگەڕان شەڕ دژی کوردو جوولانەوە ئازادیخوازەکەی هەڵگیرسێنن. دەرەنجام، وەزارەتی ناوخۆی عێراق بەیاننامەیەکی دەرکردو تیایدا پەنجەی تۆمەتباری بۆ پارتی دیموکراتی کوردستان کە هیچ پێوەندییەکی بەو رووداوە نەبوو، درێژ کرد. بەهۆی ئەو رووداوەشەوە سوپای عێراق لە ٥ی تەموزدا هێرشێکی سەربازی بە تۆپو فڕۆکە کردە سەر ناوچەی شەنگالو وێرای سووکایەتیکردن بە هاولاتیانی بێتاوان، هەندێ لە ئەندامانی (پ.د.ك)یان کوشت و بەدەیانیشیان لێدەسگیرکردن. هەرچەندە دوای ئەوەش لێژنەیەکی هاوبەش بۆ لێکۆڵینەوە لەو رووداوە پێکهێنرا، بەلام هیچ ئەنجامێکی نەبوو[٥٤٣].

---

(٥٤١) NADER ENTESSAR, Op.Cit, P75

(٥٤٢) "کادر"، ژ(١٦)، ئەیلول ١٩٧٢، ل٢٥.

(٥٤٣) مسعود البارزاني، البارزاني والحركة التحررية الكردية، ج٣، ص٢٦٨؛ حەمید گەوهەری، مێژوونامە، چاپو کۆمپیوتەر: کازم پیرانی، (ب.ش)، ١٩٩٧، ل٤٨.

له ١٥ی تەممووزیشدا، بۆ لەناوبردنی مستەفا بارزانی، پیلانێکی دیکە لەلایەن دەزگای بەڕێوەبەرایەتی ئەمنی عامەی عێراق گێڕدرا، بەڵام ئەو کەسەی کە بۆ ئەنجامدانی راسپێردرابوو، ماوەیەك پێشتر پێوەندیی بە سەرکردایەتی بزووتنەوەی رزگاریخوازی کوردستانەوە کردبوو له ئەنجامدانی پیلانەکە ئاگاداری کردبوونەوە، لەو رۆژەدا گەیشتە بارەگای تایبەتی مستەفا بارزانی و خۆی بەدەستەوەدا. دوابەدوای ئەوەش لێژنەیەکی هاوبەش لە کاربەدەستانی بەعس‌و سەرکردایەتی پارتی دیموکراتی کوردستان‌و حیزبی شیوعی عێراق‌و عەزیز شەریف، بۆ لێکۆڵینەوە لەو هەوڵە پیلانگێڕییە پێکهێنرا، بەڵام رژێمی بەعس هیچ هەنگاوێکی پێویستی بۆ ئەو مەبەستە نەهاویشت تا ساڵی ١٩٧٣ دانیان بەوە دانا کە بۆ لەناوبردنی مستەفا بارزانی، بەڕێوەبەری ئەمنی عامەی عێراق ئەو پیلانەو پیلانی ٢٩ی ئەیلولی ١٩٧١ی رێکخستبوو(٥٤٤). ئەوەش هەر بۆ ئەوەبوو تاوانەکە لەسەرخۆیان لابەرن‌و تەنها بیخەنە ئەستۆی نازم گزاری بەڕێوەبەری ئەمنی عامە، لەبەرئەوەی کاتی دانپێدانانی تاوانەکە، ناوبراو بەهۆی ئەنجامدانی کودەتایەکی سەرنەکەوتوو، دسگیرکرابووو دادگایی دەکرا.

هەر له ساڵی ١٩٧٢دا، هەردوو رۆژنامەی (الثورة)و (التآخي) کە یەکەمیان زمانحاڵی بەعس‌و دووەمیشیان زمانحاڵی پارتی دیموکراتی کوردستان بوو، کەوتبوونە بڵاوکردنەوەی تانەو تەشەرو ئاراستەکردنی وتاری پڕ رەخنە دژی یەکتر. بۆیە عەزیز شەریف کە هەمیشە وەکو ناوبژیوانێك‌بوو لەنێوان هەردوولادا، دوای کۆبوونەوەی لەگەڵ سەرۆك کۆمارو سەدام حسێن و کاربەدەستانی دیکەی

---

(٥٤٤) بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: مسعود البارزاني، البارزاني والحركة التحررية الكردية، ج٣، ص٢٦٨–٢٧٢؛ باوەکر عوبێد ساڵح، س پ، ل١٢٠؛ رۆژنامەی "برایەتی"، ژ(١٠)، ١٩٧٢/٧/٢٧.

ئەو وڵاتە، بەڵێنی لێوەرگرتن بۆ راگرتنی بڵاوکردنەوەی ئەو جۆرە بابەتانە لە رۆژنامەی (الثورة). لە ٢٦ى تەمموزیشدا بروسکەیەکی بەپەلەی ئاراستەی مستەفا بارزانی کرد بۆ وەرگرتنی هەمان هەڵوێست لەلایەن رۆژنامەی (التآخي)ەوە، (مستەفا بارزانی)یش لە هەمان بەرواردا وەڵامی بروسکەکەی (عەزیز شەریف)ی دایەوەو بەڵێنی جێبەجێکردنی داواکارییەکەشی دا [٥٤٥].

جێی ئاماژە پێدانە بەعسییەکان پێیان وابوو، ئەو رەخنانەی لەسەر لاپەڕەی رۆژنامەکانیان بڵاویان دەکردەوە لە بارەی ئاڵۆزی گیروگرفتەکانی پرسی کوردو رەخنەگرتن لە هەڵوێستەکانی پارتی دیموکراتی کوردستان، گرنگی و بایەخێکی زۆری هەبوو بۆ بڵاوکردنەوەی نەریتی دیموکراسییانە [٥٤٦]، بەڵام ئەوە تەنها بۆچوونی سەرکاغەزیان بوو. ئەوان بەهیچ شێوەیەك بیروباوەڕی دیموکراسییانەیان پێ قبوڵ نەدەکراو لە هەردوو سەردەمی فەرمانڕەوایەتیشیاندا، هەوڵی سەپاندنی دەسەڵاتی تاکڕەوانەی خۆیانو لەناوبردنی راستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆی هێزو رێکخراوە سیاسییەکانی دیکەیان داوە.

دوای ئاڵۆزبوونی پێوەندیی نێوان هەردوولا، ٢٣ى ئەیلولی ١٩٧٢ سەرکردایەتی هەرێمایەتی حیزبی بەعس، بۆ روونکردنەوەی هەڵوێستی خۆیان سەبارەت بە بارودۆخی پێوەندیی نێوانیان، یاداشتێکی بۆ کۆمیتەی ناوەندیی پارتی دیموکراتی کوردستان نارد. یاداشتەکە چەندین بابەتی جیاوازی لەخۆگرتبوو، لەوانە دەرخستنی هەڵوێستی هەردوولا بەرانبەر باڵی (برایم ئەحمەد– جەلال تاڵەبانی/"م.س") لە گفتوگۆکانی پێش بەیاننامەی ١١ى مارت و

---

(٥٤٥) بڕوانە: "التآخي"، ع(١٠٩٥)، ٢٧/٧/١٩٧٢.

(٥٤٦) حیزبی بەعسی عەرەبی ئیشتراکی–عێراق، راپۆرتی سیاسیی سەر بەهەشتەمین کۆنگرەی هەرێماتی، ل١٢٢.

نارەزایی دەربڕین بەرانبەر (پ.د.ك) کە بێ ئاگاداری بەعس‌و لەپشت ئەوەوە دوای بەیاننامەی ۱۱ی مارت لەگەڵ باڵی (برایم ئەحمەد - جەلال تاڵەبانی/"م.س") ئاشتبووەوە[٥٤٧] ئەوەش لەلایەکەوە ئەوە نیشان دەدات کە بەعس دژی سەقامگیربوونی ئاشتی بووە لە ناو ریزەکانی کورد، لەلایەکی دیکەشەوە لەرێگەی ئەو هەڵوێستەیانەوە ویستوویانە ناکۆکی لەنێو جووڵانەوەی رزگاریخوازی کوردستان دروست بکەن‌و جارێکی دیکە ئەو جووڵانەوەیە لەتکەن.

هەروەها یاداشتەکەی بەعس چەندین بابەتی دیکەی وەك ئامـاژەکردن بەجێبەجێکردنی هەندێ لە خاڵەکانی بەیاننامەی ۱۱ی مارت و هۆکارەکانی جێبەجێنەکردنی خاڵەکانی دیکەو تۆمەتبارکردنی (پ.د.ك) بە پێکهێنانی دەسەڵاتێکی دیکەی بەرێوەبردن لە عێراقداو ئەنجامدانی کرداری تێکدەرانەی باری ئاسایش‌و کۆسپ دروستکردن لەبەردەم جێبەجێکردنی یاسای چارەسەر کردنی کێشەی زەوی‌و گێرانی رۆڵی پارتێکی ئۆپۆزسیۆن بەرانبەر حوکمەت بۆ پەیداکردنی لایەنگر بۆ خۆی لەسەر حیسابی بەعس، لەخۆگرتبوو. لەپاڵ ئەو رەخنە توندانەش، لە یاداشتەکەی حیزبی بەعسدا، وەکو مەرجێك بۆ ئاسایی بوونەوەی پێوەندیی هەردوولا، ۳۱ خاڵ دەستنیشان کرابوون[٥٤٨] زۆربەی ئەو رەخنانەش کە ئاراستەی جووڵانەوەی رزگاریخوازی کوردستان کرابوون، زیاتر بەمەبەستی لەکەدارکردنی ئەو جووڵانەوەیەو بێبەریکردنی خۆیان بوو لەنائارامیی باری نێوخۆی کوردستان.

---

(٥٤٧) بروانە: منشورات الثورة، لكي يصان السلام وتتعزز الوحدة الوطنية، ص١٥٩-١٦٠.

(٥٤٨) بۆ زانیاریی زیاتر دەربارەی یاداشتەکەی حیزبی بەعس بروانە: منشورات الثورة، لكي يصان السلام وتتعزز الوحدة الوطنية، ص١٥٢-١٨٦.

دوابەدواى ئەوەش لە ٢٨ى تشرینى یەكەمدا، مەكتەبى سیاسیى پارتى دیموكراتى كوردستان بە یاداشتێك وەڵامى یاداشتەكەى حیزبى بەعسى دایەوە، تیایدا ئاماژەى بەوەكردبوو كە یاداشتەكەى بەعس پڕ لە ناوو ناتۆرە دروستكردنە بۆ (پ.د.ك) بەمەبەستى تاوانباركردنو زڕاندنى ناوبانگى، بەگەواهى ناردنى وێنەى یاداشتەكە بۆ چەندین لایەنى ناوخۆو دەرەوە پێش ناردنى بۆ سەركردایەتى جووڵانەوەى رزگاریخوازى كوردستان. هەر لە یاداشتەكەى (پ.د.ك)دا بەشێوەیەكى بابەتییانە ئەو تۆمەتانەى كە بەعس لەمیانى یاداشتەكەیدا خستبوویە پاڵیان، رەتكرابۆوە. هەروەها تیایدا ئاماژەش بەوەكرابوو كە دەسەڵاتى دەوڵەتو رێكخراوو دەزگاكانى بەعس لە كوردستاندا بۆ دۆزینەوەى هەندێ بەكرێگیراوو هەڵخەڵەتاندنى هەندێ خەڵكى ساویلكە، لە هەوڵى زۆرو بەردەوامدان. هەروەها (پ.د.ك) لە یاداشتەكەیدا وەكو نموونە هەندێ لەو تاوانانەیان خستبووە ڕوو كە رژێمى عێراق دواى بەیاننامەى ١١ى مارت ئەنجامى دابوون، لەپاڵ ئەو سیاسەتە نابەجێیەى كە دەرهەق بە خەڵكى كوردستانو جووڵانەوە رزگاریخوازەكەى پیادەیان دەكرد، كە سەرجەمیان پێچەوانەى یاساو مافەكانى مرۆڤ و رێككەوتنى نێوان هەردوولا بوو. هەر لەو یاداشتەدا باس لە خاڵە جێبەجێكراوو نەكراوەكانى بەیاننامەى ١١ى مارت كرابوو، لەو ڕووەشەوە بۆچوونەكانیان لەگەڵ بەعس جیاواز بوو. دەربارەى ئەو مەرجانەش كە لە یاداشتەكەى بەعسدا هاتبوو بۆ ئاسایى بوونەوەى پێوەندیى هەردوولا، سەركردایەتى (پ.د.ك) پێى وابوو كە هەندێ لەو مەرجانە گشتینو پێویستە هەردوولا پابەندیانبن، ئەوانى دیكەش تایبەتن بە (پ.د.ك)و پابەندبوونو نەبوونى تەنها پێوەندیى بەوانەوە هەیە. لە كۆتایى یاداشتەكەشیاندا، سەركردایەتى پارتى دیموكراتى كوردستان لەمیانى دوو بەشدا چەند خاڵێكیان بۆ بەعس پێشنیار

کردبوو تاکو جێبەجێی بکەن، کە خاڵەکانی بەشی یەکەم پێوەندیی بە چارەسەری ئاڵۆزی بارودۆخەکەو ئاسایی بوونەوەی هەبوو، خاڵەکانی بەشی دووەمیش پێوەندیدار بوون بەجێبەجێکردنی ئەو بڕگانەی بەیاننامەی ١١ی مارت کە کاتی جێبەجێکردنیان هاتبوو[٥٤٩]

ئاڵۆزیی بارودۆخ بەردەوام بوو. لە مانگی مارتی ساڵی ١٩٧٢دا، فەرمانڕەوایانی بەعس، داوایان لە مستەفا بارزانی کرد، (مەسعود)ی کوڕی بۆ وتووێژ بنێرێتە بەغدا[٥٥٠]. بە بۆچوونی کریس کۆچێرا[*]، ئەو سەردەمە ئیدریس بارزانی لەلایەن بەعسەوە تاوانبار کرابوو کە نابێ بۆ گفتوگۆ بچێتە بەغدا، لەبەرئەوە مەسعود بارزانییان لەبەرچاو گرتبوو[٥٥١]، بەڵام بەگوتەی مەسعود بارزانی ئەو بۆچوونە هیچ بنەمایەکی راستی تێدا نیە[٥٥٢].

سەرکردایەتی کورد، داواکەی دەسەڵاتدارانی عێراقیان بۆ ناردنی مەسعود بارزانی رەتکردەوە[٥٥٣]، وادیارە لەوە گەیشتبوون دەسەڵاتدارانی بەعس نیازپاک نەبوون و نەك هەر ئامادەی دانان و دۆزینەوی میکانیزمی چارەسەرکردنی کێشەکان

---

(٥٤٩) بۆ زانیاریی زیاتر دەربارەی یاداشتەکەی پارتی دیموکراتی کوردستان بڕوانە: منشورات دار التاخي، في سبيل السلم والوحدة الوطنية، ص١٣٥–١٩٣.

(٥٥٠) پارتی دیموکراتی کوردستان/ کۆمیتەی ئامادەکردن، هەڵسەنگاندنی رەوش و هەرەسهێنانی شۆڕشی کورد (دەرس و پەندەکانی)، لە بڵاوکراوەکانی ئاڵای ئازادی، ١٩٩٨، ل٢٣.

(*) کریس کۆچێرا ناوی ئەسڵی خۆی (مۆبیك)ە، کە رۆژنامەنووسێکی فەرەنسییەو ژنەکەشی وێنەگرێکی رۆژنامەنووسیی ناسراوەو چەند جارێك هاتوونەتە کوردستان و بەغدا.

(٥٥١) کریس کۆچێرا، س پ، ل٤٤٠.

(٥٥٢) دیدار لەگەڵ مەسعود بارزانی، هاوینەهەواری سەری رەش، ٢٢/٦/٢٠٠٣.

(٥٥٣) بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: کریس کۆچێرا، س پ، ل٤٤٠.

نـــەبوون، بـــەڵکو ئامـــادەش نـــەبوون دەســـت لـــەو سیاســـەتە شـــەڕانگێزو ڕەگەزپەرستییەی کـە بەتایبـەتی دوای بەیاننامـەی ١١ی مـارت گرتبوویانەبـەر، هەڵگرن.

سەدام حسێن دوای ئەوەی لەچوونی مەسعود بارزانی بۆ بەغدا نائومێد بـوو، لـە پـەیامێکی هەڕەشـە ئـامێزدا مـستەفا بـارزانی ئاگـادار کـردەوە کـە پێویـستە جووڵانەوەی ڕزگاریخوازی کوردستان هەڵوێستێك وەرنەگرێت حوکمەت ناچار بکات بەرانبەر بەوەی دەسەڵاتدارانی ئێران واز لە یارمەتیدانی جووڵانەوەی ئازادیخوازی کوردستان بێنن، لە شەتولعەرەبو چەند ناوچەیەکی دیکـەی عێـراق، تـەنازول بـۆ ئێران بکات[٥٥٤].

هەر لە سەرەتای ساڵی ١٩٧٣دا، سەرۆکی پۆلیسی هەولێر (حسێن شـێروانی) کە دەیویست بۆ سەردانی خزمەکانی سەر لە بەغدا بدات، لەلایەن ڕژێمی بەعسەوە شـــوێنبزرکراو دواتـــر لاشـــە خوێناوییەکـــەی کـــە زۆر بێبەزەییانـــەو نامرۆڤانـــە شێوێندرابوو، دۆزرایەوە[٥٥٥]. لە هەردوو مانگی شوباتو مارتیـشدا، ڕژێمـی عێـراق چەندین کاری تێکدەرانەی دەرهەق بە پارتی دیموکراتی کوردسـتان و گـەلی کـورد لە ناوچە جیاجیاکانی کوردستان ئەنجامـدا وەکـو دەسـتدرێژیکردنە سـەر خـەڵكو بەعەرەبکردنو بەبەعسیکردنیان[٥٥٦]

فـشاری بـەعس ڕێکخـراوە پیشەییەکانیـشی گرتـەوە، گەرچـی بـەگوێرەی بەیاننامەی ١١ی مارت ئەو ڕێکخراوانە مـافی یاسـایی کارکردنیـان وەرگرتبـوو، بـۆ نموونـە لـە شـارەکانی بەغـداو کـەرکووكو موسـڵو خانـەقین، دوای ئـەوەی فەرمانڕەوایانی عێراق هەستیان بـە ڕۆڵـی کـاراو کاریگـەریی ڕێکخـراوی قوتابیـانی

---

(٥٥٤) پارتی دیموکراتی کوردستان/ کۆمیتەی ئامادەکردن، س پ، ل٢٣.

(٥٥٥) کریس کۆچیرا، س پ، ل٤٣٩-٤٤٠.

(٥٥٦) بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: "دەنگوباسی کوردستان"، ژ(١٣)، ناوەراستی نیسان ١٩٧٣.

کورد کرد، فشاریان خستە سەر ئەو قوتابیانەی کە ئەندامی رێکخراوەکە بوون. هەر بۆیەش لە شوبات و مارتی ١٩٧٣ بەدواوە بەردەوام کێشەو گرفتیان بۆ ئەو رێکخراوە دروست دەکرد[٥٥٧]

بێگومان هیچ بەهایەکیش، رژێمی بەعس لەو شوێنانەی مەبەستی بوو خانووی تێکۆشەرانی کوردی خاپوور دەکردو بەشێوەیەکی ناپاسایش دەسگیری دەکردن[٥٥٨] و لە زیندانیشدا بەشێوەیەکی توندوتیژانە ئەو تێکۆشەرانەیان ئەشکەنجە دەدا[٥٥٩]

هەروەها باندی چەکدارییش لەلایەن بەعسەوە بۆ ئەنجامدانی کاری تێکدەرانەو تیرۆرکردنی هەندێ لە لێپرسراوانی (پ.د.ك)، دانرابوون. کاتێکیش پێشمەرگەکانی کوردستان ئەو باندانەیان ئاشکرا دەکرد، لەڕوانگەی دڵسۆزییان بۆ پاراستنی بەرژەوەندی گشتیی و لەترسی ئاڵۆزنەکردنی بارودۆخەکەو پابەندبوونیان بە رێنمایی سەرکردایەتییەکەیان، هیچ کارێکیان دەرهەق بەو تاوانبارانە ئەنجام نەدەدا، بەڵکو تەنها سەرکردایەتی جووڵانەوەی رزگاریخوازی کوردستانیان ئاگادار دەکردەوە، تاکو ئەوان بۆ دانانی سنوورێك بۆ ئەو کردارە دوژمنکارییانە، رژێمی بەغدا ئاگادار بکەنەوە[٥٦٠] دەبێ ئەوەش بگوترێت، بەڕێوەبەرایەتی ئەمنی عامەی عێراق، بە مەبەستی کاری تێکدەرانە لە کوردستاندا، پسوولەی تایبەتی رێپێدانی چەك هەڵگرتنی بۆ کەسانی سەر بەباندەکانیان دروستکرد بوو[٥٦١]

(٥٥٧) ساسان عەونی، س پ، ل٦٤.

(٥٥٨) بۆ نموونە بڕوانە: پاشکۆی ژ(٦).

(٥٥٩) بۆ نموونە بڕوانە: پاشکۆی ژ(٧).

(٥٦٠) بڕوانە: پاشکۆی ژ(٨).

(٥٦١) بڕوانە: پاشکۆی ژ(٩).

هەرچەندە کاربەدەستانی باڵای بەعس لە بۆنە فەرمییەکاندا، پابەندبوونی خۆیان بە جێبەجێکردنی زووتری بەیاننامەی ١١ی مارت و چارەسەرکردنی کێشەی کورد دەردەبڕی، بۆ نموونە بەبۆنەی ١ی ئایاری جەژنی کرێکارانی جیهانەوە،ساڵی ١٩٧٣ سەرۆك کۆمار لەمیانی وتارێکدا گوتی: "جێبەجێکردنی ئۆتۆنۆمی پێش ١١ی مارتی ساڵی ١٩٧٤ بەدیهێنانی ئەو بەندانەی لە بەیاننامەی ١١ی مارت ماونەتەوە لەگەڵ پاراستن‌و راگیرکردنی مافی رۆشنبیری و ئیداری کەمایەتییە براکانی وولات لەسەروو ئەو ئەرکانە دابنێن کە کەوتۆتە سەرشانمان"[٥٦٢]، بەڵام ئەوانە تەنها قسەبوون بۆ مەبەستی چەواشەکردنی رای گشتی ناوخۆو دەرەوەی عێراق بەکاردەهێنران‌و نەدەخرانە بواری پراکتیکەوە.

لەگەڵ ئەوەشدا مستەفا بارزانی ١٠ی ئایار، لە نامەیەکیدا بۆ سەرۆك کۆماری عێراق، رێزی لە هەڵوێستی جەختکردنی لەسەر ئەو بابەتانە گرت‌و تەواوی ئامادەیی جووڵانەوەی رزگاریخوازی کوردستانیشی نیشاندا، بۆ هاوکاریکردنی هەر کارێك کە خزمەت بە گەل‌و وڵات بگەیەنێت[٥٦٣].

سیاسەتی بەعەرەبکردنی ناوچەکانی کوردستانیش کە لەلایەن رژێمی بەعسەوە پەیڕەو دەکرا، لەو سەردەمەدا زیاتر برەوی پێدرا، ئەمەش فاکتەرێکی سەرەکی گیروگرفتەکانی نێوان ئەو رژێمەو سەرکردایەتی جووڵانەوەی رزگاریخوازی کوردستان بوو. هەر بۆیە بەشی پەخش‌و راگەیاندن لە مەکتەبی سیاسیی پارتی دیموکراتی کوردستان، لە ١ی حوزەیرانی ١٩٧٣دا، بڵاوکراوەیەکی بەناونیشانی (بەعەرەبکردن کۆسپێکی زلە لەرێ ی جێبەجێکردنی پەیمانی ئازاردا)، بڵاوکردەوە. تیایدا لە روانگەی هەستکردن بەمەترسی سیاسەتی

---

(٥٦٢) بڕوانە: "هاوکاری"، ژ(١٦٥)، ١٩٧٣/٥/٤.

(٥٦٣) بڕوانە: مسعود البارزاني، البارزاني والحركة التحررية الكردية، ج٣، ص٨٤٤.

بەعەرەبکردنو بەبەعسیکردن، داوای لەهێزە نیشتمانییەکان کرد، دژی ئەو سیاستە بوەستن. داواشی لە نوێنەرنی رای گشتی عێراقو عەرەبو جیهانیو میدیاکان کرد رووبکەنە کوردستان، تاکو بە چاوی خۆیان ئەو باردۆخە ببینن‌و چەند نموونەیەکیشی لەو سیاسەتە خستبووە ڕوو[٥٦٤]

لە گۆشەی هەستکردن بە بەرپرسیارێتی مێژوویی بەرانبەر ولاتەکەی، لە ٢٨ی حوزیرانی ١٩٧٣، مستەفا بارزانی نامەیەکی بۆ ئەحمەد حەسەن بەکر نارد، تیایدا ئەوەی دووپات کردەوە: کە تاکە وەلامێك بۆ بەرەنگاربوونی ئەو مەترسییانەی رووبیان لە ولاتو ناوچەکە کردبوو، خۆی لەپتەوکردنی یەکێتی نیشتمانییدا دەبینێتەوە، لەرێگەی جێبەجێکردنی تەواوی بەیاننامەی ١١ی مارت[٥٦٥].

لە ٤ی تەممووزیشدا، سەرۆك کۆمار بەنامەیەك وەلامی مستەفا بارزانی دایەوە، تیایدا وێڕای رێزنیشاندانی خۆی بەرانبەر ناوەرۆکی نامەکەی، ئاماژەی بەوەکردبوو کە گفتوگۆکانی نێوان هەردوولا بە بەشداری لایەنە نیشتمانییەکانی دیکە، ئەنجامێکی پۆزەتیفو روونو یەکلاکەرەوەی نەبووە[٥٦٦] ئەوەش رەتکردنەوەیەکی ئاشکراو راستەوخۆی ملدانیان بوو بۆ ئاشتیو ئامادەییان بۆ نەهێشتنی کۆسپو تەگەرەکانی بەردەم جێبەجێکردنی بەیاننامەی ١١ی مارت. فاکتەری سەرەکی ئەو هەلوێستانەی بەعسیش لەوەوە سەرچاوەی گرتبوو، کە لەسەر ئاستی ناوخۆدا ئەوکاتە لەگەڵ حیزبی شیوعی عێراق دانوستانەکانیان گەرم بووو ئاسۆی رێککەوتنی نێوان هەردوولا دەرکەوتبوو. لەسەر ئاستی

---

(٥٦٤) بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: پاشکۆی ژ(١٠).

(٥٦٥) بڕوانە: مسعود البارزاني، البارزاني والحركة التحررية الكردية، ج٣، ص٨٤٨.

(٥٦٦) هـ س، ل٨٤٩–٨٥٠.

دەرەوەش، بەتایبەتی دوای بەستنی پەیماننامەی دۆستایەتیی‌و هاوکاریی لەگەڵ یەکێتی سۆڤیەت لەساڵی ١٩٧٢دا، پشتگیرییەکی گەورەی دەسەڵاتو ڕژێمە فەرمانڕەوایەکەیان بەدەستهێنا بوو.

ئەگەر چی نوێنەرانی پارتی دیموکراتی کوردستان، بۆ پێکهێنانی بەرەیەکی نیشتمانیی، لە زۆربەی گفتوگۆکانی لەگەڵ بەعس‌و حیزبی شیوعی بەشدار بوون، کەچی بەهۆی پێشنیاری بەعس‌و (ح.ش.ع) بۆ پچڕاندنی پێوەندییەکانی جووڵانەوەی رزگاریخوازی کوردستان لەگەڵ حوکمەتی ئێران، گفتوگۆی نێوان (پ.د.ك)و بەعس وەستا، لەبەرئەوەی سەرکردایەتی کورد، پێشنیارەکەیانی رەتکردەوە. دەرەنجام لە شەوی ١٧ی تەمموزی ١٩٧٣دا، بەیاننامەیەکی دووقۆڵی لەنێوان حیزبی بەعس‌و حیزبی شیوعی مۆرکرا، دەرگاش بۆ پارتەکانی دیکە، بەتایبەتی (پ.د.ك) والآ کرا[٥٦٧]

دوای ئەوەش، پارتی دیموکراتی کوردستان بەو بۆنەیەوە بەیاننامەیەکی دەرکرد، تیایدا ئاشکرایکرد کە بە هیچ شێوەیەك تا رۆژی بڵاوکردنەوەی ئاگاداری ئەو رێککەوتنە نەبووە. دەربارەی چوونیشی بۆ نێو ئەو بەرەیە چەند خاڵێکی چارەسازی بۆ حوکمەتی عێراق دەستنیشان کرد، تاکو بەشداریکردنیان لەو بەرەیەدا ببێتە ئامرازێکی کاریگەر بۆ پشتگیری‌و پتەوبوونی لە پاشەڕۆژدا. ئەو خاڵانەش بریتی بوون لە ئەنجامدانی سەرژمێرییەك بۆ دیاریکردنی سنووری ناوچەی ئۆتۆنۆمی و سڕینەوەی شوێنەواری سیاسەتی بەعەرەبکردن‌و چۆنیەتی دارشتنی یاسای ئۆتۆنۆمی‌و دیاریکردنی هەڵوێستی بەعس دەربارەی ئەو سەرنجانەی (پ.د.ك) سەبارەت بەپەیمانی کاری نیشتمانیی، لە بیرخەرەوەکەی

---

(٥٦٧) بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: د.مكرم الطالباني، نحو حل صحيح للمسألة القومية الكردية في العراق، ص٢٨١و ٢٨٥–٢٨٦و ٣٠٤–٣٠٥.

١١ی کانوونی دووەمی ١٩٧٢ دەربڕیبوو. دواخالّی بەیاننامەکەش داوای کۆتایی هێنان بوو بەماوەی گواستنەوەی جێبەجێکردنی هەڵبژاردنێکی ئازاد لەسەرانسەری عێراقدا دوای تێپەر بوونی ساڵێك بەسەر بەشداریکردنیان لەبەرەدا[٥٦٨]. ئەو هەڵوێستو پێشنیارانەی پارتی دیموکراتی کوردستان کە زۆر دروستو واقیعی بوون بۆ چوونە نێوبەرە، لەلایەن بەعسەوە پشتگوێ خران.

رژێمی عێراق سەرەڕای رەتکرنەوەی هەموو پێشنیارێکی سەرکردایەتی جووڵانەوەی رزگاریخوازی کوردستان، بەردەوام بوو لە درێژەپێدانی کوشتنو برینو وێرانکردنو بەعەرەبکردنی ناوچەکانی کوردستان. هەر لە درێژەی ئەو سیاسەتەشیدا، مانگی ئاب بە هاوکاری هەندێ بەکرێگیراوی کورد، چەند هێرشێکی سوپاییان کردە سەر ناوچەی شەنگالو چەندین دێهاتی ئەو ناوچەیان سووتاندو ژمارەیەکی زۆری خەڵکی سیڤیلیان کوشتو بریندارکرد. لەبەرانبەر ئەو سیاسەتەشدا، مەکتەبی سیاسیی پارتی دیموکراتی کوردستان لە ٢٢ی ئابی ١٩٧٣، بروسکەیەکی ئاراستەی لقەکانی حزبی کرد، تیایدا وێڕای دەربڕینی نارەزایی توند، بڕیاریدا رۆژی ٢٥ی ئاب بۆ ماوەی ٢٤ کاتژمێر لە هەموو کوردستان مانگرتن ئەنجام بدەن[٥٦٩].

لەپێناو زەقکردنەوەی ئەو سیاسەتەی رژێمی بەعس، بۆ رای گشتی جیهانیی، بەتایبەتی لەرووی گۆڕینی پێکهاتەی نەتەوەیی و پشتگوێخستنی پەرەپێدانی ناوچەکانی کوردستانو هەوڵدانی بۆ لاوازکردنی رۆڵی جووڵانەوەی رزگاریخوازی کوردو پارتی دیموکراتی کوردستان لە ژیانی سیاسییدا، مستەفا بارزانی نامەیەکی ئاراستەی کۆنگرەی وڵاتانی بێلایەن کرد کە مانگی ئاب لە

---

(٥٦٨) بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: "دەنگوباسی کوردستان"، ژ(١٧)، ئاب ١٩٧٣.

(٥٦٩) بڕوانە: پاشکۆی ژ(١١).

جەزائیر بەسترا، داوای لێکردن گرنگی بەو پرسە بدەن‌و تواناو کاریگەریی خۆیان بۆ پاڵپشتیکردنی ئاواتەکانی گەلی کورد لە شادبونیان بە ئۆتۆنۆمی بەکار بهێنن[٥٧٠].

لە ١٨ى ئەیلولیشدا سوپای عێراق بە مەبەستی دەرخستنی توانای هێزی سەربازیی دوو هێرشی کردە سەر ناوچەکانی شێخان‌و دەربەندیخان‌و هەردوو ناوچەکەی داگیرکردەوە، بەڵام دواتر بەهۆی مەترسی و ئامادەکاریی بۆ شەڕی (عەرەب–ئیسرائیل) کە ٦ى تشرینی یەکەمی ١٩٧٣ ڕوویدا، هێزەکانی لەو ناوچانەی کوردستان کێشاوەو هێزی پێشمەرگەی کوردستانیش ناوچەکانیان خستەوە ژێر دەسەڵاتی خۆیان[٥٧١]

سیاسەتی شەڕانگێزی بەرانبەر کوردستان هێندەی دیکە مستەفا بارزانی بەرانبەر بەعس بێئومێد کرد. ئەوەبوو لە تشرینی یەکەم لە دیمانەی رۆژنامەنووسێکی بیانیدا، گوتی: "پێم وانیە بە ئاشتی بگەینە ئۆتۆنۆمی لەبەرهۆیەکی زۆر سادە، ئەویش ئەوەیە کە حوکمەتی عێراق لە خەونیشدا بیر لەوە ناکاتەوە ئۆتۆنۆمی راستەقینەو تەواومان بداتێ. کە حوکمەت ناچار دەبێت گفتوگۆمان لەگەڵدا بکات بەمەبەستی ئەوەیە لەم ناوچە تەسکەدا گەمارۆمان بدات کە ئێستا بە زەبری چەك بەرگری لێدەکەین، بەڵام ئەم ناوچەیە تەنیا بەشێکی بچووکی کوردستانە چونکە کوردستان خانەقین‌و کەرکووك‌و دەوروبەری موسڵیش دەگرێتەوە. ئێمە دەست لەو ناوچانە هەڵناگرین هەرچییەك ڕوویدات، چونکە خۆمان بە بەرپرس دەزانین بەرانبەر بەو کوردانەی لەو ناوچانەدا دەژین بەهەمان

---

(٥٧٠) بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: "الکادر"، ع(٢٠)، تشرین الثاني ١٩٧٣، ص١٧–٢٠

(٥٧١) ئیبراهیم جەلال، س پ، ل٢٥٨.

ئەنـدازەی کـە لەبـەردەم مێـژووی گەلەکـەمان هەسـت بـە بەرپرسـیارێتی دەکەین"[572]

هەروەها بەهۆی ئەو دژایەتییە ناڕەواو دەسگیرکردنو هەڕەشەو گوڕەشانەی کە لەلایەن چەند دامودەزگایەکی رژێمی بەعس بەتایبەتی ئـەمنی عامـە، دەرهـەق بـە ئەنـدامانی یـەکێتی قوتابیـانی کوردسـتان و کەسـوکاریان لـە هەنـدێ ناوچـەی کوردستان، بەتایبەتی لە شاری کـەرکووك ئـەنجام دەدرا، مەکتـەبی سـکرتاریەتی یەکێتی قوتابیانی کوردستان لە مانگی کانونی یەکەمی ١٩٧٣دا روونکردنەوەیەکی ئاراسـتەی هـەر سـێ وەزیـری نـاوخۆو کاروبـاری ژوورو پـەروەردەی عێـراقو بەڕێوەبەری ئەمنی عامەو مەکتەبی تەنفیزی یەکێتی نیشتمانیی قوتابیـانی عێـراق کرد، تیایدا وێڕای ئاماژەکردنی بەوەی کە ئـەو کارانـە دەبنـە هـۆی پەرەسـەندنی ناکۆکی سیاسیی لەو ناوچانەدا، داواشـیان کـرد بـەزووترین کـات چارەسـەری ئـەو پرسە بکەن[573].

بـەهۆی بـارگرژی نێـوان هـەردوولاو هـەوڵی بـەعس بـۆ تـەواو گۆشـەگیرو فەرامۆشکردنی رۆڵی پـارتی دیمـوکراتی کوردسـتان لەسـەر گۆڕەپـانی سیاسـییو خۆئامـادەکردنی بـۆ لەیـەکتر دابڕینــی سـەرکردایەتی جووڵانـەوەی رزگـاریخوازی کوردسـتانو کێـشەی رەوای نەتـەوەی کـوردو چارەسـەرکردنی ئـەو کێـشەیە بەبۆچـوونی بەرتەسـکو رەگەزپەرسـتانەی خـۆی، بـەدەر لـەو جووڵانـەوە رزگـاریخوازەو دواتـریش سـەرکوتو لـەناوبردنی جووڵانەوەکـە، (ئەنجومـەنی سەرکردایەتی شـۆڕش)ی عێـراق لـە کۆبوونـەوەی ٣١ی کـانوونی دووەم ١٩٧٤یـدا بڕیاریـدا بـە هەڵوەشـاندنەوەی لێژنـەی ئاشـتی و پێکهێنـانی لێژنەیـەکی بـالا بـۆ

(٥٧٢) د.گۆینتەر دێشنەر، س پ، ل٢٢٦.

(٥٧٣) بڕوانە: رۆژنامەی "برایەتی"، ژ(٨١)، ١٩٧٣/١٢/٢١.

کاروباری کوردستان، بە سەرۆکایەتی سەدام حسێن‌و ئەندامێتی (٨) کەسانی دیکەی سەرکردایەتی بەعس[٥٧٤]. لە ٢٤ی شوباتیشدا، ئەنجومەنی ناوبراو بڕیارێکی دەرکردو تیایدا روونیکردەوە کە هەر رێکخراوێکی سیاسیی بەشداری لە (بەرەی نیشتمانیی پێشکەوتنخواز) نەکات، قەدەغە دەکرێت[٥٧٥] ئەو بڕیارەش لەلایەکەوە پێچەوانەی ئازادییە سیاسیی و دیموکراسییەکان‌و لەلایەکی دیکەشەوە فشارێکی گەورەی بەعس بوو بۆ سەر تەواوی هێزە سیاسییەکان، بەتایبەتی پارتی دیموکراتی کوردستان، تاکو بیانخاتە ژێر رکێف‌و سەرکردایەتی خۆی‌و بۆ مەرامە تایبەت‌و نارەواکانی بەکاریان بێنێت.

بەو چەشنە گفتوگۆی نێوان سەرکردایەتی جووڵانەوەی رزگاریخوازی کوردستان‌و رژێمی بەعس، بەتایبەتی دوای چوونی ئیدریس بارزانی‌و شاندی باڵای کوردی بۆ بەغداو سازدانی کۆبوونەوەیەکی بێئەنجام لە مارتی ١٩٧٤دا لەگەڵ سەدام حسێن، گەیشتە رێگایەکی داخراو. لەو کۆبوونەوەیەدا سەدام گوتبووی: ناچارمان مەکەن لەسەر شەتولعەرەب تەنازول بۆ شای ئێران بکەین، ئەگەر ئەوەش روویدا ئەوا ئێوە نرخەکەی دەدەن[٥٧٦] ئەو ئاگادار کردنەوەیەش هەڕەشەیەکی گەورەبوو دژی کورد.

دوای تێپەڕبوونی ساڵێکیش بەسەر راگەیاندنی یاسا ئۆتۆنۆمیەکەی (ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش)ی عێراق‌و دەسپێکردنەوەی شەڕی نێوان

---

(٥٧٤) سەبارەت بەو بڕیارە بڕوانە: الجمهورية العراقية، القرارات العامة لمجلس قيادة الثورة (١٩٦٨–١٩٧٧)، المجلد الاول، ص٦١٠.

(٥٧٥) هـ س، ل٣٩٢.

(٥٧٦) بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: حبيب محمد كريم، تاريخ الحزب الديمقراطي الكوردستاني–العراق، ص١٣٨–١٣٩.

هێزەکانی پێشمەرگەو سوپای عێراق، سەدام بەڵێنەکەی خۆی بەجێهێناو ٦ی مارتی ١٩٧٥، لە رێککەوتننامەی جەزائیر، تەنازولی بۆ رژێمی ئێران کرد. لە ئاکامیشدا شۆڕشی رزگاریخوازی کوردستان دووچاری نسکۆ بوو[٥٧٧]

لێرەدا دەبێ ئەوەش بگووترێ هەرچەندە رژێمی بەعس لەسەرەتاوە بەتاکتیك و مەبەستی پیلانگێڕیی دژی کوردو لەناوبردنی شۆڕشە رزگاریخوازەکەی بۆ دانوستان هاتبووە پێشەوەو دواتریش تێکچوونی بارودۆخەکە لە ساڵی ١٩٧٤دا هەر لە ئەستۆی ئەودابوو، بەڵام سەرکردایەتی پارتی دیموکراتی کوردستانیش ئەو سەردەمە وەك پێویست لەئاست ئەو بەرپرسیارێتییە مێژوویی و نەتەوەییەدا نەبوو کە کەوتبووە سەرشانی، تا بتوانێ سەرکەوتووانە مامەڵە لەگەڵ گۆڕانکارییە سیاسییە ناوخۆییەکان و بارودۆخی نێودەوڵەتی ئەو سەردەمەدا، بکات. نەشیتوانیبوو لە هەمبەر پێوەندییە ناوخۆیی و دەرەکییەکانیدا هاوسەنگییەکی ئەوتۆ رابگرێت و گەرەنتیش بۆ دوارۆژی سیاسیی کورد مسۆگەر بکات.

سەرکردایەتی کاتی پارتی دیموکراتی کوردستانیش دوای نسکۆی شۆڕش بەشێوەیەکی واقیعیانە لە هەڵسەنگاندنی بۆ بارودۆخی ناوخۆی ئەو سەردەمە دەڵێت: "لەو ئاهەنگانەی کە گێڕران بە بۆنەی پەیمانی مارتەوە مانگێکی تەواوی خایاند، ئیتر لەخۆبایی بوون کەوتە ناو سەرکردەو ریزەکانی پارتی یەوە،

---

(٥٧٧) بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: هـ س، ل١٣٨-١٣٩. شایانی باسە دوای رێککەوتننامەی جەزائیر لەلایەن چەند کەسانێکەوە هەوڵدرا حوکمەتی بەعس لەو رێککەوتنەیان لەگەڵ ئێران پەشیمان بکەنەوەو شەڕو کوشتاریش بەرانبەر نەتەوەی کورد رابگرن، وەکو ئەو هەوڵەی لەلایەن (فوئاد عارف)ەوە درا، بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: پاشکۆی ژ(١٢)، بەڵام لەبەرئەوەی پیلانەکە نێودەوڵەتی بوو و دەستی وڵاتانی دیکەشی تێدابوو، بۆیە گوێ بەو هەوڵانە نەدرا.

مەترسی و هۆشیاری بەتەواوەتی لەبیربرایەوە، بەڵام دەبێ ئەوەش بڵێین کە بارزانی هەمیشە دووپاتی دەکردەوە کە ئەو قۆناغە زیاتر لە قۆناغی شەڕ هۆشیاری پێدەوێت، ئیتر ئەوەبوو کەوتینە ناو قۆناغێکی تازەوە بێ ئەوەی کە هیچ خۆمان بۆ ئامادەکردبێت و پلان و نەخشەمان بۆ دانابێت"[٥٧٨]

هەروەها ئەو سەردەمە زۆربەی لێپرسراوانی کورد کەوتبوونە هەڵپەی بەدەستهێنانی پلەوپایەی حوکومی و خەریکی بازرگانی و پێکەوەنانی سەروەت و سامان بوون بێئەوەی چاودێرییان بەسەرەوە بێت[٥٧٩]. رژێمی عێراقیش ئەوەی قۆستبۆوەو توانیبووی لەژێرەوە پێوەندیی بەچەند ئەندامێکی سەرکردایەتی (پ.د.ك) بکات و بۆ بەرژەوەندی و مەرامەکانی خۆی بەکاریان بهێنێ. دواتریش ژمارەیەك لەو کەسانە بڕیاری خۆیاندا بۆ چوونە پاڵ حوکمەتی بەعس[*].

جێی ئاماژەپێدانە ئەو سەردەمە لە ریزەکانی جووڵانەوەی کوردایەتی کەسانی واهەبوون کە لەرێگەی جووڵانەوەی رزگاریخوازی کوردستانەوە دوای بەیاننامەی ١١ی مارت پۆستی کارگێڕی بەرزیان لە حوکمەتی عێراقدا وەرگرتبوو، کەچی لەپێناو بەرژەوەندی تەسك و تایبەتی خۆیان، دوای کردەوە نابەجێ و

---

(٥٧٨) پارتی دیموکراتی کوردستان (سەرکردایەتی کاتی)، س پ، ل٦١.

(٥٧٩) الاتحاد الديمقراطي الكردستاني اللجنة التأسيسية، س پ، ل٦١.

(*) لەوانەش عەزیز ئاکرەیی و هاشم ئاکرەیی و ئیسماعیل مەلا عەزیز بوون کە یەکەمیان ئەندامی مەکتەبی سیاسیی و دووانەکەی تریش ئەندامی کۆمیتەی ناوەندیی پارتی دیموکراتی کوردستان بوون و ساڵی ١٩٧٢ بڕیاریاندا بچنە پاڵ حوکمەتی بەعس بڕوانە: محەمەد مەلا قادر، س پ، ل٧٢.

پیلانگێڕییەکانی بەعسیش، دەیانگوت: ئێمە بەکەمترین شت رازین ئەگەر بارودۆخەکە هەرواش بمێنێتەوە[(٥٨٠)]

لەسەر ئاستی دەرەوەشدا، سەرکردایەتی جوولانەوەی رزگاریخوازی کوردستان لەیەك کاتدا پێوەندیی سیاسیی لەگەڵ چەندین وڵاتی رۆژهەڵاتی و رۆژئاوایی خاوەن بەرژەوەندی جیاوازو تەنانەت بیروباوەڕی دژ بەیەکتردا هەبوو، کە ئەم پێوەندییانەش هەم رژێمی عێراقی نارەحەت کرد، هەم خۆشیان نەیانتوانی هیچ سەرکەوتنێکی سیاسیی بۆ کوردستان پێ مسۆگەر بکەن.

(٥٨٠) دیدار لەگەڵ محەمەد عەزیز، هەولێر، ٢٠٠٤/٩/٣.

## تەوەری سێیەم:

# کێشەو گفتوگۆکانی پرۆژەی یاسای ئۆتۆنۆمیی

هەروەك پێشتریش ئاماژەمان پێکرد، بەپێی رێککەوتنی نێوان سەرکردایەتی جوولانەوەی رزگاریخوازی کوردستان و رژێمی بەعس، ماوەی ٤ ساڵ دانرابوو بۆ جێبەجێکردنی خاڵەکانی بەیاننامەی ١١ی مارت(*)، بۆیە دەبوایە دوای تەواوبوونی ئەو چوار ساڵە یاسای ئۆتۆنۆمی بۆ کوردستان بڕیاربدرێ.

لەسەر ئەو زەمینەیە، پارتی دیموکراتی کوردستان، لەسەر پێشنیاری دەسەڵاتدارانی عێراق، لە ٩ی مارتی ١٩٧٣ رەشنووسی پرۆژەی ئۆتۆنۆمی پێشکەشکرد. بەڵام ئەوان، بەو بەبیانووەی پرۆژەیەکی توندڕەوو بنبەستە، رازینەبوون ببێتە بنەمایەك بۆ گفتوگۆ(٥٨١).

هەرچەندە پرۆژەکە بەهۆی دەستنیشاننەکردن و ناونەهێنانی "هەرێم" کە توخمێکی سەرەکی ئۆتۆنۆمییە(٥٨٢)، کەموکورییەکی بەرچاوی لەخۆگرتبوو، کە دووبارەی کەموکوڕیی ناوەڕۆکی بەیاننامەی ١١ی مارت بوو و دواتریش بووە پرسێکی چارەسەرنەکراوی نێوان سەرکردایەتیی جوولانەوەی رزگاریخوازی کوردستانو بەعس، بەڵام دەبێ ئەو راستییەش بگوترێ کە پرۆژەکە بە

(*) بگەڕێوە بۆ تەوەری چوارەمی بەشی یەکەمی باسەکەمان.

(٥٨١) مسعود البارزاني، البارزاني والحركة التحررية الكردية، ج٣، ص٣٠٨.

(٥٨٢) ناوەڕۆکی ئۆتۆنۆمی سێ توخمی سەرەکی دەگرێتەخۆ: یەکەم- بوونی هەرێمێکی دیاریکراو کە دامەزراوە کارگێڕییەکانی ئۆتۆنۆمی تیایدا دەسەڵات دار بن. دووەم- سەربەخۆیی دەزگاکانی ئۆتۆنۆمی. سێیەم- چاودێریکردنی دەزگاکانی ئۆتۆنۆمی لەلایەن دەسەڵاتی ناوەند. بڕوانە: د. محمد هماوەند، الفدرالية والحكم الذاتي، ص١٠٠.

تێروتەسەلیی، چەند بابەتێکی وەك: پرەنسیپە گشتیی و سەرەکییەکان، هێڵە سەرەکییەکانی پێکهات و دەسەڵاتی دەزگاکانی ئۆتۆنۆمی هەرێمی کوردستان و چوارچێوەی کارکردنیان، کارسازیی و ئەرکەکانی دەسەڵاتی ناوەندیی، هەروەها رێکخستنی پێوەندیی نێوان هەردوو دەسەڵاتی ناوەندیی و ئۆتۆنۆمی، خستبووە بەرچاو[٥٨٣]

سەرۆك کۆماری عێراقیش لەو نامەیەی کە ٤ی تەموزی ١٩٧٣ بۆ مستەفا بارزانی ناردبوو، ئاشکرای کردبوو ناتوانن بەو پرۆژەیەی کورد رازیبن. داواشی کردبوو چاوی پێدا بخشێننەوەو پێشنیاری گونجاو بۆ گفتوگۆ لەسەرکردنیان پێشکەشبکەن[٥٨٤].

مستەفا بارزانییش، لە مانگی ئابدا بەنامەیەك وەڵامی سەرۆك کۆماری دایەوەو داوای لێکرد سەرنجی خۆیان سەبارەت بە خاڵە پەسەندنەکراوەکانی پرۆژەی کورد بخەنەڕوو، تا لێیان وردبنەوەو لە دووبارە دارشتنەوەی پێشنیارەکانیان بەشێوەیەك کە مایەی رەزامەندیی پەسندکردنی هەمووان بێت، لەبەرچاویان بگرن[٥٨٥]

شایانی باسە حیزبی شیوعی عێراقیش پرۆژەیەکی یاسای ئۆتۆنۆمی پێشکەشکردبوو کە بنەما پێشنیارکراوەکانی ئەو سیستەمەی خستبووەڕوو، ئاستی سەرپشکیی هەردوو دەسەڵاتی یاسادانان و راپەڕاندنی دەوڵەتی ناوەندیی لە یازدە بەند، ئاستی سەرپشکیی ئەنجوومەنی راپەڕاندنی هەرێمەکەشی لە چوار

---

(٥٨٣) بۆ زانیاریی زیاتر دەربارەی پرۆژەکەی پارتی دیموکراتی کوردستان بڕوانە: "نضال الطلبة" (مجلة ثقافية لاتحاد طلبة كردستان العراق)، ع(١١)، حزيران ١٩٧٣، ص٤٢-٤٥.

(٥٨٤) مسعود البارزاني، البارزاني والحركة التحررية الكردية، ج٣، ص٨٤٩-٨٥١.

(٥٨٥) بڕوانە: هـ س، ل٨٥٢.

بەندداا دیاریکردبوو. هەروەها (ح.ش.ع) لە پرۆژەکەیدا پێشنیاری کردبوو، بەنیازی دیاریکردنی سەرپشکیی وجۆری پێوەندیی نێوان هەردوو دەسەڵاتی ناوەندیی و خۆجێیی هەرێمەکە، بە لەبەرچاوگرتنی بارودۆخی کۆمەڵایەتیی و سیاسیی و ئابووریی و پەندوەرگرتن لەنموونەی هەمەجۆری سیستەمیی ئۆتۆنۆمیی جێبەجێکراوی وڵاتانی جیهان، دەستووری عێراق دەسکاریی پێویست بکرێ. بەڵام بەعس ئەو پرۆژەشی پشتگوێخست. ئیدی حیزبی شیوعیش وازی لێهێناو، لەگەڵ بەعس بەشداری لە دارشتەیەکی هاوبەش کرد بەناوی بەرەی نیشتمانیی[٥٨٦].

لە ٢٤ی ئەیلولی ١٩٧٣یشدا سەدام حسێن لەمیانی کۆبوونەوەی لەگەڵ هەندێ لە داردەست و لایەنگرانی دەسەڵاتەکەی بۆ تاوتۆکردنی پرۆژەی ئۆتۆنۆمی، وای خستەڕوو کە لە بۆچوونی خۆیاندا گەلی کوردو پارتی دیموکراتی کوردستان بە هەمان چاو سەیر ناکەن، حیزبی بەعسیشی نەك تەنیا بە سەرکردەی عەرەبی عێراق، بەڵکو بەسەرکردەی تەواوی گەلانی عێراقی لە قەڵەمدا[٥٨٧].

لە تشرینی یەکەمی ١٩٧٣یشدا، بەعس لەگەڵ سەدان کەس لە نوێنەرانی (سەربەخۆ)و دژی پارتی دیموکراتی کوردستان، سەبارەت بە جێبەجێکردنی پرۆژەی ئۆتۆنۆمی، کەوتە لێدوان و گفتوگۆ کردن. ئەوەش نیازێکی ئاشکرای بەعس بوو بۆ سووربوونی لەسەر بەلاوەنانی (پ.د.ك)[٥٨٨].

دوای رەتکردنەوەی هەردوو پرۆژەکەی پارتی دیموکراتی کوردستان و حیزبی شیوعی عێراق، لە ١٢ی کانونی یەکەمی ١٩٧٣دا، حوکمەتی بەعس

(٥٨٦) بروانە: عادل حسين شبع، س پ، ل٢٤١–٢٤٢.

(٥٨٧) صدام حسين، س پ، ل٢٤–٢٥.

(٥٨٨) دیڤید ماکداول، س پ، ل٦٩٠

پـڕۆژەی خـۆی بـۆ ئۆتۆنـۆمی پێشکەشی سـەرکردایەتیی کـورد کـرد، بـەڵام بـە بۆچوونی (پ.د.ك)، پڕۆژەکەی بەعس ناتەواو بوو، چـونکە بـەپێی ئـەو پڕۆژەیـە، بەعس بۆ دیاریکردنی سنووری هـەرێمی ئۆتۆنـۆمی کوردسـتان، سـووربوو لەسـەر گەڕانـەوە بـۆ سـەرژمێریی سـاڵی ١٩٥٧ کـە لەلایـەن سـەرکردایەتی کـوردەوە رەتکرابۆوە لەبەرئەوەی لەگەڵ خاڵی (١٤)ی بەیاننامەی ١١ی مارت ناکۆك بوو، کە بەپێی ئەو خاڵە دەبوایە سەرژمێرییەکی نوێ ئەنجام بدرێت[٥٨٩]

دوای خـستنە ئـارای پڕۆژەجیاوازەکـانی ئۆتۆنـۆمی و بەمەبەسـتی تاوتۆکردنیـان، بـەئامادەبوونی نوێنـەرانی بـەعس و شـیوعی و نەتەوەییـە پێشکەوتنخوازەکان و نوێنـەرانی پـارتی دیمـوکراتی کوردسـتان، کۆبوونەوەیـەکی بەرفراوان لە ١٦ی کانوونی دووەمـی ١٩٧٤ لـە بەغـدا ئەنجامـدرا[٥٩٠]، بـەڵام هـەر لەسەرەتاوە لەسەر چەند خـاڵێکی سـەرەکیی، وەك دیـاریکردنی سـنوورو ئاسـتی دەسەڵاتی یاسایی دەزگاکـانی ئۆتۆنـۆمی و پرسـی هەڵبـژاردن و بـە عـەرەبکردنی ناوچەکانی کوردستان و بودجەی سەربەخۆو بەشـە داهـاتی نـەوت بـۆ ناوچـەکانی ئۆتۆنـۆمی، نـاکۆکی کەوتـە نێوانیـان[٥٩١] جێـی ئامـاژەپێدانـە، شـاری کـەرکووك گرفتی سەرەکیی بوو لەدیاریکردنی سنووری هـەرێمی ئۆتۆنـۆمی. لـەو پرسەشـدا، هـەر لایـەنێك پێـشنیارو بۆچـوونی جیـاوازی خـۆی هـەبوو. حیزبـی شـیوعی پێـشنیاریکرد کـەرکووك بکرێتـە شـاری برایـەتی و نەتـەوەیی، کـە کارگێڕییـەکی تایبـەتی هـەبێ و تیایـدا نەتـەوەکان بـە مافـە کۆمەڵایـەتیی و رۆشـنبیرییەکانیان

(٥٨٩) Nader Entessar, Op.Cit. P75

(٥٩٠) بۆ زانیـاریی زیـاتر بڕوانـە: مـسعود لبـارزاني، البـارزاني والحركـة التحرريـة الكرديـة، ج٣، ص٢٩٤-٢٩٥و ٦٠٣-٦٠٧؛ صدام حسين، س پ، ل٤٢-٤٤.

(٥٩١) ژێرارد چالیاند، س پ، ل٣٠٠-٣٠١.

شـادبن. هـەروەها (ح.ش.ع) بـۆ کـارگێڕی پارێزگـای کـەرکووك پێـشنیاریکرد لێژنەیـەکی بـالا لـە بـەعس و پـارتی دیمـوکراتی کوردسـتان و حیزبـی شـیوعی پێکبهێنرێت، بەڵام سـەرکردایەتی کـورد بـەم پێـشنیارانە رازی نـەبوو و سـووربوو لەسەر ئەوەی ئەم شارە لەنێو چوارچێوەی ئۆتۆنۆمیـدا بێـت. کەچـی پێـشنیاری بەعس دابەشکردنی شارەکە بوو، بەشی رۆژهەڵات (رۆژهەڵاتی بەستی خاسـە) بـۆ کوردو بەشی رۆژئاواشی بۆ تورکمان دانابوو.ئەو پێشنیارەش لەوەوە سەرچـاوەی گرتبوو کە کورد رۆژێك دەرفـەتی جیابوونـەوەو پێکهێنـانی دەوڵـەتی سـەربەخۆی دەبێ[٥٩٢].

لە ٢٠ی کانونی دووەمی ١٩٧٤یشدا، مستەفا بارزانی لـە نامەیەکیـدا بـۆ سـەدام حسێن، بۆ دەسپێکردنی گفتوگۆی نێوانیان سـەبارەت بەجێبـەجێکردنی بەیاننامـەی ١١ی مـارت و چەسـپاندنی ئۆتۆنـۆمی کوردسـتان لـەکاتی دیـاریکراوی خۆیـدا، گەشـبینیی نیـشانداو ئـاواتی بـۆ سـەرکەوتنی گفتوگۆکـان خواسـت. (سـەدام حسێن)یش ناوەرۆکی نامەکەو چەند بابەتێکی دیکەی لەگەڵ شاندی کورددا تـاوتوێ کرد. پاشانیش چـەند کۆبوونەوەیـەك لـەنێوان سـەرکردایەتی کـوردو رژێمـی بـەعس ئەنجامـدرا، بـەڵام تـا ١٠ی مـارتی ١٩٧٤ کـە پێوەنـدیی نێـوان هـەردوولا پـچڕا، گفتوگۆکان لـە بازنەیـەکی بۆشـدا دەخوولانـەوەو هـیچ لایـەکیان بـەداواو پێـشنیاری لایەکـەی دیکـە، بەتایبـەتی لەسـەر پرسـی کـەرکووك رازی نـەبوو، چـونکە بـەعس نەیدەویست کەرکووك و شەنگال و خانەقین بخاتە نێو سنووری هـەرێمی ئۆتۆنـۆمیو رازیـش نـەبوو مـاوەی گفتوگـۆکردن لەسـەر پـرۆژەی ئۆتۆنـۆمی درێـژ بکاتـەوە.

(٥٩٢) د. مكرم الطالباني، نحو حل صحيح للمسألة القومية الكردية في العراق، ص٢٩٨–٢٩٩.

